10



حکومەتی هەرێمی کوردستان- عێراق
وەزارەتی پەروەردە - بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

## زانست بۆ هەمووان

# فیزیا

## کتێبی خوێندکار- پۆلی دەیەمی زانستی


چاپی هەشتەم
٢٠١٦ ز / ٢٧١٦ کوردی / ١٤٣٧ ک

# هێما ڕوونکەرەوەکان

ئەم زانیاریانەی لەم خشتەیەی خوارەوەدا هاتوون بەپێی ڕیزبەندییەکەیانە لە کتێبی خوێندکاردا بۆ قۆناغەکانی خوێندن.

## میکانیك

| هێما | زاراوە |
|---|---|
| | ئاراستە داری لادان |
| | پێکنەری لادان |
| | ئاراستە داری خێرایی |
| | پێکنەری خێرایی |
| | ئاراستە داری تاودان |
| | ئاراستە داری هێز |
| | پێکنەری هێز |
| | ئاراستەداریتەوژم(بڕی جوولە) |
| | گۆشە |
| | ئاراستەی خولانەوە |

## دینامیکی گەرمی

| هێما | زاراوە |
|---|---|
| | وزەی گۆڕاو بۆ گەرمی |
| | وزەی گوڕاو بۆ ئیش |
| | خول یان کردار |

## شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکان

| هێما | زاراوە |
|---|---|
| | تیشك (ڕووناکی یان دەنگ) |
| | بارگەی پۆزەتیڤ |
| | بارگەی نێگەتیڤ |
| | هیڵەکانی بواری کارەبا |
| | ئاراستە داری بواری کارەبا |
| | تەزووی کارەبا |
| | هێڵەکانی بواری موگناتیسی |
| | ئاراستە داری بواری موگناتیسی |
| × | بۆ ناو لاپەڕەکە |
| ● | بۆ دەرەوەی لاپەڕەکە |



# ناوەڕۆك

## وەرزی یەکەم









## 3 میکانیکی شلگازەکان 50



# وەرزی دووەم

## 4 گەرمی 78







## 7 ڕەنگ و جەمسەرگری 176



## بەشی پاشکۆکان 191

# بەشی 1

# زانستی فیزیا

## *The Science of Physics*



ئەو یاریزانەی کە لە وێنەکەدا دیارە لە یەکێك لە پێشبڕکێ جیهانیەکاندا بەشداری کردووە. کە وێنەکەی بەهۆی کامێرای ڤیدیۆوە دەگیرێت، لە کاتێکدا کە لەزگەی سپی ڕوناکی دەرەوە لەسەر بەشە جیاجیاکانی پۆشاکەکەی چەسپ کراوە. ئەم لەزگانە یارمەتی توێژەرەوەکان دەدات لە بەکارهێنانی فیلمی ڤیدیۆیدا بۆ دارشتنی نموونەیەکی کۆمپیوتەری هاوشێوەی وێنەکەی تەنیشت. توێژەرەکان ئەم نموونەیە بەکاردەهێنن بۆ شیتەڵ کردنی کارامەیی یاریزانەکە و یارمەتی دانی بۆ چاکردنی نمایشەکەی.

### ئەوەی کە پێشبینی بەدیهێنانی دەکرێت

لەم بەشەدا بە لقەکانی فیزیاو هەنگاوەکانی پرۆگرامی زانستی ئاشنا دەبیت، وەبەکارهێنانی نموونەکان لە فیزیادا. هەروەها هەندێ ڕێگای بەسود بۆ کارکردن لە سەر پێوانەکان و زانیارییەکان (داتاکان) فێردەبیت.

### گرنگییەکەی چییە

زانستی فیزیا زۆر لە نموونە گرنگەکان پەرە پێ دەدات بۆ پێناساندنی زۆر لە ڕوداوەکان لەجیهانی فیزیادا لەوانە جووڵەی یاریزانەکە لە کاتی مەشقکردن دا.

## ناوەڕۆکی بەشی 1

بەندی 1-1

# زانستی فیزیا چییە؟
## *What is physics?*

### 1-1 ئامانجەکان

- دیاری کردنی چالاکییەکان و بوارە سەرەکیەکان کە زانستی فیزیا باسیان دەکات.
- کردارەکانی پرۆگرامی زانستی وەسف دەکات.
- رۆڵی سامپلەکان (نماذج) و هێلکارییە زانیارییەکان (داتاکان) لەزانستی فیزیادا وەسف دەکات.

## فیزیا لەهەموو شوێنێکدا

بیرۆکەو بنەماکانی فیزیا لە ژیانی رۆژانەماندا و لە دەوروبەرماندا هەیە. لەراستی دا زۆرینەی خەڵکی لە زانستی فیزیا دەزانن بێ ئەوەی کە خۆیان پێی بزانن و دەرکی پێ بکەن. زۆربەی تەلارو داهێنانەکان و کەرەسە و دەزگاکان کە بەکاریان دەهێنین، نەدەبوو گەر بەجێهێنانەکانی رێساکانی فیزیا نەبوایە. کاتێك بەفرە مەنیەکان دەکرێت وەدەیگەیەنیتەوە ماڵەوە ئەوا دەیخەیتە بەفر گرەکەوە چونکە بە هۆی ئاشنایت لەگەڵ فیزیادا دەزانیت گەر لەسەر مێزێك دایبنێی ئەوا تێکدەچێت وشل دەبێتەوە.

وە تۆش لە کاتی هەنگاونانت یان گرتنەوەی تۆپێك یان کردنەوەی دەرگایەك یان کە سەیری وێنەکەت دەکەیت لە ئاوێنەیەکدا ئەوا بەبێ ئەوەی بزانی زانستی فیزیات بەکارهێناوە.

## بابەتەکانی فیزیا

زاناکانی فیزیا ئاسان کاریان بۆ کردوین لەبەکارهێنانی بنەماو رێساکانی فیزیادا کاتێك کە بابەتەکانیان پۆلێن کرد لە بوارەکاندا، **وێنەی 1-1** نیشانی دەدات چۆنیەتی بەکارهێنانی زانستی فیزیا لەدروستکردنی ئۆتۆمبێل و کارکردنیدا.

**وێنەی1-1**

دروستکردنی ئۆتۆمبێل ئەستەمە گەر زانیاری تەواو نەبێت لە بوارە جیاجیاکانی فیزیادا.



**خشتەی 1-1** لە خوارەوە هەندێ لە بوارە سەرەکیەکانی زانستی فیزیای تێدایە لەگەڵ نموونە بۆ هەریەکەیان. نەخشەسازی بەلەمە چارۆکە دارەکان و ئیشپێکردنیان نموونەیەکی کرداریە بۆ ئاشنا بوون بە بنەماکانی فیزیا. ئەندازیارە نەخشە دارێژەرەکان بە پلان باشترین شێوە دائەنێن بۆ ئەوەی بەلەمەکە سەرئاو بکەوێت و بە هاوسەنگی بمێنێتەوە لەسەر ڕووی ئاوەکەوە بە خێرایی و سانایی بە کەمترین بەرگری بجووڵێت. ئەو نەخشەسازیە پێویستی بە زانیاری هەیە لە بواری فیزیای شلگازەکاندا، هەروەها دیاری کردنی شێوەکانی چارۆکەکە و ئیشکردنیان بە چوستی‌یەکی بەرز وە چۆنیەتی دانانی چارۆکەکان پێویستی بە شارەزایی هەیە لە بواری زانستی جووڵە و هۆیەکانیدا، بەڵام دروستکردنی بەلەمێکی هاوسەنگ پێویستی بەزانیاری هەیە لە بواری میکانیکدا.

## ئایا دەزانیت؟

ووشەی فیزیا لە ووشەیەکی یۆنانی کۆنەوە هاتووە (فیزيك) بەمانای سروشت بە پێی بۆچوونی ئەرسطۆ، فیزیا لێکۆڵینەوەی ڕووداوە سروشتیەکانە وە ئەرسطۆ پێی وایەکە لێکۆڵینەوە لە جووڵەدا بەبنەمای زانستی فیزیا دادەنرێت، وە ڕۆڵی بیرکاری بەدوور زانی بەڵام گالیلۆ لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا نەبوو، بەڵکو لە پاشان هاوبەشی کردلە بەکارهێنانی بیرکاری دا، لە پێشخستنی بنەماکانی زانستی جووڵەی نوێ دا. وەیەکەم لێکۆڵینەوەی لە بابەت جووڵەوە ساڵی 1632 بڵاو کردەوە.

**خشتە 1-1** **بوارەکانی زانستی فیزیا**

| ناو | بابەت | نموونە |
|---|---|---|
| میکانیك | جووڵەو هۆکارەکانی | کەوتنە خوارەوەی سەربەستی تەنەکان، هێزی لێکخشاندن، کێش، تەنە خولخۆرەکان. |
| داینەمیکی گەرمی | گەرمی و پلەی گەرمی | شلبوونەوە و بەستن، بزوێنەرەکان، بەفرگرەکان. |
| لەرینەوە و دیاردە شەپۆلی یەکان | جۆرە تایبەتیەکانی جووڵەی بەپات. | سپرینگ، بەندۆڵ، دەنگ. |
| بیناییەکان | ڕووناکی. | ئاوێنەکان، هاوێنەکان ڕەنگ. گەردوون ناسی. |
| کارۆموگناتیسی | کارەبا، موگناتیس، ڕووناکی | بارگەی کارەبا، سوورەکانی کارەبا، مووگناتیسی هەمیشەیی، مووگناتیسی کارەبایی. |
| ڕێژەیی (النسبية) | تەنۆلکە جووڵاوەکان بەهەر خێراییەك، وەبەخێراییە زۆرەکانیشەوە | بەریەك کەوتنی تەنۆلکەکان، تاودەری تەنۆلکەکان، وزەی ناوەکی |
| میکانیکی کوانتەم | ڕەوشتی تەنۆلکەووردیلەکان | پێکهاتەی گەردیلە (گەردیلە و بەشەکانی) |

( أ ) تێبینی و پرسیارکردن

تێبینی بکە و زانیارییەکان کۆبکەوە لە بابەت پرسیارێکەوە لە دیاردەیەکی دیاریکراو

(ب) دانانی گریمانەکان

گریمانەیەك دابنێ کە بۆچوونەکانت ڕوون بکاتەوە لە بابەت دیاردەکەوە

(ج) تاقیکردنەوەی گریمانەکان

لە گریمانەکەت بکۆڵەرەوە بەهۆی تاقیکردنەوە تاقیگەییەکان

(د) شیکردنەوەی زانیارییەکان

زانیارییە دەستکەوتووەکان لە تاقیکردنەوەکە شی بکەرەوە

( هـ ) پوختەی ئەنجامەکان

ئەنجامەکان کورت بکەرەوە لەو زانیاریانەی دەستکەوتوون بە تاقیکردنەوە

ئەو دەرئەنجامانەی کە پشتگیری گریمانەکە ناکات

بە گریمانەکەدا بچۆرەوە یان ڕەتی بکەرەوە

ئەو دەرئەنجامانەی کە پشتگیری گریمانەکە دەکات

ئەنجامەکان ئامادەبکە بۆ زاناکان بۆ دڵنیابوون لە ڕێگەی تاقیکردنەوەی زیاترەوە

ئەو دەرئەنجامانەی کە زانایان دڵنیانین لێی

جێگیربوونی بیردۆزەکە

ئەو ئەنجامانەی کە زاناکانی تر پەسەندیان کردووە و دڵنیان لێی

(و) بەردەوامبوون و دارشتنی بیردۆزەکە

**وێنەی 1-2**
هێڵکاری پرۆگرامی زانستی

# پرۆگرامی زانستی

زانستی فیزیا چ تایبەتمەندییەکی هەیە؟ تایبەتمەندی زانستی فیزیا لەو بابەتانەدایە کە لەخشتەی **1-1** باسیان دەکات وە بەو **پرۆگرامە زانستییانەی** scientific method **وێنەی 1-2** کە هەیەتی بۆ لێکدانەوەی دیاردە سروشتییەکان. لەوانەیە پێشکەوتنی زانستی لەرێی ئەو داهێنانانەوە هاتبێت کە بەرێکەوت دۆزراونەتەوە، بەڵام پەرەپێدانی زانستی بەگشتی پێشکەوتنێکی بەخۆوە دی لەئەنجامی ئەو توێژینەوانەدا کە بەووردی بۆی دارێژرابوو، کە تیایدا توێژەرەوەکان ڕێگەی ناونراو بە « پرۆگرامی زانستی» یان بەکارهێناوە.

ئەم ڕێگەیە جێبەجێ دەکرێت بەهۆی نزیك کردنەوە ژیربێژیەکانەوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان لەئەنجامی تێبینیکردن و کۆکردنەوەی داتاکان، پاشان دارشتنی گریمانەکان وە تاقیکردنەوەیان وە دانانی بیردۆزە پشتگیرکراوەکان بە داتاکان « زانیارییەکان». هەموومان بەیەکەوە هەوڵدەدین بۆ نیشاندانی هەر هەنگاوێك لە هەنگاوەکانی پرۆگرامی زانستی کە ڕوونکراوەتەوە لە **وێنەی 1-2** .

## هەنگاوەکانی پرۆگرامی زانستی

### یەکەم: تێبینی و پرسیارکردن

تێبینی بریتییە لە بەکارهێنانی هەستەکان لە کۆکردنەوەی زانیاریەکاندا. کە تێدا پێوانەکردنەکان بەجێدەهێنن هەروەها داتا ڕووکەشەکان و ڕاستەقینەکان «برەکان» کۆدەکەنەوە بۆ پوختەکردنی تێبینییەکان و کۆکردنەوەی داتاکان فیزیاویەکان تێڕامان لە سیستەمەکان دەکەن و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن.

سیستەمیش system بەشێکی دیاریکراوە لە بوارە لێکۆڵدراوەکاندا بەهۆی کرداری تێبینییەوە بە تێڕوانینی جووڵەی ئەو گۆیەی لە **وێنە 1-3** دا دیارە لەسەرەتادا پێویستی بە تێبینی گۆیەکە و دەوروبەری هەیە لەکاتی جووڵەکەی و کاریگەرەکانی سەری.

**وێنەی 1-3**
لێکۆڵینەوەی جووڵەی گۆیەکە پێویستی بە تێبینیکردنی گۆیەکە و دەوروبەریەتی لەکاتی جووڵەکەیدا وە ئەوانەی کاری تێدەکەن.

**پرۆگرامی زانستی**

ڕێگەیەکی پرۆگرامداری بەرنامە بۆ دارێژراوە بۆ لێکۆڵینەوەی ڕووداوە سروشتییەکان.

**سیستەم**

بەشێکی دیاریکراوە لە بوارێکی لێکۆڵراوەدا بەهۆی کرداری تێبینیکردنەوە.

ئەو کاتە ئەو پرسیارە کە دێتە کایەوە لەوانەیە هۆکارەکانی جووڵەی گۆیەکە یان ڕێبازەکەی یان خێراییەکەی تێدابێ بە چاوپۆشین لە هەموو زانیاریەك کە پەیوەندی بە دەوروبەری گۆیەکەوە هەبێت و کار نەکاتە سەر جووڵەکەی وەك ڕەنگەکەی و دەنگی بەرکەوتنی لەگەڵ زەویدا.

دوای دیاریکردنی سیستەمەکە زانا فیزیاییەکە دەست بەکار دەبێت بۆ لێکۆڵینەوە لە داهێنانی مۆدێلێکی ساکار بۆ سیستەمەکە بتوانرێت بخرێتە ژێر لێکۆڵینەوە بە پێ ی پڕۆگرامە زانستیەکە هەروەك لە **وێنەی 4-1** دایە. بۆ نموونەی گۆکە.

**مۆدێل**

پێش چاو خستنێکی ساکارە بۆ سیستمێکی لێکۆڵراوە کە هۆکارە کاریگەرەکانی دیاردەیەکی **تێدا** دەردەکەوێت.





**وێنەی 4-1**

بۆ شیکردنەوەی جووڵەی تۆپی باسکە (سەبەتە).

( أ ) ئەو هۆکارانەی کاردەکەنە سەر جووڵەکە جیابکەرەوە.

(ب) بەتەنها وێنەیەکی هێڵکاری ڕێڕەوی ئەو جووڵەیە بکێشە.

لەوانەیە تێبینییەکە بینراو نەبێت بەڵکو هزری (ذهني) بێت. گالیلو لە تاقیکردنەوە هزریەکەیدا وای بۆ دەچوو کە ئەگەر دوو تەنی چۆنیەك لەهەمان ساتدا وە لە هەمان بەرزیدا بەردرانەوە ئەوا هەردوو تەن بەهەمان خێرایی دەکەونە خوارەوە. کە ئەمەش لەگەڵ بۆچوونەکانی زاناکانی پێش گالیلۆ یەکتری ناگرێتەوە. پاشان گالیلۆ پێشبینی ئەوەی کرد کە ئەگەر هەردوو تەنەکە بەیەکەوە ببەسترێن و بەر بدرێنەوە، بۆ ئەمەش مۆدێلێکی ساکاری داهێنا بۆ ئەو سیستەمە کە پێکهاتووە لە دوو تەنەکە و ئەو هێزانەی کە کاریان لێ کردوون **وێنەی 5-1** .



( أ ) ئـەوەی ڕووئـەدات: تـەنـە قـورسـەکـان و تـەنـە سووکەکان بەهەمان خێرایی دەکەونە خوارەوە

(ب) ئەوەی کە ڕوونادات: تەنە قورسەکان بە خێراییەکی گەورەتر لە خێرایی تەنە سووکەکان ناکەونە خوارەوە.

**وێنەی 5-1**

گالیلو تاقیکردنەوە هزرییەکەی کەلەم هێڵکاریەدا دیارە بەکارهێنا بۆ ئەوەی بپرسێ: ئایا تەنە قورسەکان و سووکەکان بەهەمان خێرایی دەکەونە خوارەوە؟

### دووەم: دانانی گریمانەکان

زاناکان هەوڵ ئەدەن کاتی ئەنجام دانی لێکۆڵینەوە کانیان لەو زانیاریانەی بە دەستیان هێناوە لە تێبینی و تاقیکردنەوەکانیاندا وە بەراوورد کردنیان ئەوا پوختەی پەیوەندیەکان دائەڕێژن کە ئەمەش بەبنچینەی پرۆگرامی زانستی دائەنرێت، گریمانەی زانستی شیکردنەوە و لێکدانەوەی لۆجیکی (ژیربێژی) پەسەندکراوی ڕاستیە هەروەك تێبینی کراوە، یان هزریانە لێکدراوەتەوە.

با بگەڕێینەوە بۆ تاقیکردنەوە هزریەکەی گالیلۆ کە تیایدا نموونەیەکی پێشکەوتووی گونجاوی سیستمی تەنە کەوتووەکانە بە ئامانجی دیاری کردنی گۆڕاوەکان، وەك بارستایی یان شێوە وەیان بەرگری هەوا، وە دارشتنی گریمانەیەك کە جووڵەکەی و خێراییەکەی لێکبداتەوە. گەر ئەوەی کە زاناکان لێکیان ئەدایەوە ڕاست بێ ئەوا بە بۆچوونی گالیلۆ خێرایی کەوتنی هەردوو تەنەکە دوای بەستنیان بەیەکەوە لەناکاو زیاد دەکات، وە ئەم خێراییە گەورەترە لە خێرایی هەریەك لە دوو تەنەکە کاتێك کە هەریەکەیان بە تەنها بوون، چونکە دوو تەنە پێکەوە بەستراوەکە یەك تەن پێك دێنن کە لە هەر یەکەیان بەجیا قورسترە. دوای ئەم شیکردنەوە هزرییەی تەنە کەوتووەکان و بەراوردکردنیان لەگەڵ ڕاو بۆچوونی زاناکانی ئەو کاتە گالیلۆ گریمانەکەی دارشتەوە کە دژی گریمانە و بۆچوونی زاناکان بوو، بۆچوونی گالیلۆ وابوو کە نابێت بەستنی ئەو دوو تەنە بەیەکەوە ببێتە هۆی گۆڕانکاریە لە ناکاوەکەی خێرایی، لە ئەنجامدا «هەموو تەنەکان قورساییەکانیان هەرچەند بێت، پێکەوە و بەهەمان خێرایی دەکەونە خوارێ بە نەبوونی بەرگری هەوا».

### سێیەم: تاقیکردنەوەی گریمانەکان و شیکردنەوەی داتاکان و پوختەکردنی ئەنجامەکان

تاقیکردنەوەی گریمانە پێویستی بە ئەنجام دانی زۆر لە تاقیکردنەوەکان هەیە بۆ دڵنیابوون لە ڕاستی و دروستیان، گەر تاقیکردنەوەکان ڕاستی بۆچوونیان گریمانەکەی لێ نەکەوتەوە ئەوا پێویستە پیاداچوونەوە بە گریمانەکەدا بکرێت.

گالیلۆ چەند تاقیکردنەوەیەکی تاقیگەیی بەجێ هێنا لەسەر گریمانەکەی بۆ دڵنیابوون لە ڕاستییەکەی، وە تێبینی ئەو گۆڕانانەی کرد کە بەسەر جووڵەی کەوتنە خوارەوەی تەنەکاندا دێت کاتێ کێشەکانیان بگۆڕێت بەڵام گۆڕاوەکانی تر بە جێگیری بمێنێتەوە.

**تاقیکردنەوەی کۆنترۆڵ کراو**

ئەو تاقیکردنەوەیەیە کەتیایدا لێکۆڵینەوە بەتەنها لەسەر یەك گۆڕاو یان هۆکار دەکرێت بەمانەوەی هۆکارەکانی تر بە جێگیری.

بۆ نموونە گالیلۆ کاتی خایەنراوی بۆ کەوتنە خوارەوە لەهەمان بەرزاییەوە بۆ تەنە جیاجیاکان لە کێشدا و یەکسان لە قەبارەدا تۆمارکرد.

دەزگاکانی پێوانەکردن ئەو سەردەمە ئەو وردیەیان نەبوو بەهۆی خێرا کەوتنە خوارەوەی تەنەکان و نەبوونی ڕێگایەك بۆ بنبڕ کردنی بەرگری هەوا. لەبەر ئەوە گالیلۆ گۆیەکی لەسەر ڕوویەکی لێژەوە خلۆر کردەوە وەك مۆدێلێك کە کەوتنە خوارەوەی گۆ کە بنوێنێ.

وای دانابوو کە هەرچەند لاری ڕووەکە زیاد بکات مۆدێلەکە زیاتر لە جووڵە ڕاستییەکەوە نزیك دەبێتەوە، وە ئەوکاتە داتاکانی کە لە ئەنجامەکانی تاقیکردنەوەکانەوە بەدەستی هێنابوو لەگەڵ ئەو پێشبینییانەی کە گریمانەکەی لەسەر بنیادنابوو دەگونجان.

بەپێی پرۆگرامی زانستی پێویستە تێست بۆ هەر گریمانەیەك بە **تاقیکردنەوەیەکی کۆنترۆڵ کراو بێت** controlled experiment ، واتە پێویستە لە تاقیکردنەوەیەکدا لەیەك کاتدا بەتەنها یەك هۆکار بگۆڕێت بۆ دیاری کردنی ڕادەی کاریگەری ئەو گۆڕاوە بە تەنها لەودیاردەیەی کە لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت.

**چوارەم : بەردەوامی و دارشتنی بیردۆز**

ئەگەر ئەنجامی تاقیکردنەوەکان ئەوەیان نیشان دا کە بۆ چوونەکانی گریمانەکان ڕاستن، ئەوا زاناکان هەوڵی داڕشتنی بیردۆزەکە ئەدەن کە ڕاستی دیاردەکان بەگشتی لێك ئەداتەوە. ئەو بیردۆزە سەرکەوتوو دەبێت وە بەکەڵکی بڵاوکردنەوە دێت ئەگەر توانی پێشبینی ئەنجامەکانی تاقیکردنەوە نوێکان بکات. گریمانە پەسندکراوەکان ئەوانەن کەڕێگا بە پێشبینی ئەگەرە نوێیەکان ئەدەن بەڵام کاتێك ئەنجامەکانی تاقیکردنەوەیەك پشتیوانی گریمانەکە نەکا، یان نەگونجێ لەگەڵ ئەوەی کە گریمانەکە پێشبینی لێ ئەکرد، زاناکان تاقیکردنەوەکان چەندجارەدەکەنەوە بۆ دڵنیابوونیان لەوەی کە ئەنجامەکان چەوت نین. لەم بارەدا پێویستە واز لە گریمانەکە بهێنرێت یان دوو بارە پێداچوونەوەی تێدا بکرێت، لە بەر ئەو هۆیە داڕشتنی بیردۆزەکە یان دەرئەنجامەکەی وا دائەنرێت کە دوا هەنگاوە کە ئەمەش گرنگترینیانە لە پرۆگرامی زانستی دا. وەبیردۆزێك بە جێگیر و نەگۆڕ دائەنرێت گەر زاناکانی تر دڵنیابوون لە ڕاستیەکەی.

## پێداچوونەوەی بەندی 1-1

**1.** بوارەکانی زانستی فیزیا بژمێرە.

**2.** ئەو بوارەی فیزیا دیاری بکە کە زیاتر دەگونجێ لەگەڵ هەریەکە لەم بارانەی خوارەوەدا، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی وەڵامەکەت.

أ. یاری تۆپی پێ.
ب. ئامادەکردنی خواردنی ئێوارە.
ج. بیستنی بانگی ئێوارە.
د. بروسکە.
ه. لە چاوکردنی چاویلکەکانی خۆ پاراستن لە شوێنێکی خۆرە تاودا (هەتاو).

**3.** هەنگاوەکانی هەر پرۆگرامێکی زانستی کامانەن؟

**4.** دوو نموونە بدە لەسەر ئەو ڕێگایانەی کە زاناکانی فیزیا دەیگرنە بەر بۆ دانانی نموونەکانی جیهانی سروشتی.

**5.** **فیزیا لە ژیانی ڕۆژانەدا:** بوارەکانی زانستی فیزیا دیاریبکە کە ئەم ئەنجامانەی خوارەوەی تێدابێت کە لە چارەسەری داڕشتە کانزاییە سووکە پێشنیازکراوەکاندا دەستنیشان دەکرێت بۆ دروستکردنی بەلەمە چارۆکەدارەکان :–

أ. تاقیکردنەوەی کاریگەری بەریە ککەوتن لەگەڵ دارشتە کانزاییەکەدا.
ب. تاقیکردنەوەی کاریگەری پلە گەرمییە بەرز و نزمەکان لەسەر دارشتە کانزاییەکە.
ج. تاقیکردنەوەی کاریگەری دارشتنە کانزاییەکە لەسەر دەرزیەکەی قیبلەنما.




# پێوانەکردن لە تاقیکردنەوەکاندا

***Measurements in experiments***

## ژمارەکان وەك پێوانە

زاناکانی فیزیا تاقیکردنەوەکان ئەنجام ئەدەن بە مەبەستی تێست کردنی گریمانە زانستیەکان. وە لەمیانەی ئەم تاقیکردنەوانەدا زاناکان ژمارەکانیان دەست دەکەوێ بە هۆی پێوانە کردنەوە. ئەم ژمارە پێوانەییانە جیاوازن لەو ژمارانەی کە لە بیرکاری دا رەفتاریان لەگەڵدا دەکەین بۆ نموونە ژمارە 7 دەتوانرێت تەنها لە هاوکێشەیەکی بیرکاریانەدا بەکاربێت لەوە زیاتر نییە کە وەك ژمارەیەك بێ، بەڵام لە پێوانەکردنە زانستییەکاندا ژمارە 7 لەوانەیە پێوانەی درێژی یان بارستایی یان کات یان هەر شتێکی تربێ. و بۆ نموونە ئەگەر ژمارەکە پێوانە بێ بۆ درێژی ئەوا ئەو یەکەیەی کە بەکارهاتووە بۆ پێوانە کردنەکە لەوانەیە مەتر یان میل یان ساڵی ڕووناکی بێت کەواتە هەر ژمارەیەك کە دەست بکەوێت بە هۆی پێوانەکردنەوە دەبێت بڕێکی دیاری کراو بنوێنێ وە یەکەی پێوانەکردنی دیاریکراوی هەبێ.

هەر هێندێکی فیزیایی بەپێوەرێکی دیاری کراو وەسف دەکرێت کە پێی دەوترێت ڕەهەند Dimension . لە بەندەکانی داهاتوودا مامەڵە لەگەڵ سێ ڕەهەندی بنەڕەتی دەکرێت کە ئەوانیش (درێژی و بارستایی و کات) ن. و چەند پێوانەکردنێکی تریش کە دەتوانرێت لەم سێ ڕەهەندە بنەڕەتییەوە دابتاشرێت، وەك هێندە فیزیاییەکانی هێز و خێرایی و وزە و قەبارە و تاودان. بۆ نموونە ڕەهەندی خێرایی بریتییەلە درێژی لەسەر کات و ڕەهەندی تاودان بریتییەلە درێژی لەسەر دووجای کات و ڕەهەندی هێز $F = ma\ kg{\bullet}m/sec^2$ بریتییە لە لێکدانی بارستایی و درێژی بۆ دووجای کات ... وە هەروەها

### 2-1 ئامانجەکان

- یەکە بنچینەییەکانی سیستمی نێو دەوڵەتی دەژمێرێت وەناوی ئەو بڕەش دەبات کە وەسفی دەکات.
- پێوانە کراوەکان دەگوڕێت بۆ هێمای زانستی.
- بەراوورد دەکات لە نێوان ووردی و تەواوی.
- ڕەنووسە واتاییەکان بەکاردەهێنرێت لە پێوانەکردن و هەژمارکردندا.

**ڕەهەند**

پێوانەیەکە ئاماژە بەبڕێکی فیزیایی دیاریکراو دەکات.

**خشتە 2-1 بڕە بنچینەییەکان و یەکەکانیان لە سیستمی نێودەوڵەتی دا**

| بڕەکە | هێمای بڕەکە | ناوی یەکەکە | کورتەی یەکەکە | پێناسەی پێوەر |
|---|---|---|---|---|
| درێژی | $l$ | مەتر | m | درێژی ئەو ڕێبازەی کە ڕووناکی دەیبڕێت لە بۆشاییدا لە ماوەی 299792458 /1 ی چرکەیەکدا. |
| بارستایی | $m$ | کیلۆ گرام | kg | یەکەی بارستای کە پێوراوە بە کیلۆ گرامی نموونەیی. |
| کات | $t$ | چرکە | s | کاتی 770 631 192 9 لەرینەوەی تیشکی بەرهەم هاتوو لە گواستنەوەی ئەلیکترۆن لە نێوان دوو ئاستە وزەدا لە باری دامرکاوی گەردیلەی سیزیۆمدا Cs- 133 . |
| پلەی گەرمی | $T$ | گلڤن | K | ئەویەشەی کە یەکسانە بە 1/273.16 پلەی گەرمی خاڵی سیانی ئاوە. |
| بڕی مادە | $n$ | مۆڵ | mol | بڕی مادەیە لە سیستمێکدا کەهەمان ژمارە لەو یەکانەی تێدایە کەلە 0.012 kg لە کاربۆنی C-12 دایە. |
| تەزووی کارەبا | $I$ | ئەمپێر | A | توندی ئەو تەزووە نەگۆڕەیە کە ئەگەر تێپەری بە دوو تەلی هاوڕێکی بێ پایان لەدرێژی دا کە پانە برگە بازنەییەکەیان فەرامۆش کرابێ وەلە بۆشاییدا دانرابن و دووری نێوانیان یەك مەتربێ ئەوا هێزی $2 \times 10^{-7}$ N لە یەك مەتری درێژی تەلەکە دا پەیدا دەبێ. |
| توندی ڕۆشنایی | $I_v$ | کاندیلا (مۆمی پێوانەیی) | cd | توندی ڕۆشنایی سەرچاوەیەك بە ئاراستەیەکی دیاریکراو کە تیشکی تاك ڕەنگ ئەدات بە لەرلەری $540 \times 10^{12}$ Hz وە دەکاتە $\frac{1}{683}$ W بۆهەر Steradian نێك (یەکەی گۆشەی نیوە تیرەی بەرجەستەیە) |

پێوانی ژمارەیی بڕی هێندێکی فیزیایی بەندە لەسەر ئەو یەکەیەی کە ئەو بڕەیەی پێ پێوراوە بۆ نموونە باشتروایە بۆ پێوانی درێژییە کورتەکان بە (مللیمەتر mm ) بێ نەوەك بە کیلۆمەتر Km یان ساڵی ڕووناکی.

## سیستمی نێو دەوڵەتی یەکەکان SI

لە ساڵی 1960 دا کۆنفرانسێکی زانستی گشتی بەسترا بۆ کێشانە و پێوانەکان کە تیایدا زاناکان ڕێکەوتن لەسەر بەکارهێنانی سیستمێکی یەکگرتوو بۆ پێوانەکردن بەناوی سیستمی نێودەوڵەتی SI ئەم سیستمە پێناسەیەکی ووردی حەوت لە یەکەکانی پێوانەکردنی تێدایە کە هی حەوت بڕی فیزیای بنچینەییە کەبریتین لە: درێژی، بارستایی، کات، پلەی گەرمی، بڕی مادە، تەزووی کارەبا، توندی ڕۆشنایی. پێوەرەکانی ئەو یەکانە دروست کرا وەك ئەو پێوەرەی کە ڕوونکراوەتەوە لە **وێنەی 1-6** بۆ کیلۆگرام کەیەکەی پێوانەکردنی بارستاییە لە سیستمی SI دا.

**خشتەی 1-2** بڕە فیزیاییە بنچینەیەکان روون دەکاتەوە لەگەڵ هێماکانیاندا وەیەکەی پێوانەکردنی هەر یەکەیان لە سیستمی SI دا. بەڵام بۆ بڕە فیزیاویەکانی تر دەتوانین یەکەکانیان دەربهێنین لە سیستمی SI لە حەوت یەکە بنچینەیەکەی کەلەو خشتەیەدا هاتووە، بە پێ ی پێناسەی فیزیایی هەریەکە لەو بڕانە بۆ نموونە خێرایی سەرەنجامی دابەشکردنی دوورییە لە سەرکات، لەبەر ئەوەیە کەیەکەی پێوانە کردنەکەی m/s هەروەها یەکەی پێوانەکردنی تاودان $m/s^2$ وە یەکەی پێوانەکردنی هێز $kg{\bullet}m/s^2$ ئەم یەکانە پێیان دەوترێت یەکە دەرهێنراوەکان یان لقدارەکان کە دەتوانیت هەندێکییان لە**خشتەی 1-3** دا بەدی بکەیت.

**پێشگرە مەترییەکان لە سیستمی نێو دەوڵەتیدا:** زاناکانی فیزیا لیستێکی فراوانی بڕە کانیان ئامادە کردووە کە پێویسی بە مەودایەکی فراوانە لەپێوانەکان کە لە نێوان پێوانەی زۆر بچووك وەك دووری نێوان گەردیلەکانی تەنێکی ڕەق کە نزیکەی 0.000 000 001 m وە بڕە گەورەکاندایە وەك دووری نێوان ئەستێرەکان نزیکەی 100 000 000 000 000 000 m لەبەرئەوەی خوێندنەوەی ئەم جۆرە ژمارانە و مامەڵەکردنیان قورسە بۆیە دەتوانرێت دارشتنەوەکەی بەبەکارهێنانی هێزی ژمارەی 10 بکرێت ئەو کاتە بەدواییەکدا بەشێوەی $1 \times 10^{-9}$m و $1 \times 10^{17}$ m دەنوسرێن.



**وێنەی 1-6**
پێوەری فەرمی بۆ بارستایی کیلۆ گرامێك بریتییە لە لولەیەکی دارشتەی پلاتین و ئیریدوم کە پارێزراوە لە قاپێکی سەر داخراو لە نوسینگەی نێودەوڵەتی کێشان و پێوانەکان لە شاری سیڤر Sevres ی فرەنسی.

**خشتە 1-3** هەندێ لە بڕە داتاشراوەکان و یەکەکانیان لە سیستمی SI

| بڕ | هێمای بڕەکە | یەکە | کورتەی یەکە | داتاشراو |
|---|---|---|---|---|
| ڕوویەر | $A$ | مەتر دووجا | $m^2$ | درێژی x پانی |
| قەبارە | $V$ | مەتر سێجا | $m^3$ | درێژی x پانی x بەرزی |
| چڕی | $\rho$ | کیلۆگرام بۆ هەر مەتر سێجایەك | $\frac{kg}{m^3}$ | بارستایی / قەبارە |
| خێرایی | $v$ | مەتر بۆ هەر چرکەیەك | $\frac{m}{s}$ | درێژی / کات |
| تاودان | $a$ | مەتر بۆ هەر چرکە دووجایەك | $\frac{m}{s^2}$ | خێرایی / کات |
| هێز | $F$ | نیوتن | N | بارستایی x تاودان |
| وزە | $E$ | جوول | J | هێز x لادان |



**وێنەی 7-1**
دەتوانرێت بارستایی ئەم مێشولەیە بە چەند شێوەیەکی جیاواز دەربېرێت $1 \times 10^{-5}$ kg یان 0.01 g یان 10 mg .

هێزی ژمارە 10 دەخرێتە سیستمی نێو دەوڵەتی پێوانەکان لەگەڵ بەستنیان بەپێشگری یەکەکان کە هەر پێشگرەیەك ئاماژە دەکات بەیەکێك لە هێزەکانی ژمارە 10 هەروەك چۆن ڕوون کراوەتەوە لە وێنەی **7-1** وە ئەم پێشگرانە ئاماژە دەکەن بۆ بەشەکانی ئەو یەکانە یا چەند جارەکانیان.

لەخشتەی **4-1** دا زۆربەی پێشگرە بەکارهاتووەکان و هێماکانیانی تێدایە بۆ نموونە ئەگەر درێژی مێشێك $5 \times 10^{-3}$ m بێ،ئەوا دەتوانرێت دەربرینەکەی بە 5 mm بێ هەروەها دەتوانین دووری مانگێکی دەستکرد (سەتەلایت) لە زەویەوە بە 825 km دەربرین لە جیاتی $8.25 \times 10^{5}$ m گۆڕینی پێشگری یەکەیەك کە لە خشتەی **4-1** دایە ئاسانە لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر لەسەر بنەمای گۆڕینی کۆلکەکانی یەکەیکیان بۆ ئەوی تریان.

بۆ نموونە دەتوانین نووسینی ئەم گۆڕینە $1 \text{ mm} = 1 \times 10^{-3}$ m بەم شێوەیە بنووسین:

$$\frac{10^{-3}\text{ m}}{1\text{ mm}} = 1 \quad \text{یان} \quad \frac{1\text{ mm}}{10^{-3}\text{ m}} = 1$$

ئێستاکە دەتوانیت هەر پێوەرێك بێت لێکدانی یەکێك لەو دوو کەرتەی بکەین (واتە ژمارەی 1)، ئەوا یەکەکە دەگۆڕێت بەڵام بڕە فیزیاییە وەسف کراوەکە وەك خۆی دەمێنێتەوە. بۆ گۆڕینی پێوانەکان ئەو کۆلکەی گۆڕینە بەکاربهێنە کە ڕێگە دەدات بە لابردنی ئەو یەکەیەی کە دەتەوێ بیگۆڕی وە هێشتنەوەی یەکەداواکراوەکە، هەروەك لەم نموونەیەی خوارەوەدا ڕوون کراوەتەوە کەتیایدا گۆڕینی پێوانەی 37.2 mm بۆ مەتر m .

ئەو یەکانەی کە لانابرێت. ✗

$$37.2\text{ mm} \times \frac{1\text{ mm}}{10^{-3}\text{ m}} = 3.72 \times 10^{4}\ \frac{\text{mm}^2}{\text{m}}$$

ئەو یەکانەی کە لادەبرێن ✓

$$37.2\text{ mm} \times \frac{10^{-3}\text{ m}}{1\text{ mm}} = 3.72 \times 10^{-2}\text{ m}$$

**خشتە 4-1 هەندێ لە پێشگرەکانی هێزی ژمارە 10 ی بەکارهاتوو لە سیستمی پێوانەکردنی نێو دەوڵەتی دا.**

| پێشکۆ | | هێما | کۆلکەی توانی | بڕەکەی | نموونە (یەکەی پێوانەیی بە مەتر) |
|---|---|---|---|---|---|
| تیرا | Tera | T | $10^{12}$ | 1 000 000 000 000 | یەك تێرا مەتر $(Tm) = 1 \times 10^{12}$ مەتر |
| گێگا | Giga | G | $10^{9}$ | 1 000 000 000 | یەك گێگا مەتر $(Gm) = 1 \times 10^{9}$ مەتر |
| **میگا** | **Mega** | **M** | $10^{6}$ | **1 000 000** | یەك مێگا مەتر $(Mm) = 1 \times 10^{6}$ مەتر |
| **کیلو** | **Kilo** | **k** | $10^{3}$ | **1 000** | یەك کیلۆ مەتر $(km) = 1000$ مەتر $= 1 \times 10^{3}$ مەتر |
| هیکتو | Hecto | h | $10^{2}$ | 100 | یەك هێکتۆ مەتر $(hm) = 100$ مەتر $= 1 \times 10^{2}$ مەتر |
| دیکا | Deka | da | $10^{1}$ | 10 | یەك دیکا مەتر $(dam) = 10$ مەتر $= 10^{1}$ مەتر |
| | | | $10^{0}$ | **1** | |
| دیسی | Deci | d | $10^{-1}$ | 1/10 | یەك دیسیمەتر $(dm) = 0.1$ مەتر |
| **سنتی** | **Centi** | **c** | $10^{-2}$ | **1/100** | یەك سانتیمەتر $(cm) = 0.01$ مەتر |
| **ملی** | **Milli** | **m** | $10^{-3}$ | **1/1000** | یەك ملیمەتر $(mm) = 0.001$ مەتر |
| **مایکرۆ** | **Micro** | $\mu$ | $10^{-6}$ | **1/1 000 000** | یەك مایکرۆمەتر $(\mu m) = 1 \times 10^{-6}$ مەتر |
| نانۆ | Nano | n | $10^{-9}$ | 1/1 000 000 000 | یەك نانۆمەتر $(nm) = 1 \times 10^{-9}$ مەتر |
| بیکو | Pico | p | $10^{-12}$ | 1/1 000 000 000 000 | یەك بیکۆمەتر $(pm) = 1 \times 10^{-12}$ مەتر |
| فیمتۆ | Femto | f | $10^{-15}$ | 1/1 000 000 000 000 000 | یەك فیمومەتر $(fm) = 1 \times 10^{-15}$ مەتر |

تێبینی: پێویست ناکات خوێندکار هەموو خشتەکە لەبەر بکات بەڵام دەتوانێت تەنها ئەوانە لەبەر بکات کە بە پیتی ڕەشی ئەستور نوسراون.



**وێنەی 1-8** ( أ )
ڕووبەر هەژمار دەکرێت بە لێکدانی پێوانەی درێژی بە پێوانەی پانی،
وە ئاگاداربە دەبێ پێوانەکان بەهەمان یەکەبێت.

(ب)

2035 cm
x 12.5 m
1017.5
4070
2035
25437.5
نزیکەی ??
$2.54 \times 10^4$ cm.m

(ج)

20.35 m
x 12.5 m
10.175
40.70
203.5
254.375
نزیکەی ✓
$2.54 \times 10^2 m^2$

## گونجاندنی ڕەهەند لەگەڵ یەکەکاندا

پێویستە بۆ پێوانی بڕە فیزیاییەکان ئەو یەکانە بەکاربهێنرێت کە دەگونجێن لەگەڵ ڕەهەندی ئەو بڕانەدا. بۆ نموونە ناتوانرێت بۆ پێوانەی درێژی یەکەی کیلۆگرام بەکاربهێنرێت، لەبەر ئەوەی کە ئەو یەکەیە ڕەهەندی بارستایی دەنوێنێ، کەواتە پێویستە کە دڵنیابیت لەوەی کەیەکەی پێوانەکردنی هەر بڕەیەکی فیزیایی گونجاوبێت لەگەڵ ڕەهەندی ئەو بڕەدا. ئەگەر چەند کەسێك کە هەر یەکەیان بەتەنها هەمان بڕی فیزیایی بپێوێت، لەوانەیە کە هەر یەکەیان یەکەیەکی پێوانەی جیاواز لەوەی تریان بەکاربهێنێت کە بۆ یەك ڕەهەندیش بێ وەك **وێنەی 1-8** (أ) کە تیایدا دوو کەس دیارن و ڕەهەندەکانی ژوورێك دەپێون بۆ دیاریکردنی ڕووبەری ئەو مافورەی (فەرش) کە زەوی ژوورەکە دادەپۆشی. لەوانەیە یەکێك درێژی ژوورێك بەمەتر بپێوێت وە کەسێکی تر پانییەکەی بە (سانتیمەتر) بپێوێت وە کاتێك درێژی و پانی کەرەتی یەکتری بکرێت ئەوا وەڵامەکەی بە m.cm دەرئەچێ کە ئەمەش وەڵامێکی ڕاست نییە وەك ئەوەی لە **وێنەی 1-8** (ب) دا دیارە بەڵام ئەگەر هەمان یەکە بە مەتر بەکار بهێنرێت لە هەردوو پێوانەکاندا ئەوا یەکەی پێوانەکردنی ڕووبەرەکە بە مەتر دووجا $m^2$ دەبێت هەروەك لە **وێنەی 1-8** (ج) دایە. لەبەر ئەوە پێویستە کە یەکە جیاوازەکان بۆ یەك ڕەهەند بگۆڕێن بۆ هەمان یەکەی پێوانە کردنیش بەر لە دەستپێکردن بە کردارەکانی هەژمارکردن بۆ نموونە (سانتیمەتر) لەو نموونەی سەرەوەدا دەگۆڕین بۆ مەتر بۆ وەدەستهێنانی ڕووبەر بەمەتر دووجا ( $m^2$ )

چالاکییەکی کرداری
**خێرا**
**پێشگرەکان لە پێوانەکردندا**

**کەرەستەکان**

✓ تەرازوویەك تا 0.01g دەپێوێ.
✓ گورزەیەکی 50 پەڕەیی.

بەبەکارهێنانی یەکەکان و پێشگرە گونجاوەکان ئەم بارستایانەی خوارەوە بپێوە و تۆماریان بکە.
- بارستایی یەك پەڕە کاغەز.
- بارستایی 10 پەڕە کاغەز.
- بارستایی 50 پەڕە کاغەز.

بەراووردی ئەنجامی پێوانەکانت بکە بە بارستایی یەك پەڕە کاغەز.

یەکەجیاوازەکان بۆ پێوانی بارستەکانی پێشوو چییە؟ ئەنجامەکان بەکار بهێنە بۆ مەزەندەکردنی بارستایی 500 پەڕە بە بۆچوونی خۆت باشترین ڕێگە بۆ پێوانی بارستایی پەڕە کاغەزەکە کامەیە؟ هۆکەی ڕوون بکەرەوە.

## نموونە 1 (أ)

### پێشگرە مەترییەکان

**پرسیارەکە**

**بارستایی بەکتریا بەنزیکی دەکاتە 2.0 fg ئایا بارستایی بە (g) بە گرام وە بە (kg) کیلوگرام چەندە؟**

**شیکار**

**1. دەزانم**

**دراو:** بارستایی = 2.0 fg

**نەزانراو:** بارستایی = g ؟، بارستایی= kg ؟

**2. پلان دادەنێم**

پاڵپشت بە کۆلکەکانی گۆڕان لە پەیوەندی دراوەکاندا لە **خشتەی 1-4** دوو کۆلکەی گۆڕان هەیە کە ئەمانەن:

$$\frac{1\ fg}{1 \times 10^{-15}\ g} \quad \text{یان} \quad \frac{1 \times 10^{-15}\ g}{1\ fg}$$

**3. هەژماردەکەم**

یەکەی کۆلکەی یەکەم (لای ڕاست) بەلابردنی یەکەی 1 فیمتو (fg) بۆ دەستەبەرکردنی (g) گرام.

$$(2.0\ \cancel{fg})\left(\frac{1 \times 10^{-15}\ g}{1\ \cancel{fg}}\right) = \boxed{2.0 \times 10^{-15}\ g}$$

**4. هەڵدەسەنگێنم**

ئەم وەڵامە بەکاربهێنە و پەنابەبەکردارێکی وێکچووی لابردنی یەکەی گرام (g) بۆ وەدەست هێنانی یەکەی کیلۆگرام (kg):

$$(2.0 \times 10^{-15}\ \cancel{g})\left(\frac{1\ kg}{1 \times 10^{3}\ \cancel{g}}\right) = \boxed{2.0 \times 10^{-18}\ kg}$$

## ڕاهێنانی 1 (أ)

### پێشگرە مەترییەکان

1. تیرەی تاڵە قژێکی مرۆڤ 50 μm. ئایا ئەو تیرەیە بەمەتر (m) چەندە؟
2. کاتە لەرەی شەپۆلێکی ڕادیۆ 1μs. ئایا ئەو کاتە لەرە بەچرکە (s) چەندە؟
3. تیرەی گەردیلەیەکی هایدرۆجین نزیکەی (10 nm)
   - أ. بڕی ئەو تیرە یە بە (m) مەتر چەندە؟
   - ب. بڕی ئەو تیرە یە بە (mm) ملیمەتر چەندە؟
   - ج. بڕی ئەو تیرەیە بە (μm) مایکرۆ مەتر چەندە؟
4. دووری نێوان خۆرو زەوی بەنزیکە $1.5 \times 10^{11}$ m ئایا بڕی ئەو دوورییە بە تیرامەتر Tm و بەکیلۆمەتر (km) چەندە؟
5. تێکڕای بارستایی ئۆتۆمبێلێك بە نزیکەی $1.440 \times 10^{6}$ g ئایا بڕی ئەو بارستاییە بە (kg) کیلۆ گرام چەندە؟

# وردی و تەواوی یا ڕێکی Accuracy and Precision

تاقیکردنەوەکانی تاقیگە بەندە لەسەر ئەو پێوانە کردنانەی کە پێویستی بە وردبینی و شێنەییە. بەڵام لە ڕاستی دا هیچ پێوانەکردنێك نیە کە بەتەواوەتی بێ هەڵەبێ. وە ئەگەر چەند جارێك پێوانەی بڕێکی فیزیایی دیاری کراو بکەین مەرج نییە کە لە هەموو جارێکدا ئەنجامەکان وەك یەك بن. کاتێك کە باسی هەڵە دەکەین لە پێوانە کردندا، مەبەستمان دوو هۆکاری گرنگە کە ئەویش **وردی** accuracy پێوانەکردن و تەواوی یا ڕێکییەکەیەتی precision هەرچەندە ئەم دوو زاراوەیە هەمان مانا دەبەخشێت لای زۆربەی زۆری خەڵك، بەڵام لە زمانی زانستی دا بۆ هەر یەکەیان مانایەکی تایبەتی هەیە.

**وردی**

ڕادەی نزیکی نرخی پێوراوە لە نرخە ڕاستەقینەکەی ئەو بڕەی کە دەمانەوێت بیپێوین.

## وردی و هەڵە

وردی ئاماژە بە لەیەکچوون یان نزیکی نرخە پێوراوەکە دەکات لە نرخە پەسەندکراوەکەی یان ڕاستیەکەی. هەرچەندە پێوانەکردنە تاقیگەییەکان بۆ بڕێکی دیاریکراو نزیکی نرخە ڕاستەقینەکەی بێت، ئەوا ئەو پێوانەیە«ورد» تر دەبێت وە بە پێچەوانەشەوە ڕاستە بەڵام ڕێکی یا تەواوی ئاماژە بۆ پلەی نزیکی نێوان ئەنجامەکانی کۆمەڵێك لە پێوانەکردنە جیاوازەکانە بۆ یەك بڕ، کاتێك کە هەمان ڕێگە بۆ پێوانەکردنی بەکاربهێنرێت پێوانەکان ڕێك و تەواو دەبن ئەگەر ئەنجامەکانیان تەواولەیەك بچن لە نێوان خۆیان دا بەبێ ئەوەی کەوا پێویست بێت نزیکی نرخە پەسەندکراوەکەی بێت.

**تەواوی یا ڕێکی**

پلەی گونجاندنی پێوانەکردنە جیاوازەکانی بڕێکی دیاری کراوە. (نزیکی ژمارەکان لە یەکترەوە)

بۆ نموونە ئەگەر چەند پێوانە کردنێکی درێژی کتێبێکی دیاریکراو دەستەبەر بکەین کە (درێژیە ڕاستەقینەکەی 20.0 cm) کەبریتین لە 20.4 cm، 20.1 cm، 19.8 cm، 20.2 cm، 20.3 cm، 19.6 cm ئەوا دەڵێن پێوانە کردنەکان وردە (بەهۆی نزیکییان لە نرخە ڕاستەقینەکەیەوە)، بەڵام تەواویەکەی لاوازە (لەبەر ئەوەی تەواو لەیەك ناچن لە نێوخۆیاندا). بەڵام ئەگەر کۆمەڵێك لە پێوانەکردنە جیاوازەکانی هەمان بڕ دەستەبەر بکەین کە 21.0 cm، 21.1 cm، 21.2 cm ئەوا دەڵێن کە پێوانەکردنەکان وردنییە (بەهۆی دووریان لەنرخە ڕاستەقینەکەوە) بەڵام ڕێك و تەواوە بەهۆی لەیەکچوونیان یان نزیکیان لە نێوخۆیاندا هەروەها دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ نموونەی لەوحی تیرونیشانەکان لەکتێبی کیمیادا.

## هەڵە لە پێوانەکردنەکاندا

هیچ کارێکی تاقیگەیی بێ هەڵە نابێ، وە ئەو هەڵە تاقیگەییانەی کە لەگەڵ هەموو کردارێکی پێوانەییدایە دەبێتە هۆی کەم ووردی یان نارێکی و نا تەواوی پێوانەکردنە تاقیگەییەکان وەیان هەردووکیان بەیەکەوە. ئەگەر لە ناو بردنی هەڵە تاقیگەیەکان بە شێوەیەکی ڕیشەیی کردارێکی ئەستەم بێ، گرنگ ئەوەیە کە هەڵەکە کەم بکرێتەوە بۆ نزمترین ئاست بۆ دەستە بەرکردنی باشترین ئەنجام. هەڵە دروست بووەکانی پێوانەکردنی تاقیگەیی دەکرێن بە دوو بەشەوە: هەڵەی مرۆیی و هەڵەی ئامێرەکانی پێوانەکردن.

## هەڵەی مرۆیی

بۆ نموونە هەڵەی مرۆیی لە ئەنجامی هەڵە کردنە لە خوێندنەوەی ئامێرەکانی پێوانەکردنەوە یان هەڵە لە ڕێگای پێوانەکردندایە یان لە تۆمارکردنی ئەنجامەکاندایە یەکێك لە ڕێگاکان بۆ بنبڕ کردنی هەڵەی مرۆیی دووبارە کردنەوەی پێوانەکردنە بۆ دڵنیابوون لە هاوگونجاندنی ئەنجامەکان، بە دانانی ڕێسا و ڕێوشوێنێکی توند بۆ ڕێگەی پێوانەکردن. بۆ نموونە کاتێك درێژی دەپێوین بەهۆی ڕاستەیەکی مەترییەوە










**وێنەی 1-9**
ئەگەر ڕاستەوخۆ سەیری نیشاندەری پێوانەی (أ) بکەین دەبینین کە درێژی پەنجەرەیەك 165.2 cm بەڵام ئەگەر لە لا تەنیشتەوە سەیری وێنەی (ب) و (ج) بکەیت ئەوا پێوانەیەك دەست دەکەوێت کە هەڵەی تێدایە.

پێویستە ڕاستەوخۆ چاومان لە سەر نیشانەکانی ڕاستەکە بێت. وەك لە **وێنەی 1-9** (أ) دایە. بەڵام ئەگەر لە لاتەنیشتەوە بڕوانینە نیشانەی ڕاستەکە ئەوا پێوانەکردنەکە زیاد یان کەم دەکات. هەروەك لە **وێنەی 1-9** (ب) و (ج) دا دیارە. ئەم کێشەیە پێی دەوترێت جیاوازی گۆشەی تێڕوانین parallax بە هۆی ئەوەوە خوێندنەوەی شۆفێرێك بۆ نیشاندەری خێرایی (گێچ) ووردترە لەخوێندنەوەی ئەوکەسەی کە لەتەنیشتی دانیشتبێ.

## هەڵەی ئامێری پێوانەکردن

**جیاوازی گۆشەی تێڕوانین**
جیاوازی خوێندنەوەکانە بۆ پێوانەکردنێکی دیاریکراو گەر لە چەند گۆشەیەکی جیاوازەوە سەیر بکرێت.

ئەگەر تەرازوو یان ئامێری پێوانەکردنی درێژی بەشێوەیەکەی ڕاست و ئاسایی ئیش نەکەن ئەوا هەردووکیان دەبنە هۆی دروستبوونی هەڵەکانی پێوانەکردن بۆیە ئەبێ دەزگای تاقیگەکان بە وردی و ورياییەوە بە کاربهێنرێت ودەزگاکان لەبارێکی باشدابن.

## کاریگەری وردی و تەواوی (ڕێکی) لەهەڵەی ئامێرەکانی پێوانەکردن

شتێکی سروشتی یە کە هەڵەی تاقیگەیی گەر هەڵەیەکی مرۆیی یان لە ئامێری پێوانەکردنەکاندا بێ کاریگەری دەبێ لەسەر وردی ئەنجامی پێوانەکردنەکان وە چەند لە هەڵە تاقیگەییەکان کەم بکرێتەوە ئەوا پێوانەکردنەکان وردتر و نزیکتر دەبن لە نرخە ڕاستەقینەکەی بڕە پێوراوەکە. بەڵام تەواوی (ڕێکی) لە سنووری توانای ئامێرەکانی پێواندا دەبێت. ئەو ڕاستەیەی کە بە مللیمەتر پلە پلە کرابێت پێوانەکەی دابینکراو ترو تەواوتر دەبێ وەك لەوەی کە ڕاستەکە بە سانتیمەتر پلە کرابێت جا لە بەرئەوە پێوانە کراوێك کە 1.32 m نزیکتر و ڕێکتر (تەواوتر) دەبێ لە پێوانی 1.3 m. دەتوانیت پاڵپشتی تەواوی پێوانەکردن لە زۆر لە بوارەکاندا بکەیت ئەویش بەمەزندە کردنێکی پەسندکراوی شوێنی نیشانەی پێوانەکە لەسەر ئامێرەکە. گریمان ویستت کە درێژی قەڵەمێك بپێویت بەهۆی ڕاستەیەکی پلە کراو بە cm وەك لە وێنەی **1-10** دا دیارە ئەوا سەری قەڵەمەکە دەکەوێتە نێوان 18 cm و 18.5 cm ئێستا کە پێویستە شوێنی سەری قەڵەمەکە مەزندە بکەیت لە نێوان ئەو دوو نیشانەدا. سەری قەڵەمەکە لە نێوان ئەو دوو نیشانەدا وا دەردەکەوێت کە نزیکترە بۆ نیشانەی 18 cm کە ئەو کاتە دەتوانیت درێژی قەڵەمەکە مەزندە بکەیت بە 18.2 cm.

## ڕەنووسە واتاییەکان Significant Figures

ڕەنووسە پێوراوەکانی تاقیکردنەوە زانستییەکان لەسەر شێوەی ڕەنووسی واتایی



**وێنەی 10-1**

لەگەڵ ئەوەی ئەم راستەیە بە cm و نیو cm پلە کراوە، دەتوانین لە پێوانەکردنە ڕێکەکاندا (تەواوەکاندا) بە خەملاندن بەکاریان بهێنین بە مللیمەتر mm

**ڕەنووسە واتاییەکان**

هەموو ڕەنووسە زانراوەکان (بێ هەڵەکان) دەگرێتەوە سەرباری دوا ڕەنووس کە خەملێنراوە بە «نزیکەیی»

ئەدرێت، کە ئەویش بەڵگەی پلەی تەواوی(ڕێکی) پێوانەکردنەکانە. «ڕەنووسی واتایی» گشت ئەو ژمارە و خانە دیاریکراوە ڕاستانە دەگرێتە خۆ، سەرباری دوا ژمارە خەملێنراوە گومانلێکراوەکەش.

درێژی قەڵەمەکەی وێنەکەی سەرەوە کە 18.2 cm سێ ڕەنووسی واتایی دەگرێتەخۆ دووانیان ( 8,1 ) بەشە زانراوەکەی پێوانەکە پێك دێنێت لە پێوانەکە، وەسێیەم کە «2» بریتیە لە ژمارەیەکی خەملێنراو لەبەر ئەوە نرخی ڕاستەقینەی پێوانەکردنەکە لە نێوان 18.15 cm و 18.25 cm، تێبینی دەکەین تەواوی (ڕێکی) پلەکان لە ئامێری پێوانەکردندا ژمارەی (ڕەنووسە واتاییەکان ) دیاری دەکات. کاتێك کە دوا ژمارە لە پێوانەکەدا (سفر) بێ، گرانە کە بڵێن سفر ڕەنووسێکی واتاییە یان بەهای پایەکەی (ئاستەکەی) پاراستوە خۆ ئەگەر پێوانەی درێژیەکی دیاریکراو 230 mm بێ ئەو کاتە ناتوانین بڵێن کە پێوانەکە دوو ڕەنووسی واتایی یان سیان لە خۆ دەگرێت.

**خشتە 1-5 ئەو ڕێسایانەی کە سفرەکان بە ڕەنووسە واتاییەکان دادەنێن.**

| ڕێسا | نموونە |
|---|---|
| **1.** سفرە دیارەکانی نێوان ڕەنووسەکان هەموویان واتایین. | أ. 50.3 m سێ ڕەنووسی واتایی تێدایە.<br>ب. 3.0025 s پێنج ڕەنووسی واتایی تێدایە. |
| **2.** سفرە دیارەکانی لای چەپی ڕەنووسەکان واتایی نین. | أ. 0.892 kg سێ ڕەنووسی واتایی تێدایە.<br>ب. 0.0008 ms یەك ڕەنووسی واتایی تێدایە. |
| **3.** ئەو سفرانەی دەکەونە کۆتایی ژمارەوە و لای ڕاستی کەرتی دەبی واتایین | أ. 57.00 g چوار ڕەنووسی واتایی تێدایە.<br>ب. 2.000 000 kg حەوت ڕەنووسی واتایی تێدایە. |
| **4.** سفرەکانی لای ڕاستی ژمارە و لای چەپی وێر گوڵەوە واتایی دەبن ئەگەر بە کردار پێوراو بن یان ژمارەی خەملێنراوی یەکەم بن. ئەگینا ناواتایی دەبن. لەم کتێبەدا بەناواتایی دادەنرێن. | أ. 1000 m بۆی هەیە لەیەك ڕەنوسی واتایی تا چوار ڕەنووسی واتایی تێدابێ بە پێی وردی پێوانەکردنەکە بەڵام وا دادەنێین تەنها یەك ڕەنووسی واتایی تێدایە.<br>ب. 20 m بۆی هەیە یەك یان دوو ڕەنووسی واتایی تێدابێ، بەڵام وا دادەنێین تەنها یەك ڕەنووسی واتایی تێدایە. |

**خشتە 6-1 ڕێسا کردەییەکانی هەژمارکردن لەگەڵ ڕەنووسە واتاییەکان**

| کرداری هەژمارکردن | ڕێسا | نموونە | |
|---|---|---|---|
| کۆکردنەوە و لێکدەرکردن | وەڵامی کۆتایی کە دەکەوێتە لای ڕاستی وێرگوڵەکە (فاریزە) هەمان ژمارە لەو خانانە لە خۆ دەگرێت کە دەکەوێتە لای ڕاستی وێرگوڵەکەوە لە پێوانەکردندا کەکەمترین ژمارەی ئەو خانانەی تێدایە. | 97.3<br>+ 5.85<br>103.15 | بەنزیکی دەکاتە 103.2 |
| لێکدان و دابەشکردن | وەڵامی کۆتایی هەمان ژمارە لە ڕەنووسە واتاییەکانی ئەو پێوانە کردنەیان تێدادەبێت کە لە کەمترین ڕەنووسی واتایی پێکهاتووە. | 123<br>x 5.35<br>658.05 | بەنزیکی دەکاتە 658 |

لەکاتی لێکداندا هەمان ئەو ڕێسایانە دەگرینە بەر. گریمان کە داوات لێکراوە ڕووبەری ژوورێك هەژمێربکەیت بە لێکدانی درێژی لە پانی ئەگەر درێژی ژوورەکە 6.7 m وە پانی 4.6m بێ ئەوا سەرەنجامی لێکدانی ئەو دوو نرخە دەکاتە $30.82\ m^2$ . بەڵام ئەم وەڵامە چوار ڕەنووسی واتایی دەگرێتە خۆ، کە ئەمەش ووردیەکەی زیاترە لە پێوانەکردنی هەریەکە لە درێژی و پانی. لەبەر ئەوەی کە ژوورەکە لەوانەیە بچوك بێت تا سنووری 6.65 m x 4.55 m یان گەورەتر تا سنووری 6.75 m x 4.65 m لەبەر ئەوە پێوانەی ڕووبەرەکە ئەبێ لە نێوان هەردوو نرخی $30.26\ m^2$ و $31.39\ m^2$ بێت ڕووبەری ژوورەکە دەبێ بەتەنها دوو «ڕەنووسی واتایی» تێدابێ وەك پێوانی درێژی و پانی. لەبەر ئەوەیە کە پێویستە ژمارەی $30.82\ m^2$ پێویستە نزیك بکرێتەوە بۆ ژمارەی $31\ m^2$ . **خشتەی 6-1** پوختەی دوو یاسای تێدایە بۆ دیاریکردنی ژمارەی (ڕەنووسە واتاییەکان) لە کاتی ئەنجامدانی هەژمێرکردندا.

**خشتە 7-1 ڕێساکانی سوڕانەوە (نزیکخستنەوە)**

| کەی نزیکی دەکەینەوە | چۆن نزیکی دەکەینەوە | نموونە |
|---|---|---|
| ئەو ژمارەیەیی کە دوای «ڕەنووسی واتایی» دێت یەکێك لەو ژمارانەبێت 0، 1، 2، 3، 4 واتە لە 5 کە متربێت. | نزیك دەخرێنەوە بە کەمکردنەوەی ژمارەکان. | 30.24 دەبێتە 30.2 |
| ئەو ژمارەیەی کە دوای «ڕەنووسی واتایی» دێت یەکێك لەو ژمارانەبێت 5، 6، 7، 8، 9 واتە لە 5 وەبۆ گەورەتر. | نزیك دەخرێتەوە بەبەرزکردنەوەی ژمارەکان. | 22.49 دەبێتە 22.5 |

## ئامێرەکانی ژمێرەر و ڕەنووسە واتاییەکان

ئـامێرەکـانـی ژمێرەر بـەکـاردەهـێنین لـە شیـکـارکـردنـی پـرسیـارەکـان و پـێوانـە کردنەکاندا چونکە لەخۆت خێراترن لە هەژمێرکردندا. بەڵام بەرەچاوکردنی ژمارەی ئەو ڕەنووسە واتایانەی ناو پێوانەکردنەکان، ئامێرەکانی ژمێرە زیادەڕەوی دەکەن لە تەواوی(ڕێکی)دا کاتێك وەڵامێك دەدات ڕەنوسەکانی بەپێی فراوانی مۆنیتەرەکە دەبێت کە ڕێگەی پێ دەدات.

بۆ جێگیرکردنی ڕێبازی ڕاستی وەڵامەکانی ئەو پرسیارانەی لەو کتێبەدا هاتوون ژمارەکـانیـان ڕەنـووسە واتـاییـەکـان لـەخۆدەگرێت کە ئـەوەش بـۆتـە هـۆی تـەواوی لـە پـێوانـەکردندا. بۆ ئـەوەی وەڵامـەکە ژمـارەیـەکی ڕاستـی لـە « ڕەنـووسە واتـا»ییـەکـانـی تێدابێت ئەوا هەندێ جار پەنا دەبەیت بۆ **نزیکخستنەوەی** rounding ئەنجامەکان بەبەکارهێنانی ڕێسا نیشاندراوەکان لە خشتەی **1-7** ی ئەم کتێبەدا ئەنجامی ژمێرە کـردنـەکـانـی هـەموو کردارێکی بیرکـاریـانـە نزیك دەخـەینـەوە بۆ نموونـە ئـەنجامـی زنجیـرەیـەك لـە کـردارەکـانـی لـێکدان و دابـەشکـردن نـزیك دەخـرێنـەوە بـەپـێی ڕێسا تایبەتیەکان پێش دەست کردن بە کردارێکی تری کۆکردنەوە یان لێکدەرکردن. لە مـامـۆستـاکـەت بـپـرسە کـەئـایـا وەڵامــەکـە نـزیك بـخـەیـتـەوە یـان تـا لـێبـونـەوە لەهەژمارکردنەکان دوا بخرێت.

> **نزیکخستنەوە یان سوڕانەوە**
>
> لابردنی خانەکانە لە پێوانەکردندا بە پێی ڕێسایەکی دیاریکراو، بە شێوەیەك کە پێوانەکردنەکە ژمارەیەکی داواکراو لە خانە واتاییەکانی هەبێت.

## پێداچوونەوەی بەندی 2-1

**1.** ئەو یەکانە کامانەن کە لە سیستمی نێو دەوڵەتیدا بەکاری دەهێنیت لەم پێوانەکردنانەی خوارەوە دا:

أ. درێژی حەوزێکی مەلەکردن.

ب. بارستایی ئاوی ناو حەوزەکە.

ج. ئەو کاتەی کە مەلەوانەکە دەیخایەنێت تا دەگاتە ئەو سەری حەوزەکە

**2.** ئەم پێوانانە. بگۆڕە بەپێ ی داواکاریەکانی خوارەوە.

أ. 6.20 mg بۆ یەکەی kg

ب. $3 \times 10^{-9}$s بۆ یەکەی ms

ج. 88.0 km بۆ یەکەی m

**3.** سێ خوێندکار چڕی پارچە قورقشمێکیان پێوا هەریەکەیان بۆ سێ جار ئەگەر بزانیت کە چڕی قورقوشم $11.34\ g/cm^3$وە دوای بەدواداچوونی وەڵامی هەریەك لە خوێندکارەکان کام لە ئەنجامەکان وورده، کامیان تەواوە؟ کامیان ووردنی یە و تەواو نی یە؟

أ. ئارین $11.32\ g/cm^3$ ،$11.35\ g/cm^3$ ،$11.33\ g/cm^3$

ب. کوردین $11.42\ g/cm^3$ ،$11.44\ g/cm^3$ ،$11.43\ g/cm^3$

ج. بەرزین $11.04\ g/cm^3$ ،$11.34\ g/cm^3$ ،$11.55\ g/cm^3$

**4.** ڕێساکـانـی ڕەنـووسە واتـایـەکـان جـێبـەجـێ بـکـە لـە ئـەنجامـدانـی ئـەم هـەژمـارانـەی خـوارەوە؟

أ. $26 \times 0.02584 = ?$ .

ب. $15.3 \div 1.1 = ?$

ج. $782.45 - 3.5328 = ?$

د. $63.258 + 734.2 = ?$

## بەندی 3-1

# زمانی فیزیا

## *The Language of Physics*

## بیرکاری و فیزیا

کاتێك کە زاناکانی فیزیا سمپڵێکی ساکار دائەهێنن بۆ ئەوەی لە جیهانی دەوروبەر بە شێوەیەکی باشتر تێبگەن، ئەوا ئامرازە بیرکارییەکان بەکاردەهێنن بۆ شیتەڵ کردن و پوختە کردنی سەرنج و تێبینیەکانیان پاشان دەتوانن پەیوەندی و هاوکێشە بیرکاریەکان بەکاربهێنن لە نێوان بڕە فیزیاییەکاندا بۆ پێشبینی کردنی ئەوەی ڕوودەدات لە بارێکی دیاری کراودا.

### خشتە و وێنە هێڵکارییەکان

زۆر ڕێگە هەیە بۆ نواندنی زانیارییەکان (داتاکان) بە تێڕوانینی ئەو تاقیکردنەوەی کە لە وێنەی **1-11** دا دیارە. تاقیکردنەوەی گریمانەکەی گالیلۆ نیشان ئەدات کە تێیدا گۆیەکی گۆڵف و تێنس دەخرێنە خوارێ، وە پێوانی ئەو دوورییەی کە هەریەکەیان دەیبرێت لە کاتێکی دیاریکراودا. ئەنجامەکان تۆمارکران لەسەر شێوەی کۆمەڵێك لە ژمارە کە ئاماژە بەکاتی کەوتنە خوارەوە دەکەن و ئەو دوورییەی کە هەریەکە لە گۆیەکان دەیبرێت لەو ماوەیەدا. ڕێگەی گونجاو بۆ شیتەڵ کردنی داتاکان و زانیاریەکان ئەوەیە کەلەخشتەیەکدا وەك **خشتە 1-8** دابنرێت ئەو داتایانە بۆچوونێکی ڕێك دەردەخات. ئەویش ئەوەیە بەزیادبوونی دووری بڕاوی گۆیەکە کاتی کەوتنە خوارەوە زیاددەکات.

خشتە **1-8** **داتاکانی تاقیکردنەوەی کەوتنە خوارەوەی گۆیەکە**

| کاتی خایەنراو (s) (بەچرکە) | دووری بڕاوی تۆپی گۆلف لە کەوتنەخوارەوەیدا بە (cm) | دووری بڕاوی تۆپی تێنس لە کەوتنە خوارەوەیدا بە (cm) |
|---|---|---|
| 0.067 | 2.20 | 2.20 |
| 0.133 | 8.67 | 8.67 |
| 0.200 | 19.60 | 19.59 |
| 0.267 | 34.93 | 34.92 |
| 0.333 | 54.34 | 54.33 |
| 0.400 | 78.40 | 78.39 |

کێشانی هێلکاری ئەو چەماوەیەی کە دووری کەوتنە خوارەوەی گۆیەکە لە هەر ماوە کاتێکدا بێت بە باشترین ڕێگە دادەنرێت بۆ شیکردنەوەی «داتا»کان وەك لە **وێنەی 1-12**، بۆ نموونە چەماوەکە ڕێگە ئەدات بەخەملاندنی دووری بڕاوی تۆپەکە لە کاتێکی دیاریکراودا کە لە زانیاریەکاندا «داتاکاندا» نەبێت. وەك 0.225 s لەسەر تەوەرەی کات هەروەها شێوەی چەماوەکە زانیاری پەیوەندی نێوان دووری و کاتی خایەنراو دەستە بەر دەکات. هەروەها دەتوانین بە هۆی ئەم هاوکێشەی خوارەوە وەسفی پەیوەندی نێوان گۆڕاوەکانی ئەو تاقیکردنەوەیە بکەین.

گۆڕانی شوێن بە (m) = 4.9 x [ کاتی کەوتنە خوارەوە بە (s) ]$^2$ ئەم هاوکێشەیە ڕێگە بە وێنەکێشانی چەماوەکە ئەدات ئەویش بە پێشبینیکردنی بڕی گۆڕان لە شوێندا لە نێو هەر ماوەکاتێکی کەوتنە خوارەوە دا بێت.

### 3-1 ئامانجەکان

- زانیاری خشتەکان و وێنە هێڵکاریەکان ڕوونددەکاتەوە.
- هاوکێشە فیزیاییەکان لە هێڵکاری زانیاریەکانەوە وەدەست دێنێت.
- جیاکردنەوە لەنێوان هێمایی یەکەکان و بڕەکان.
- شیکردنەوەی ڕەهەندی بەکاردەهێنێت بۆ دڵنیابوون لە درووستی هاوکێشە فیزیاییەکان.
- ئەنجامدانی هەژمارکردنی پلەی بڕ.



**وێنەی 1-11**

تاقیکردنەوەی تێست کردنی دروستی گریمانەکەی گالیلۆ لە بارەی خستنە خوارەوەی دوو گۆی جیاواز لە بارستاییداو یەکسان لە قەبارەدا.




**وێنەی 1-12**
ئەم وێنە هێڵکاریە ڕێگەیەکی گونجاوی کورتکراوەی زانیاریەکانە، وە پەیوەندی نێوان دوری کەوتنە خوارەوەی تەنێك و ماوەی خەملێنراوی ئەو کەوتنە خوارەوەیە نیشان ئەدات.

## گرنگی هاوکێشە فیزیاییەکان

لە کاتێکدا کە زاناکانی بیرکاری هاوکێشەکان بەکاردەهێنن بۆ وەسف کردنی پەیوەندی نێوان گۆڕاوەکان، زاناکانی فیزیا بیرکاری بەکار دەهێنن وەك هۆکارێك بۆ وەسف کردنی پەیوەندیەکانی نێوان بڕە فیزیاییەکان لەبارێکی دیاریکراودا.

بۆ نموونە لە وانەیە گۆڕاوێك یان چەند گۆڕاوێك کار لە ئەنجامی تاقیکردنەوەکە بکات لەکاتی پێشبینی کردندا هاوکێشەی فیزیایی نمایشێکی کورتە کە پشت بە سامپڵی بارەکە دەبەستێت ئەگەر هاوکێشەکە بیر و بۆچوونمانی دەربارەی چۆنێتی بەیەکەوە بەستنی دوو گۆڕاو یان زیاتری بەیەکەوە ڕوونکردەوە ئەوا زۆرینەی هاوکێشە گرنگەکانی فیزیا ژمارەکان ناگرنە خۆ، بەڵکو وەسفێکە بۆ پەیوەندی نێوان بڕە فیزیاییەکان. بۆئەوەی هاوکێشەکانی بە پێ ی توانا کورت و پوخت بێ ئەوا زانا فیزیاییەکان پیت و هێماکان بە کاردەهێنن بۆ ناساندنی بڕە فیزیاییەکان بۆ نموونە هێمای $v$ بۆ ئاماژەکردن بەبڕی خێرایی و پیتە یۆنانیەکان بەکار دەهێنرێت بۆ ناساندنی کردارە بیرکارییەکان بۆ نموونە هێمای $\Delta$ (دەلتا) هەندێ جار بەکاردەهێنرێت بۆ ئاماژە کردنی جیاوازی لە نێوان «گۆڕان لە» وە هێمای $\Sigma$ (سیگما) بەواتای «کۆ یان سەرجەم».

ئەگەر ئەو زاراوانە بەکاربهێنین ئەوا هاوکێشەکەی سەرەوە بەم شێوەیەی خوارەوە دەنوسرێت.

$$\Delta y = 4.9(\Delta t)^2$$

کە هێمای $\Delta y$ ئاماژە بە گۆڕان لە شوێنی گۆیەکە دەکات لە خاڵی دەستپێکردنی جووڵەکەیەوە، وە هێمای $\Delta t$ ئاماژە بەکاتی خایەنراو دەکات لە سەرەتای جووڵەکەوە، **لەبەندی 1-2** ، دا زانیت کە یەکەکان بە هێما دەنوێنرێن کە پیتی لاتینی ئاسایین وە بڕە فیزیاییەکانیش بە هێماکان کە پیتی یۆنانی «لار» کراوەیە. وە لە پاشکۆی (ب) دا یەکەکان و بڕە فیزیایەکان دەبینی کە دێتەڕێت لە ساڵەکانی خوێندنتا بۆ زانستی فیزیا.

**خشتە 1-9** هێمای گۆڕاوەکان و یەکەکان

| بڕە | هێما | یەکە | پیتی یەکەکە |
|---|---|---|---|
| گۆڕان لەشوێندا | $\Delta x$ ،$\Delta y$ | مەتر | m |
| ماوە (کات) | $\Delta t$ | چرکە | s |
| بارستایی | $m$ | کیلۆگرام | kg |

# هەڵسەنگاندنی ڕشتە فیزیاییەکان

## شیتەڵکردنی ڕەهەندی Diensional analysis

گریمان ئەو ئۆتۆمبێلەی کە لە **وێنەی 13-1** دایە، بەگوڕی 88 km/h دەجووڵێ، وەگەرەکتە کە بزانی کاتی خایەنراو چەندە بۆ بڕینی 725 km . ئایا چۆن ڕێگەی دروست هەڵدەبژێریت بۆ شیکارکردنی ئەم پرسیارە؟ دەتوانیت پشت ببەستی بە ڕێگەیەکی کاریگەر کەپێی دەوترێت شیتەڵکردنی ڕەهەندی dimensional analysis کە ئەم شیتەڵکردنە پشت بەوە دەبەستێت کە دەتوانین لە مامەڵە کردندا ڕەهەندەکان وەك بڕە جەبرییەکان دابنێین. بۆ نموونە بەتەنها دەتوانرێت دوو بڕ کۆبکرێتەوە یان لێکدەربکێرێت ئەگەر هەمان ڕەهەندیان هەبێ ئەوکات هەردوو لای هاوکێشەکە هەمان ڕەهەندی هەیە.

ئەم ووردەکاری و تەکنیکە جێ بەجێ دەکەین لەسەر پرسیاری ئەو ئۆتۆمبێلەی کە بەخێرایی 88 km/h دەجووڵا تێبینی دەکەین ڕەهەندی خێرایی «درێژی لەسەرکاتە» وە ڕەهەندی دووری براو «درێژی» یە ئەگەر خێرایی کەرەتی (جارانی) دووری بکەین ئەم ئەنجامەی خوارەوە وەدەست دەهێنین.

$$\text{خێرایی} \times \text{دووری} = \frac{\text{درێژی}}{\text{کات}} \times \text{درێژی} = \frac{\text{درێژی}^2}{\text{کات}}$$

یان

$$725\ \text{km} \times \frac{88\ \text{km}}{1.0\ \text{h}} = \frac{6.4 \times 10^4\ \text{km}^2}{1.0\ \text{h}}$$

روون و ئاشکرایە کە ئەو ڕەهەندەی لە وەڵامەکەوە دەستمان کەوتووە «کات» نی یە وەك داوا کرابوو. بۆ ئەوەی وەڵامەکە «ڕەهەندی کات» بێ پێویستە لەسەرت کە(درێژی دابەشی خێرایی) بکەیت بە پێی ئەمەی خوارەوە

$$\text{درێژی} \div \frac{\text{درێژی}}{\text{کات}} = \frac{\text{درێژی} \times \text{کات}}{\text{درێژی}} \quad \text{یان} \quad 8.2\ \text{h} = \frac{725\ \text{km} \times 1.0\ \text{h}}{88\ \text{km}} = \text{کات}$$

بۆ شیکارکردنی ئەو جۆرە پرسیارە ساکارانە پێویستی بە شیکاری ڕەهەندی نی‌یە، بەڵام لە بارە ئاڵۆزەکاندا شیکاری ڕەهەندی پێکهاتەی قۆناغێکی سەرەتایی ژیرانەیە، کە زۆر لە کاتی شیکار کردنت بۆ کەم دەکاتەوە.

## پلەی بڕ: Order of Magnitude

مەودای زانستی فیزیا فراوانە بۆ گرتنە خۆی ژمارە گەورەکان وەك ئەو نموونانەی کە بەکار هێنراون لە زانستی گەردوون ناسیدا، یان ئەو ژمارە بچووکانەی بەکارهاتوون لەبواری فیزیای ناوکیدا.

لەبەرئەوە هەندێ جار وابەباشتر دەزانرێت وەڵامەکەی مەزەندە بکرێت پێش شیکار کردنێکی ووردی پرسیارەکە ئەم جۆرە مەزندە کردنە لە هەژمارکردندا ناسراوە بە پلەی بڕ order of magnitude کە ئەمەش مانای ئەوە دەبەخشێت دیاریکردنی هێزی ژمارە 10 ی نزیکترین لە بەهای ژمارەی ڕاستەقینەی بڕێکی فیزیایی. ئەم هەژمێرکردنە یارمەتیت دەدات بۆ بڕیاردانت لەسەر ناڕاستی (هەڵەی) ئەو وەڵامانەی کە هەمان «پلە بڕیان» نەبێ هەر چەندە وەڵامەکەش ووردبێت. بۆ نموونە گەشتی ئۆتۆمبێلە باسکراوەکە وەربگرین کاتێ چارەسەری بابەتی شیکردنەوەی ڕەهەندیمان کرد وە پێویستە کە دووری دابەشی گوڕ (خێرایی) بکرێت بۆ وەدەستهێنانی کات.

### شیتەڵکردنی ڕەهەندی

بەکارهێنانی ڕەهەندەکانە بۆ بنیات نانی هەندێ لە هاوکێشە فیزیایە ساکارەکان یان دڵنیابوون لە ڕاست و دروستیان.



**وێنەی 13-1**

شیتەڵکردنی ڕەهەندی بە ڕێگەی ووردی بەکەڵك دائەنرێت بۆ چەند چەشنێکی زۆر لە پرسیارەکان وەك پرسیاری دیاریکردنی کاتی خایەنراوی پێویست بۆ ئەو ئۆتۆمبێلەی کە دووری 725 km ببڕێ بەگوڕی 88 km/h .

### پلەی بڕ

توانێکی ژمارە 10 کە نزیکە لە بەهای ژمارەی بڕێکی فیزیایی.

درێژی 725 km نزیکترە لە $10^3$ km یا 1000 km وەك لە $10^2$ km یا 100 km لەبەرئەوە $10^3$ km بەکاردەهێنن بەڵام خێرایی 88 km/h بە نزیکی $10^2$ km/h یان 100 km/h کەواتە « پلەی بڕ»ی ماوە کات بریتیە لە:

$$\frac{10^3\ \text{km}}{10^2\ \text{km/h}} = 10\ \text{h}$$

ئەم نرخە وا دەگەیەنێت کە وەڵامی ڕاست پێویستە نزیکتر بێت لە ژمارە 10 نەك ژمارە 1 یان 100 . بەڵام لە پێشتر بۆت دەرکەوت کە وەڵامی ڕاست بریتییە لە 8.2 h کەواتە وەڵامەکە گونجاوە لەگەڵ هەژمێر کردنی «پلە بڕ» دا: هەروەها دەتوانرێ «پلەی بڕ» بەکاربهێنرێت لەو بارانەی کە زانیاری تەواو دەربارەیان نەبێت.

بۆ نموونە چۆن بڕی ئەو سووتەمەنییەی کە ئوتومبێلەکان ساڵانە لە وولاتێکی دیاریکراودا بەکاری دەهێنن دەخەملێندرێت؟

گریمان وك نموونە، کە ژمارەی دانیشتوانی کوردستانی باشوور 5 000 000 کەسە وەهەر خێزانێك کە لە پێنج کەس پێك هاتبێ و یەك ئۆتۆمبێلی هەبێ ئەوا ژمارەی ئۆتۆمبێلەکان بە 1 000 000 ئۆتۆمبێل یان بە $1 \times 10^6$ مەزەندە دەکرێت وە لەلایەکی ترەوە بۆ پێوانی ئەو دووریەی کە هەر ئۆتۆمبێلێك ساڵانە دەیبڕێت . هەندێك لە ئۆتۆمبێلەکان نزیکەی 10000 km دەبڕن لە ساڵێکدا وە هەندێکی تریان نزیکەی 30000 km دەبڕێت ئەوا دەتوانرێت پلەی بڕی ناوەندە دووریەکە بە 20000 km واتە $2 \times 10^4$ km دابنرێت.

ئەگەر وا دابنێن کە هەر ئۆتۆمبێلێك $20\ l$ لە سووتەمەنی بەکار دەهێنێت بۆ بڕینی دووری 100 km ئەوا ساڵانە بڕی:

$$(20\ 000\ \text{km}) \times 20\ l / 100\ \text{km} = 4000\ l.$$

ئەگەر ئەم ژمارەیە کەڕەتی ژمارەی ئۆتۆمبێلە مەزەندەکراوەکان بە 1,000,000 ئۆتۆمبێل بکەین، ئەوا دەبینین کە سووتەمەنی بەکارهاتوو ساڵانە بەنزیکەی:

$$1 \times 10^6 \times (4000\ l\ /\ \text{ئۆتۆمبێل}) = 4 \times 10^9\ l.$$

لە ڕاستیدا ئەم ژمارەیە لە ژمارەی ڕاستەقینەکە کەمترە لەبەر ئەوەی لەکاتی بەنزیك خەملاندنی ژمارەی ئۆتۆمبێلەکاندا ڕەچاوی ئەوە نەکراوە کە خێزانی وا هەیە کە زیاتر لە ئۆتۆمبێلێکی هەیە، هەروەها بەکارهێنانی سووتەمەنی بازرگانیشمان فەرامۆش کردووە.

## پێداچوونەوەی بەندی 1-3

**1.** کام لەم وێنە هێڵکاریانەی خوارەوە بەنزیکی وەڵامە بۆ زانیاریە دراوەکان؟

| بارستایی هەوا ( kg ) | قەبارەی هەوا ( $m^3$ ) |
|---|---|
| 0.644 | 0.50 |
| 1.936 | 1.50 |
| 2.899 | 2.25 |
| 5.159 | 4.00 |
| 7.096 | 5.50 |










**وێنەی 1-14**

**2.** کام لەم هاوکێشانەی خوارەوە دەگونجێ لەگەڵ زانیاریەکانی پرسیاری ژمارە ( 1 ).

أ. 1.29 (قەبارە) = $(\text{بارستایی})^2$

ب. 1.29 = بارستایی × قەبارە.

ج. 1.29 × قەبارە = بارستایی.

د. 1.29 × $(\text{قەبارە})^2$ = بارستایی

**3.** ئەو زاراوەو هێندانە کامانەن کە ئەم یەکەی پێوانەکردنانە دیاری دەکات.

أ. kg (m/s) (1/s)

ب. $(kg/s)\ (m/s^2)$

ج. $(kg/s)\ (m/s)^2$

د. (kg/s) (m/s)

**4.** کام لەمانەی خوارەوە باشترین مەزەندە کردنە بۆ ( پلەی بڕ)ی بەرزی چیایەك بە مەتر؟

أ. $10^0$ m

ب. $10^1$ m

ج. $10^2$ m

د. $10^3$ m




# بازاڕی بەکارهێن



لەوانەیە لەوەو پێش ئەم بانگەوازو ڕیکلامانەی خوارەوەت خوێندبێتەوە (فرۆشتنی سەدەها هەزار بوتڵی ئاوی کانزایی) یان (قایلکردنی ملیۆنەها کڕیار). ئەم ژمارانە ئێجگار گەورەن. کێ بە ئامار کردنی ئەو هەموو بوتڵ و کڕیارانە هەستاوە؟ ئایا ئەو ژمارانە جێی باوەر پێکردنە؟ لەباری زۆرینەی ژمارە گەورەکاندا وەك ژمارەی ئەستێرەکانی گەردوون، کە ژمارەکانیان بەتەواوی نازانرێ. لەڕاستیدا کەس نایەوێت کە ژمارەی تەواوی بوتڵەکانی ئاوی کانزایی یان ژمارەی کڕیارەکانی وەیان ژمارەی ئەستێرەکانی گەردوون بزانێت. ژمارەی ئەو کەل و پەلانە لە ڕاستیدا خەملێنراوە لەسەر بنچینەی زانیاریەکانی تر، وەك ژمارەی ئەو بوتڵە ئاوە کانزاییانەی کە لە کۆمپانیاکە پڕ دەکرێتەوە یان داهاتەکانی فرۆشتنی کۆمپانیا دیاریکراوەکە، یان ژمارەی ئەستێرە بینراوکان لە پانتایەکی دیاری کراوی ئاسماندا. بابزانین ئەوە چۆن ڕوو ئەدات؟ گریمان ژمارەی بوتڵە ئاوە کانزاییەکان کە لە هەرێمی کوردستان فرۆشراوە مەزەندە کراوە بەیەك ملیۆن بوتڵ لە ڕۆژێکدا بە درێژایی دە ساڵی ڕابردوو واتە ( 3650 ڕۆژ).

بە پێی ئەو گریمانەیە بەرهەمی کۆمپانیاکانی ئاوی کانزایی بە درێژایی ئەو ساڵانە بریتییە لە

$$3.65 \times 10^{9}\ \text{بوتڵ} = 3.65 \times 10^{3} \times \frac{10^{6}\ \text{بوتڵ}}{\text{ڕۆژ}}\ \text{ڕۆژ.}$$

بەڵام چۆن دڵنیا دەبین لە ڕاستی ئەو مەزەندە کراوانە لە کاتێکدا کە هیچ کەسێك ئاماری ژمارەیی ئەو بوتڵانەی نەکردووە! بۆ دڵنیابوونت دەتوانی لێکۆڵینەوە لەو واتا خەمڵێنراوانە بکەیت بە گوێرەی هەر یەکێکەوە، وە بزانیت کە ئایا ئەنجامەکەی پەسندکراوە گریمان ژمارەی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان نزیکەی ( 6 ) ملیۆن کەسە، ئەگەر ملیۆنێك بوتڵی بەکارهێنراو لە ڕۆژێکدا دابەش بە 6 ملیۆن کەس بکرێت ئەوا ئەنجامەکەی $\frac{1}{6}$ کە ئەوە دەگەیەنێ کە هەر یەك لە شەش کەس بوتڵێکی ئاوی کانزایی خواردۆتەوە لە ڕۆژێکدا، بەڵام ئەوانی تر کە ماون لە سەرچاوەکانی تر ئاو دەخۆنەوە، ئەمەش مانای وایە ئەو گریمانەیە پەسندکراوە، وە ئەگەر هەریەك لە شەش کەس لە کوردستاندا کەمێك زیاتر یان کەمتر لە بوتڵێك ئاوی کانزایی لە ڕۆژێکدا بەکارهێنا نەوەك بوتڵێکی تەواو، دەتوانین بەکارهێنانی هەر تاکێك بەدرێژایی ماوەیەکی زیاتر بۆ نموونە یەك مانگ هەژمێر بکرێت ئەو کات دەڵێین تێکڕای بەکارهێنانی یەکێك لە شەش کەس لە کوردستان لە مانگێکدا نزیکەی ( 30 ) بوتڵ ئاوی کانزاییە کە ئەمەش یارمەتیمان دەدات، لە هەژمێرکردنی تێکڕایی بەکارهێنانی کەسێك بۆ دڵنیابوون لەسەر دروستی گریمانە بەکارهاتووەکان کە دانراون.

دەتوانیت ڕێگایەکی هاوشێوە بەکاربهێنیت بۆ مەزندەکردنی ژمارەی مۆبایلە فرۆشراوەکانی مانگانە لە کوردستاندا.



# پوختەی بەشی 1

## بیرۆکە بنەڕەتییەکان

### بەندی 1-1 زانستی فیزیا چییە؟

- زانستی فیزیا: بریتییە لە لێکۆڵینەوەی جیهانی سروشتی، لە ووزە و جوڵەوە تاوەکو ڕووناکی و کارەبا.
- زانستی فیزیا پرۆگرامی زانستی بەکار دەهێنێ بۆ دۆزینەوەی ئەو یاسا گشتیانەی کە دەتوانین بەکاریان بهێنین بۆ دانانی پێشبینەکان کە چەند بارێکی جۆراوجۆر باس دەکات.
- تەکنیکی بەربڵاوی پەیڕەوکراو لە زانستی فیزیادا بۆ شیتەڵکردنی بارێکی ئاڵۆز بریتیە لە فەرامۆشکردنی ئەو هۆکارانەی کە گونجاو نین، وە داهێنانی (سامپلێك) کە وەسفی ئەوە بکات لە سیستمێکدا یا بارێکدا چ شتێك بە بنچینە دابنرێت.

### بەندی 2-1 پێوانەکردن لە تاقیکردنەوەکاندا

- بۆ دەستنیشانکردنی پێوانەکردن لە زانستی فیزیادا یەکە نێودەوڵەتیەکان بەکاردەهێنین کە سیستمێکە کۆمەڵە یەکەیەکی بنچینەیی و پێشگرەکان بەکاردەهێنێت بۆ وەسف کردنی پێوانەکانی بڕە فیزیاییەکان.
- وردی: ئاماژەیەکە بۆ ڕادەی نزیك بوونەوەی پێوانەکردن لە ڕاستی. وە تەواوی دەرەنجامی پلەی دیاریکردنی تەواوە بۆ ئامێری پێوانی بەکار هاتوو.
- ڕەنووسە واتاییەکان بەکار دەهێنرێ بۆ ئاماژەکردن بە ژمارە ڕاستەکان و ژمارە مەزەندە کراوەکان لە پێوانەکردندا.
- ڕێساکانی ڕەنووسە واتاییەکان ڕێگەیەکە بۆ دڵنیابوون لە ئەنجامی هەژمێرکردن کە تەواوتر نییە لەو زانیاریانەی کە بەکارهاتوون بۆ وەدەست هێنانی ئەو ئەنجامە.

### بەندی 3-1 زمانی فیزیا

- زاناکان کارەکانیان ئاسان دەکەن بە پوختەکردنی زانیاریەکان لە خشتەکان و وێنە هێڵکاریەکاندا، وە بە کورت کردنەوەی بڕەکان لە هاوکێشەکاندا.
- لەوانەیە شیتەڵکردنی ڕەهەند یارمەتیدەربێ بۆ دڵنیابوون لە ڕاستی هاوکێشە زانستییەکە.
- هەژمارکردنی پلەی بڕ ڕێگا دەدات بەمەزەندەکردنێکی خێرا بۆ ڕادەی گونجاندنی وەڵامەکە لەگەڵ ئەو بارەدا.

### هێماى گۆڕاوەکان

| | بڕەکان | یەکەکان |
|---|---|---|
| $\Delta x$ ،$\Delta y$ | گۆڕان لە شوێندا | m (مەتر) |
| $\Delta t$ | ماوە (کات) | s (بەچرکە) |
| $m$ | بارستایی | kg (بەکیلۆگرام) |

## زاراوە بنەڕەتییەکان

**پرۆگرامی زانستی** Scientific method (لا 6)

**سیستم** System (لا 6)

**مۆدێل** Model (لا 7)

**تاقیکردنەوەی کۆنترۆڵکراو** Controlled experiment (لا 8)

**ڕەهەند** Dimension (لا 10)

**وردی** Accuracy (لا 15)

**تەواوی** Precision (لا 15)

**جیاوازی گۆشەی تێروانین** Parallax (لا 16)

**ڕەنووسە واتاییەکان** Significant figures (لا 17)

**نزیککستنەوە** Rounding (لا 19)

**شیتەڵکردنی ڕەهەندی** Dimensional analysis (لا 22)

**پلەی بڕ** Order of magnitude (لا 22)

# پێداچوونەوەی بەشی 1



## پێدابچۆرەوە و هەڵیسەنگێنە

## زانستی فیزیا:

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**1.** بە پێداچوونەوە بەخشتەی **1-1** کە لە لا پەرە 5 دایە بە لایەنی کەمەوە دوو بوار لە بوارەکانی فیزیا دیاریبکە کە هەریەك لەم بارانە بگرێتەوە:

أ. دروستکردنی سیستمی گەورەکردنی دەنگ لە ئوتومبێلەکەتدا.

ب. بازدان بە پەتێکی پلاستیکی (یاری پەت پەتێن).

ج. خەملاندنی گەرمی گڵپەی ئاگردانێك بە تێڕوانینی.

د. خۆ نوقم کردن لە حەوزێکی مەلەکردندا بۆ سارکردنەوەی لەش لەرۆژێکی گەرمدا.

**2.** کام لەم سیناریۆیانەی خوارەوە دەگونجێ لەگەڵ پرۆگرامی زانستیدا

أ. گوێ گرتنی فیتەرێکی میکانیکی لەو دەنگەی دەردەچێ لە بزوێنەری ئوتومێلێکەوە کە لە کارکردنداییێت بۆ بڕیاردان لەسەر هۆی ناسازی و گرفتی کارکردنی بزوێنەری ئوتۆمبێلەکە. بۆچوونێك گەڵاڵە دەکات لە بابەت گرفتەکەوە. پاشان بۆ دڵنیابون لە دروستی بۆچوونەکەی هەڵدەستێ بە سازدانی تایمی سلۆلیەکەی (برغوی تایمی خێرایی) لەسەر ئەم بنچینەیە بڕیار ئەدات کە بۆچوونەکەی هەڵەیە، لە کۆتاییدا بڕیار ئەدات کە گرفتەکە لە (فیت پەمپە) وەیە، لەبەر ئەوە پرس بە فیتەری تریش دەکات لەدروستی بۆچوونەکەی

ب. لەبەر جیاوازی بۆچوونەکانی خوێندکاران بۆ ئەو شوێنەی کە بۆی بچن لە ڕۆژی سەیرانەکەیاندا، لێپرساوی پۆل بڕیاری هەڵبژاردنی دا، کە زۆربەی خوێندکاران بڕیاریاندا، کە بچنە باخچەی گشتی لە جیاتی کەنار دەریا.

ج. تیپی قوتابخانەکەت گەیشتنە یاریەکانی کۆتایی پاڵەوانیتی قوتابخانەکان لە تۆپی سەبەتەدا (باسکە). هاورێیەکت کە لە قوتابخانەکەی تری رکابەرتان بووە، وتی کەوا تیپەکەیان دەیباتەوە چونکە یاریزانەکانیان زۆر تامەزرۆی بردنەوەن زیاتر لە یاریزانانی قوتابخانەکەی ئێوە.

د. ئاوی فوارەکەی (ئاو ساردەکەرەوەیەك) بۆ ئەو بەرزییەی دەمانەوێ سەر ناکەوێت لەوە دەچێت کە سۆندەکە باش توند نەکرابێت، بۆیە هەوڵی توندکردنی دەدەیت، لەئەنجامدا ئاوەکە بەتەووژم بەرزدەبێتەوە و دەتوانیت ئاوەکە بخۆیتەوە برادەرەکانت لەم کردارە ئاگادار بکەرەوە.

**3.** بڕیارتدا ئوتۆمبیلێکی نوێ بکڕیت بەبەکارهێنانی پرۆگرامی زانستی چی دەکەی؟

**4.** بیر لەم دەستەواژەیەی خوارەوە بکەرەوە: (ڕێوییەکی قاوەیی بە خێرایی بەسەر سەگێکی تەمبەڵدا بازی دا)، ووردە کاری فەرامۆش کراو لەلایەن زانایەکی فیزیاوە کامانەن کاتێك کە سامپڵ بۆ جووڵەی ڕێویەکە لەم بارەدا دادەنێت.

## یەکەکانی SI

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**5.** یەکەی بنچینەیی گونجاو دیاری بکە بۆ یەکەکانی سیستمی نێودەوڵەتی پێویست (لەگەڵ پێشگردا گەر پێویست بێ) بۆ ئەم برانەی خوارەوە:

أ. کاتی پێویست بۆ ئیش پێکردنی سیدیەکی ستریۆ.

ب. بارستایی ئوتۆمبێلێکی پێشبڕکێ.

ت. درێژی گۆڕەپانی یاری تۆپی پێ.

ج. تیرەی پارچە پیتزایەکی گەورە.

چ. بارستایی پارچە گۆشتێك.

ح. ماوەکاتی وەرزێکی خوێندن.

خ. دوری نێوان ماڵەکەتان و، قوتابخانەکەت.

د. بارستاییەکەت.

ر. درێژی هۆڵی تاقیگەی فیزیا لە قوتابخانەکەت.

ز. بەرزی باڵات (درێژیەکەت).

**6.** یەکەی پێوانەکردنی خێرایی m/s ، ئایا بە چ یەکەیەك دووجای خێرایی دەپێورێت؟

**7.** یەکەی پێوانەکردنی هێز نیوتنە $(1\ \text{Newton} = 1\ \text{kg}\cdot\text{m/s}^2)$ وە یەکەی پێوانەکردنی خێرایی m/s ئایا یەکەی پەیدا بوو لە ئەنجامی دابەشکردنی (هێز لەسەر خێرایی) چییە؟

### پرسیار دەربارەی چەمکەکان

**8.** بەرزی ئەسپ هەندێ جار بە «بست» دەپێورێت. بۆچی ئەم یەکەیە بە پێورێکی وورد دانەنرا؟ تا پێناسە کرا بەم شێوەیە: « 1 بست = 20 cm».

**9.** باشیەکانی پێناسەی (مەتری فەرمی) ڕوونبکەرەوە کە دووری براوی ڕووناکیە لە کاتێکی دیاریکراودا لەجیاتی ئەوەی کە درێژی ڕاستەیەکە لە کانزایەکی تایبەت.

**10.** ئەنیشتاین ئەم هاوکێشە بەناوبانگەی دانا $E = mc^2$ کە m بارستایی تەنەکەیە، C خێرایی ڕووناکییە ئەوا یەکەی E لە سیستمی نێودەوڵەتی یەکەکاندا چی یە؟

### پرسیارەکانی ڕاهێنان

**11.** ئەم یەکانەی خوارەوە بگۆڕە بۆ:

أ. 2 dm بەیەکەی mm .

ب. 2 h 10 min بەیەکەی s .

ج. 16 g بەیەکەی μg

د. 0.75 km بەیەکەی cm .

هـ. 0.675 mg بەیەکەی g .

و. 462 $\mu$m بەیەکەی cm .

ز. 35 km/h بەیەکەی m/s

(بەنموونەی 1 أ دا بچۆرەوە)

**12.** پێشگری یەکەکانی سیستمی نێودەوڵەتی یەکەکان کە لە خشتەی (**1-4** )ی لا 12 دا دراوە بۆ گۆڕینی یەکەکانی پێوانەکردن بەکاربهێنە بۆ گۆڕینی ئەم یەکە دراوانە بۆ بڕی گونجاو.

أ. 10 بەشە وانە

ب. 2000 چۆلەکە .

ج. $10^{+6}$ مێرولە

د. $10^{+9}$ گیسك

هـ. $10^{18}$ گەردیلە (ئەتۆم) (بە نموونەی 1 «أ» بچۆرەوە)

**13.** خێرایی ڕووناکی لە بۆشاییدا بە نزیکی $3.00 \times 10^8$ m/s بەیەکەی km ئەو دووریە بدۆزەرەوە کە پرتەیەکی تیشکە لێزەر لە ( 1 کاتژمێر) دا دەیگاتێ (بە نموونەی 1 (أ) دا بچۆرەوە).

**14.** یەك تەنی مەتری دەکاتە، $1.00 \times 10^3$ kg ئایا سەرخەرێك چەند کەس بێ مەترسی بەرزدەکاتەوە، ئەگەر ئەوپەڕی توانای بەرزکردنەوەی، « 1 تەنی مەتری » بێت، وە ئەگەر بزانیت بارستایی هەریەکێکیان 85 kg، (بەنموونە 1 «أ» بچۆوە)

## وردی و تەواوی و ڕەنووسە واتاییەکان

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**15.** ئایا دەکرێت کۆمەڵێك لە پێوانەکردنەکان تەواو بێت بەڵام ورد نەبێ؟ باسی بکە.

**16.** چەند «ڕەنووسی واتایی» لەم پێوانانەی خوارەوەدا هەیە؟

أ. 300 000 000 m/s

ب. 25.030°C

ج. 0.006 070°C

د. 1.004 J

هـ. 1.30 520 MHz

**17.** وێنەی (**15-1** ) ئاڵوگۆڕکردنی یەکەکانی تێدایە لەسەر هەندێ لە شتومەکەکان لێکۆڵینەوەیەك ئەنجام بدە لەسەر ئەو گۆڕینانە ئایا خاوەنی ئەو شتومەکانە ڕەنووسە واتاییەکانی بەشێوەیەکی ڕاست بەکارهێناوە؟




وێنەی 15-1

**18.** وەك زانراوەکە خێرایی ڕووناکی لە بۆشاییدا $2.99\ 792\ 458 \times 10^8$ m/s ئەوا خێرایی ڕووناکی بنوسە کە بەم شێوازانە بێ:

أ. سێ ڕەنووسە واتا.

ب. پێنج ڕەنووسە واتا.

ج. حەوت ڕەنووسە واتا.

**19.** چەند ڕەنووسی واتایی هەیە لە هەریەك لەم پێوانانەی خوارەوەدا؟

أ. 78.9 ± 0.2 m

ب. $3.788 \times 10^9$ s

ج. $2.46 \times 10^6$ kg

د. 0.0032 mm

**20.** ئەم کرداره ژمێرەییانەی خوارەوە جێبەجێ بکە:

أ. کۆی پێوانەکردنەکانی 756 g و 37.2 g و 0.83 g و 2.5 g .

ب. 3.2 m دابەش بکە بەسەر 3.563 s .

ج. π کەرەتی ( لێکدانی ) 5.67 mm بکە.

د. 3.8 s دەربکە لە 27.54 s .

**21.** ڕاوچیەك دووماسی ڕاوکرد کە درێژی بچوکەکەیان 93.46 cm ( بەدوو ژمارەیی دەیی و چوار ڕەنووسە واتایی) و درێژی گەورەکەیان 135.3 cm ، (بە ژمارەیەکی دەیی و چوار ڕەنوسە واتایی) ئەوا درێژی گشتی هەردوو ماسیەکە چەندە؟

**22.** جوتیارێك ویستی چێوەی کێڵگە لاکێشەییەکەی خۆی بپێوێت. بۆ ئەو مەبەستە درێژی و پانییەکەی پێوا. بینی کە درێژیەکەی 38.44 m ، وەپانی 19.5 m بوو ئایا چێوەی کێڵگەکەی چەندە؟

## شیتەڵکردنی ڕەهەندەی و مەزندەکردنی پلە بڕ

### پرسیارەکانی‌پێداچوونەوە

تێبینی: لە کاتی هەژمێرکردنی «پلە بڕدا» پێویستە لەسەرت کە گریمانە سەرەکیەکانت لەبیر بێت لەگەڵ بەهای ئەو ژمارەییەی کە ئەیدەیتە هەر گۆڕاوێکی بەکارهاتوو لە شیکارکردنەکەدا وە سەرسوڕماو مەبە ئەگەر ئەنجامەکەت لە ئەنجامی هاوڕێکانت نەچێت لەکاتی ئیشکردندا.

**23.** وادابنێ A، B دوو بڕی ڕەهەند جیاوازن کام لەم کردارە ژمێریانەی خوارەوە، مانای فیزیایی هەیە:

أ. A + B        ب. A / B

ج. A x B        د. A - B

**24.** پلە بڕ بەیەکەی گونجاوی درێژی مەزەندە بکە بۆ هەر یەکە لە مانەی خوارەوە :

أ. مێش

ب. قاچێکت

ج. درێژی بینای قوتابخانەکەت.

د. زەرافە

هـ. بەرزی مناریەك

**25.** گریمان کە هەردوو لای هاوکێشەیەك هەمان ڕەهەندی هەیە، ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە هاوکێشەکە ڕاستە؟

**26.** لەم هاوکێشەیەی خوارەوەدا $r$ نیوەتیرەی بازنەیەکە کە سێگۆشەیەك دەوری داوە درێژی لاکانی $a$ و $b$ و $c$ :

$$r = \sqrt{\frac{(s-a)\,(s-b)\,(s-c)}{s}}$$

کاتێك کە: $s = (a + b + c) \div 2$ ئەوا لە لێکچوونی ڕەهەندەکانی ئەو هاوکێشەیە بکوڵەرەوە؟

**27.** کاتە لەرەی بەندۆڵێکی سادە بەوە پێناسە دەکرێت کە کاتی پێویستە بۆ تەواو کردنی یەك لەرە ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە کاتە لەرەی بە پاتی بەندۆڵی سادەیە.

$$T = 2\,\pi \sqrt{\frac{L}{g}}$$

کاتێك کە $L$ درێژی بەندۆڵەکەیە، $g$ تاودانی زەویە (کە بەیەکەی درێژی دابەشی دووجای کات کرابێت دەپێورێت).
ئەوا لە لێکچوونی ڕەهەندەکانی ئەم هاوکێشەیە بکوڵەرەوە.

### پرسیار دەربارەی چەمکەکان

**28.** لەکاتی هەوڵدان بۆ شیکارکردنی پرسیارێکی تاقیکردنەوەکان خوێندکارێك ئەم هاوکێشەی خوارەوەی بەکارهێنا:

(خێرایی بەیەکەی m/s)$^2$ = (تاودان بەیەکەی m/s$^2$) x (کات بەیەکەی s)

شیتەڵکردنەوەی ڕەهەندی بەکاربهێنە بۆ دڵنیابوون لەڕاستی هاوکێشەکە.

**29.** ژمارەی هەناسەدانی مرۆڤ بە درێژایی ژیانی چەندە بیخەمڵێنە، ئەگەر تێکڕای تەمەنی مرۆڤ 70 ساڵ بێت.

**30.** ژمارەی لێدانی دڵت لەیەك ڕۆژدا چەندە بیخەمڵێنە؟

**31.** تەمەنت بەیەکەی (s) بخەمڵێنە.

**32.** لە یەکێك لە ریکلامەکاندا هاتووە، کە جۆرە تایەیەکی ئوتومبێل بەکاردێت بۆ بڕینی ماوەی 1 000 000 km . ئەوا ژمارەی خولەکانی تایەکە لە ماوەی بەکارهێنانیدا بخەمڵێنە وادابنێ نیوەتیرەی تایەکە 0.3 m

**33.** وا دابنێ کە بەڕێوەبەری کۆگای دەستەبەرکردنی کەلوپەلی وەرزشیت لە یانەیەکی تۆپی پێدا. وە ئەرکی سەرشانت دەستەبەرکردنی ژمارەی پێویستە لە « تۆپەکان » هەندێ لەو تۆپانە بەکەڵکی بەکارهێنان نایەت یان وون دەبێت لە کاتی ڕاهێنان و یاریکردندا.
ئەوا ژمارەی تۆپە کڕاوەکان چەندە لە ساڵێکدا ئەگەر بزانی تیپەکەت 18 یاری کردووە لە وەرزێکدا (وادابنێ لەهەر یاریەکدا 5 تۆپ وون بوە یان لە کەڵك کەوتووە).

**34.** یەکێك لە ڕێستورانتەکانی خواردنی خێرا(سەندویچ) لە گۆشت ئامادە دەکات، ئاشکرایکرد کە زیاتر لە 50 ملیار ژەمە خواردنی فرۆشتوە لە ڕۆژی دامەزراندنیەوە. بیخەمڵێنە بە کیلۆگرام kg بارستایی ئەو گۆشتەی کە بەکارهاتووە لە ئامادەکردنی ئەو ژمارەیە لە ژەمەکان، وەژمارەی ئەو (مانگایانەی) کە سەربڕاون بۆ ئامادەکردنی ئەو بڕە گۆشتەی کە پێویستە.

**35.** ژمارەی تۆپەکانی تێنس کە پێویستە بۆ پڕکردنەوەی ژورێك کە درێژییەکەی 4m و پانیەکەی 4m بەرزییەکەی 3m بێت بخەمڵێنە (وادابنێ تیرەی هەر تۆپێکی تێنس بە 3.8cm )

## پێداچوونەوەی گشتی

( چێوە = $2\,\pi r$ ، ڕووبەر = $\pi r^2$ ).

**36.** چێوە و ڕووبەری ئەو دوو بازنەیەی کە لە خوارەوە هاتووە هەژمێربکە (بەبەکارهێنانی ئەم دوو هاوکێشەیە)

أ. بازنەیەك کە نیوەتیرەکەی 3.5 cm بێت.

ب. بازنەیەك کە نیوەتیرەکەی 4.65 cm بێت.

**37.** کاتی پێویست چەندە بۆ ژماردنی بڕی 5 ملیار دینار لە جۆری 500 دیناری بێ، ئەگەر زانیت هەر تاکێك بۆ ژماردنی ماوەی 1 چرکە بخایەنێت، وە نوستن و خواردن لە ڕۆژێکدا 10 کاتژمێر دەخایەنێت.

**38.** یەکێك لە جۆرەکانی بەفرەمەنی دروست کراوە لە شێوەی «خشتەك» یان شەش پاڵودا، قەبارەی هەر چوار دانەیان $3.786 \times 10^{-3}\ m^3$ ئایا درێژی هەر لایەك لە لاکانی ئەو دەفرەی کە خشتەکەی تێدایە چەندە؟

**39.** دەتوانیت «پلە بڕ»ی قەبارەی گەردیلەیەك بدۆزیتەوە بە هۆی ئەم تاقیکردنەوە ساکارەی خوارەوە: دڵۆپە زەیتێك دابنێ لەسەر ڕووبەرێکی گەورەی ئاو. وادابنێ کە ئەستووری چینە زەیتەکە دەکاتە تیرەی یەك گەردیلە، وە بارستایی دڵۆپە زەیتەکە $9.00 \times 10^{-7}$ kg وەچڕی زەیتەکە $918\ kg/m^3$ وە دڵۆپە زەیتەکە لەسەر شێوەی بازنەیەك بڵاودەبێتەوە کە نیوەتیرەکەی 41.8 cm ئایا تیرەی دڵۆپە زەیتەکە بە نزیکی چەندە؟

**40.** لە هەموو چرکەیەکدا یەك نیزەکی وردی تیرە $1.0 \times 10^{-6}$ m دەکەوێتە سەر یەك مەتر دووجا لەسەر ڕووی هەیڤ. کەواتە چەند ساڵێکمان دەوێت بۆ پەیدا بوونی چینێك کە ئەستووریەکەی 1.0m بێ لەو نیزکانە لەسەر ڕووی هەیڤ. وا دابنێ کە قوتویەکی خشتەکی (شەش پاڵو) درێژی لایەکی 1.0 m ، دانراوە لەسەر ڕووی هەیڤ ئایا پڕ بوونەوەی ئەو قوتوە بەو نیزەکانە چەند دەخایەنێت؟

**41.** بارستایی یەك سەنتیمەتر سێ جا $(1.0\ cm^3)$ ئاو لە پلەی گەرمی 25°C دەکاتە $1.0 \times 10^{-3}$ kg بارستایی $1.0\ m^3$ لەو ئاوە هەژمێربکە.

**42.** ئەگەر وا دابنێین لە سەدانەوەدی %90 مادە زیندووەکان ئاوە، و ە چڕی ئاو $1.0 \times 10^3\ kg/m^3$. ئەگەر زانیت بارستایی = قەبارە × چڕی ئایا بارستایی:

أ. شانەیەکی شێوە گۆیی کە تیرەکەی 1.0 $\mu m$ چەندە؟ (قەبارە = $\frac{4}{3}\pi r^3$)

ب. مێشێکی شێوە لولەکی درێژیەکەی 4.0 mm وەتیرەکەی 2.0 mm ؟ (قەبارەی = $l\pi r^2$)

**43.** بارستایی هەسارەی کەیوان ( زوحەل ) دەکاتە $5.68 \times 10^{26}$ kg وە نیوەتیرەکەی $5.85 \times 10^{7}$ m ئایا:

أ. چڕی ئەو هەسارەیە چەندە (سەرەنجامی دابەشکردنی بارستایی و قەبارەکەی بەیەکەی $g/cm^3$ ؟
(قەبارەی گۆ = $\frac{4}{3}\pi r^3$)

ب. ڕووبەری ڕووی ئەم هەسارەیە چەندە بەیەکەی $m^2$ ؟
(ڕووبەری ڕووی گۆ = $4\pi r^2$)

## پرۆژە و ڕاپۆرتەکان

### هەڵسەنگاندنی بەجێهێنان

**1.** ئایا دەتوانیت بارستایی پارچە دراوێك بپێوێت کە لە جۆری «سەنت» بێ بەهۆی تەرازووی خۆکێشانەوە؟ پێوانی بارستایی ژمارەیەك لەو دراوانە تۆماربکە پاشان ئەو پێوانە کردنە دابەشی ژمارەی دراوەکان بکە بۆ ئەوەی بڕی (بەهای) نزیکراوەیی بارستایی یەك پارچە وەدەست بهێنیت، لەم هەژمێرکردنانەدا پەیرەوی ڕێساکانی (ڕەنوسە واتایەکان) بکە ئەم هەنگاوانە دووبارە بکەرەوە بەبەکارهێنانی ژمارەیەکی جیاواز لە دراوەکان. بە بۆچۆنی تۆ کام لە پێوانە مەزندە کراوەکانت ووردترە؟ وەکام لە پێوانەکردنەکانت تەواوترە؟

### هەڵسەنگاندنی دۆسیە

**2.** بگەڕێ بۆ ناوی ئەو زانایەی کە لە ساڵی ڕابردوودا خەڵاتی نۆبڵی پێ بەخشرا لە فیزیادا لەسەر توێژینەوەو کارەکانی، توێژینەوەیەك بنووسە سەبارەت بە مێژووی خەڵاتەکە و وەناوی داهێنەرەکەی، وەهۆی دامەزراندنی خەڵاتەکە کێ دەیبەخشێت لەکوێ ئەدرێت. توێژینەوەکەت پشتڕاست بکەرەوە لە دۆسییەکدا یا لە پۆستەرێکدا بەبەکار هێنانی کۆمپیوتەرەکەت نیشانی بدە.

**3.** کاتژمێرێکت پێیە کە میلی چرکە ژمێری تێدایە، ڕاستەیەکی پلەکراو بە میللمەتر (mm) ، وە لوولەکێکی پلەکراو بە میللی لتر (ml) وەتەرازوویەکی هەستیار تاڕادەی 1 mg لەبەردەستدایە، چۆن هەریەکە لە مانە دەپێویت: بارستایی دڵۆپە ئاوێك، کاتە لەرەی جووڵەی جۆلانەیەك، قەبارەی بەندێك کاغەز، چۆن وردی پێوانەکان زیاد دەکەیت؟ ئەو ڕێگایانە بنووسە بە ڕوونی و ئاشکرایی کە پێویستە برادەرەکەت بیگرێتەبەر بۆ بەدەستهێنانی ئەنجامە پەسەندکراوەکان.

**4.** پۆستەرێك یان شێوەیەکی تری نمایش ئامادە بکە کە تێدا وەسفی مەودای توانراو بۆ پێوانەی یەکێك لە ڕەهەندەکان، وەك دووری یان کات یان پلەی گەرمی یان خێرایی یان بارستایی بکە، چەند نموونەیەك بهێنەرەوە کە تێیدا پلەکردن پەیرەو کرابێت بۆ پێوانە هەرە گەورەکان هەتا پێوانە هەرە بچوکەکان، کە پێویستە تێیدا ئەو نموونانە هەبێت کە خودی خۆت تاقیکردنەوەت لەسەر کردووە.

بـــــەشـــــی 2

# هێزی بەرگەگرتنی تەنە ڕەقەکان

# *Strength of Solids*



ئەو بەرزەکەرەوەیەی (کرێن) کەبەکاری دەهێنین بۆ گواستنەوەی تەنە قورسەکان پێك هاتووە لە سیم و زنجیری کانزایی بەهێز کە تەنەکان بەلاکانی خوارەوەی دا دەبەسترێتەوە، پێش گواستنەوەی هەر تەنێکی قورس بە هۆی کرێنەوە پێویستە لەوە دڵنیابین کە دەبێ سیمەکان و زنجیرەکان توانای بەرزکردنەوەی ئەو تەنە قورسانەیان هەبێ بێ ئەوەی بپچڕێن.

## ئەوەی کە پێشبینی بەدیهێنانی دەکرێت

لەم بەشەدا ئاشنا دەبیت بە دۆخەکانی ماددەو سیفاتەکانی بەتایبەتی لە دۆخی ڕەقیدا هەروەها فێری هەندێ لە تایبەتمەندیەکانی میکانیکی تەنە ڕەقەکان دەبی وەك جیرِی و بەرگەگری (بەرگری گرژی) Tensile strenght .

## گرنگییەکەی چییە

چۆن مرۆڤ پێویستی بە هەواو ئاو هەیە بۆ هەناسەدان و خواردنەوە بە هەمان شێوە تەنە ڕەقەکان گرنگیەکی گەورەیان هەیە لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ دا. لە تەنە ڕەقەکان خانو، پۆشاك، ئامێرەکانی گواستنەوە ... هتد. دروست دەکرێت هەروەها تۆش لەسەر بەشە ڕەقەکەی گۆی زەوی دەژیت.

## ناوەڕۆکی بەشی 2

# بەندی 1-2 دۆخەکانی ماددەو هێزی نێوان گەردەکانی

## *Phases of Matter and Forces Among their Molecules*

## دۆخەکانی ماددە

لە قۆناغەکانی ڕابردوودا زانیت کە ماددە سێ **دۆخی** هەیە phases کە بریتین لە ڕەقی وشلی وگازی. بەڵام هەندێ لە ماددەکان ناتوانرێت بە شێوەیەکی ڕوون پۆلێن بکرێن لە یەکێك لە دۆخەکاندا بە تایبەتی ئەوەیان کە پێك هاتووە لە گەردە هەمەجۆرەکان. بۆ نموونە «کەرە» پلەیەکی گەرمی شل بوونەوەی دیاری کراوی نییە. هەرچەندە پلەی گەرمییەکەی بەرز بێتەوە ئەوا پلەی نەرم و شلیەکەی زیاتر دەبێت، ونزیك دەبێتەوە لە دۆخی شلیەوە. لەبەر ئەوە پۆلێن کردنی «کەرە» وەك تەنێکی ڕەق یان شل ئاسان نییە.

دۆخێکی چوارەمی ماددە هەیە کە لە پلە گەرمییە بەرزەکاندا دەستەبەر دەبێت پێی دەوترێت **پلازما** plasma . ئەم دۆخە پێك هاتووە لە ناوکەکان و ئەلکترۆنە جووڵاوەکان بە خێرایەکی زۆر گەورە، کە لە پلەی گەرمی نزمدا پەیدا نابێ، وە لەبەر ئەوەی پلەی گەرمی ئەستێرەکان زۆر بەرزە، وە بارستاییەکەیان زۆربەی بارستایی گەردوون پێك دەهێنن، لەبەر ئەوە زاناکان 90% گەردووون مەزەندە دەکەن بە دۆخی پلازما. زۆر لە ماددەکان لە هەرسێ دۆخەکەدا هەیە، بۆ نموونە دەتوانین «سەهۆل» شل بکەیتەوە بۆ ئەوەی ببێ بە ئاو، هەروەها دەتوانین ئاو بکوڵێنین تا دەبێتە هەڵمی گازی وە دەتوانین ماددە بگۆڕین لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر بەپێدانی وزەی گەرمی یان میکانیکی واتە بە گۆڕانی پەستانەکەی یان پلەی گەرمییەکەی وەك چۆن بەدرێژی لە بەشی داهاتوودا دەیبینین.

مادەکان بە چاوپۆشین لەدۆخەکەی پێك هاتوون لە گەردوو گەردیلەکان زۆر لە زاناکان بە درێژایی مێژوو هاوبەشیان کردوە لە پەرەپێدانی ئەو دوو چەمکەدا. «دالتۆن» یەکەم زانابوو کەوای دانابوو کە توخمەکانی ماددە لە گەردیلەی هاوچەشن پێك هاتوون هەروەها ئەو تاقیکردنەوەی کە زانا «ئاڤوگادرۆ و گایلۆساك» ئەنجامیان دا لەسەر گازەکان سەلماندیان کە کارلێکردنە کیمیاییەکان لە نێوان پێکهاتەکانی ماددەدا ڕوودەدات. بۆ تێگەیشتن لە ڕێژەی کارلێکردنی پێکهاتەکانی ماددە، زاناکان هەستان بە پێناسەکردنی چەند برێکی نوێ بۆ دیاری کردنی بارستایی ئەو پێکهاتانەو ژمارەکانیان، لەو برانە:

- مۆڵ (mol) : بڕی ئەو ماددەیەیە کە هەمان ژمارە لەو پێکهاتانەی تێدایە کە لە 0.012 kg کاربۆن دایە. 12 ($^{12}C$) .
- یەکەی بارستە گەردیلە (atomic mass unit) : بارستایی یەك گەردیلەیە لە گەردیلەکانی کاربۆن –12 دابەش کراوە بەسەر 12 دا. وە نرخەکەشی لە سیستەمی SI نێودەوڵەتی دا $1\ u = 1.66 \times 10^{-27}\ kg$ .
- بارستە مۆڵی ($molar\ mass\ M_m$) : بریتیە لە بارستایی یەك «مۆڵ»ی هەر ماددەیەك وە بە یەکەی ($kg\ mol^{-1}$) دەپێورێت.
- قەبارەی مۆڵی ($molar\ volume\ V_m$) : بریتیە لە قەبارەی یەك «مۆڵ»ی هەر ماددەیەك وە بەیەکەی ($m^3\ mol^{-1}$) دەپێورێت.
- نەگۆری ئاڤۆگادرۆ (Avogadro constant $N_A$) : بریتیە لە ژمارەی گەردیلەکان کە لەناو یەك مۆڵ بۆ 0.012 Kg لە کاربۆن 12- وە بڕەکەی $N_A = 6.02 \times 10^{23}\ mol^{-1}$

### 1-2 ئامانجەکان

- ماددەکان پۆلێن دەکرێن بۆ تەنە ڕەقەکان وشلەکان و گازیەکان وپلازما.
- هەردوو هێزی کێش کردن و لێك دوور کەوتنەوەی نێوان گەردیلەکانی ماددە لە یەکتر جیا دەکاتەوە.

**دۆخ**

ئەو بارەیە کە تێیدا ماددە ڕەق یان شل یان گاز ویان پلازمایە.

**پلازما**

دۆخێکە لە دۆخەکانی ماددە کە لە پلە گەرمییە بەرزەکاندا دەستەبەر دەکرێت.

هەندێ لە توخمەكان لە سروشتدا لە گەردیلەی سەربەست پێكهاتوون وەك لە دۆخی گازە سستەكانی (نیۆن وهیلیۆم) دا بەڵام پێكهاتەی زۆربەی زۆری توخمەكانی تر، گەردەكانن كە هەریەكەیان لە چەند گەردیلەیەك پێكهاتووون بۆ نموونە هەر یەكە لە ئۆكسجین وهایدرۆجین لەو گەردانە پێكهاتوون كە هەر یەكەیان دوو گەردیلە دەگرێتە خۆ كە بۆندی كیمیاوی دیاریكراو پێكەوە بە ستوونیەتییەوە.



**وێنەی 2-1**

وێنەیەكی گیراو بە میكرۆسكۆبی ئەلیكترۆنی توانا بەرز بۆ ڕووی كریستاڵی سلیكۆنی گەورەكراو 5000 000 جار.

## هێزی پێكەوە بەستن لە نێوان گەردەكانی ماددەدا

پێوستە لەسەر هەر بیردۆزێك كە لە پێكهاتەی گەردیلەی ماددەیەك دەكۆڵێتەوە پاساوی ئەوە بهێنێتەوە كە ماددەكان هەندێكیان لە دۆخی ڕەقیدایە وە هەندێكیان لە دۆخی شلیدایە، وە ئەوانی تریش لە دۆخی گازیدایە. ئەو دۆخی ماددەیەی كە گەردیلەكانی لە جووڵەیەكی خێرا و بەردەوام دابن بوونی دۆخی گازی لێكدەداتەوە. بەڵام هەمان لێكدانەوە ناشێت بۆ دۆخی ڕەقی ماددە، لە **هەردوو وێنەی 2-1** و **2-2** دا گەردەكان وا دەركەوتوون كە زۆر خێرانین لەجوڵەدا، لەبەئەوەی وێنەكانیان شێواونین وەك وێنەی ئەو تەنانەی كە بەخێرایی دەجولێن، ئەم دژ یەكیە لەتێگەیشتنی هەردوو كاریگەرە پێچەوانەكان لەسەر گەرد و گەردیلەكان شیدەكاتەوە، لەلایەك جوڵەی ئەم تەنۆلكانە جوڵەوزە پەیدا دەكات و لەلایەكی تریشەوە یەكتركێشدەكەن لەبەر ئەم هۆیەیە گەردیلەكانی **هەردوو وێنەی 2-1** و **2-2** وا دەركەوتوون كە زۆر لەیەكەوە نزیكبن. و لەنێو خۆیاندا شێوەیەكی ڕێك وپێك دروست دەكەن. و لەبەرئەوەی ئەو گەردیلانە لەنێوان خۆیاندا یەكتری كێشدەكەن، بۆیە پێویستیان بەماتە وزەیەك هەیە بۆ لێك جیاكردنەوەیان بەپێچەوانەی دۆخی گازیەوە، پەستاوتنی شلەكان و تەنە ڕەقەكان بەمەبەستی كەمكردنەوەی قەبارەكەیان زۆر ئەستەم وگرانە، لەبەرئەوەی تەنۆلكەكانی هەریەكە لە شلەكان و ماددە ڕەقەكان نزیكییەكترن بۆیە هێزێكی زۆر گەورە پێویستە بۆ زیاتر لەیەكتر نزیككردنەوەیان، زۆر لەیەكتر نزیكخستنەوەی گەردیلە هاوشێوەكان ئەستەمە، بەهۆی هێزی لێك دووركەوتنەوەی نێوان ئەلیكترۆنەكانی دەوروبەری هەریەكەیان.



**وێنەی 2-2**

وێنەی گەردیلەكانی پلاتین كە 2 000 000 جار گەورە كراوە.

لەنێوان هەموو دوو گەردیلەیەكی گەردەكانی ماددەیەكدا هێزێكی كێش كردن هەیە بەهۆی پێكەوەبەستنیانەوە تەنانەت ئەگەر بارگاویش نەبن، ئەو هێزی كێشكردنە لاواز دەبێت ئەگەر دوو گەردیلەكە زۆر لە یەكتریەوە دووربن. ئەگەر دوو گەردیلەكە لەیەكتریەوە نزیك بن ئەوا یەكتر كێش دەكەن بەڵام هەركاتێك بەكردار ماوەی نێوانیان زۆر كەمبۆوە و بەیەكەوە نووسان ئەوا ئەلیكترۆنەكانی دەوری هەریەكەیان هێزێكی لێكدوور كەوتنەوە پێكدێنێ. ئەوكات دوو گەردیلە نزیكەكە یەكتركێشدەكەن و بەیەكەوە دەجووڵێن. بەڵام بەو ڕادەیەی كە ئەلیكترۆنەكانی دەوروبەریان ڕێگەی پێدەدەن لەسنورێكدا ئەوا ئەو دوو گەردیلەیە لەباری هاوسەنگیدا دەبن لەبەرئەوەی بەرەنجامی هێزی سەر هەریەكیان سفرە. و ئەگەر گەردیلەكان بیانەوێت دووركەونەوە ئەوا هێزی كێشكردنەكە ناهێڵێت ئەوە ڕووبدات، و ئەگەر بیانەوێت زیاتر لە یەكتر نزیكببنەوە ئەوا هێزی لێك دووركەوتنەوەی ئەلیكترۆنەكان ڕێگەی لێ دەگرێت وە ناهێڵێت.




**وێنەی 2-3**

وێنەی **2-3** چۆنیەتی هێزی ئاڵوگۆری نێوان دوو گەردیلە یان گەرد نیشان ئەدات كە دووریەك لە نێوانیاندا بێت.

چەماوەکە دەتوانێت بڕی هێزەکە بە دوو بەشی لەیەکتر جیاواز تێبگەیەنێت.

چەماوەیەکی کێشکردنی لاواز کە لە ئەنجامی پێکبەستنیاندا بەرهەمهاتووە و چەماوەیەکی لێکدوورکەوتنەوەی بەهێز بەڵام بۆ مەودای کورت لە ئەنجامی کێش کردنی ئەلیکترۆنەکان بەرهەمهاتووە کاتێك کە گەردیلەکان زۆر نزیك بن لە یەکترەوە (نزیکتربن لە دووری هاوسەنگی).

لەبەر ئەوە چەماوەی هێزی لێکدوورکەوتنەوە لە مەودای کورت و کێش کردن لە مەودایەکی دووردا دەردەخات. ئەوا شوێنی هاوسەنگی ئەو دوو گەردیلەیە لە خاڵی یەکتر برینی دوو بەشەکەدایە لەکاتی هاوسەنگیدا، کە تیایدا هێز سفرە. وە ئەم دووری هاوسەنگیە ناوەندە دووری نێوان گەردیلەکانی ماددە یان گەردەکانیەتی. وە بەگەڕانەوە بۆ هێزی کێشکردنی گەردیلەکان لە مەودای دووردا، کە لە ئەنجامی هێزی نێوان بارگە پۆزەتیڤەکان و نێگەتیڤەکانی گەردیلەکانەوە پێك دێت. هەرچەندە ئەگەر هەموو گەردیلەیەك بە تەنها هاوبارگەبێت وە ئەم هێزە، **بۆند Bond** لە نێوان گەردیلەکان پێك دێنی وە چەشنەکانی بریتین لە:

**بۆند Bond**

هێزێکە دەبێتە هۆی کێش کردنی گەردیلەکانی ماددەیەك بە هۆی کارتێکردنی ئاڵوگۆڕی نێوان بارگە پۆزەتیڤەکان و نێگەتیڤەکان لە سەری.

## بۆندی ئایۆنی

ئەم بۆندە لەو ماددانەی وەك کلۆریدی سۆدیۆم پێك دێت. بە جۆرێك کە هەر گەردێك پێك دێت لە گەردیلەیەکی سۆدیۆم و گەردیلەیەکی کلۆر. وە گەردیلەی سۆدیۆمی هاوبارگە تەنها یەك ئەلیکترۆنی هەیە لە خولگەی سێیەمدا، لە کاتێکدا کە هەردوو خولگەی یەکەم و دووەم پڕن لە ئەلیکترۆنەکان. بەڵام گەردیلەی کلۆر پێویستی بەیەك ئەلکترۆنە بۆ ئەوەی خولگەی سێیەمی پڕبێتەوە بە ئەلیکترۆن. لەبەرئەوەی گەردیلەکانی خولگەی پڕ ئەلیکترۆنیان پێ پەسندترە، بۆیە گەردیلەی سۆدیۆمەکە واز لە تاك ئەلیکترۆنەکەی دەهێنێ وە دەیداتە گەردیلەی کلۆرەکە بەمە گەردیلەی سۆدیۆمەکە دەبێتە ئایۆنی پۆزەتیڤ وە گەردیلەی کلۆرەکە دەبێتە ئایۆنی نێگەتیڤ. وە لە نێوانیاندا بۆندێکی بە هێز پەیدا دەبێ کەپێیدەوترێت بۆندی ئایۆنی وەك لە **وێنەی 2-4** دایە.




**وێنەی 2-4**
بۆندی ئایۆنی

## بۆندی هاوبەش

کاتێك لە توانای گەردیلەکاندا نەبێت ئەلیکترۆنێك وەربگرێت بۆ پڕکردنەوەی خولگەکەی، ئەوا ئەلیکترۆنەکان هاوبەشی یەکتر دەکەن بە پێی بۆندێك کە پێی دەوترێت بۆندی هاوبەش. بۆ نموونە لە باری گەردیلەی ئۆکسجین وەك لە وێنەی 2-5 دا، هەموو گەردیلەیەکی ئۆکسجین هەشت ئەلیکترۆنی هەیە، دووانیان لە خولگەی یەکەمدایە، وە شەشەکەی تریان لە خولگەی دووەمدایە ئەگەر هەر گەردیلەیەك هاوبەشی گەردیلەی دراوسێی بکات بە دوو ئەلیکترۆن لە ئەلیکترۆنەکانی دەرەوەی، ئەوا خولگەی دەرەوەی هەموو گەردیلەیەك پڕدەبێ لە ئەلیکترۆن ئەو بۆندەی کە لە نێوان هەر ئەلیکترۆنێکی هاوبەش و ئەلیکترۆنێکی تری گەردیلەکەی دووەمدایە پێ دەوترێت بۆندی هاوبەش.




**وێنەی 2-5**
بۆندی هاوبەش لە گەردی ئۆکسجین

## بۆندی کانزایی

لە کانزاکاندا، گەردیلەکان ئەلیکترۆنەکانی خولگەی دەرەوەیان وون دەکەن بەمە ئەلیکترۆنەکان دەگوێزرێنەوە بەسەربەستی لەناو کانزاکەدا. بەمەش گەردیلەکان دەبنە ناوکی پۆزەتیڤ، وەئەم ناوکانە لە شوێنی خۆیاندا جێگیر دەمێننەوە بە هۆی هێزی کارەبایی نێوان ناوکە پۆزەتیڤەکان و ئەلیکترۆنە نێگەتیڤەکانی دەوروبەری بۆندەکە لەم بارەدا پێیدەوترێت بۆندی کانزایی وەك لە **وێنەی 2-6** دیارە.




**وێنەی 2-6**
بۆندی کانزایی

# فـــيزيا و ژيـــان






### دوو بارستاييەكە و سپرنگێك

وا دابنێ كە دوو بارستايی گەيەنراون بە سپرنگێكی جێڕ وە لەسەر ڕووی مێزێكی ئاسۆيی دانرابوون، ئەوا هەردوو بارستاييەكە لە باری هاوسەنگيدا دەبن ئەگەر سپرينگەكە درێژييە سروشتيەكەی بێ. ئەگەر هەردوو بارستاييەكە بپەستێنيتەوە هەريەكەيان بە ئاراستەی ئەوی تريان. ئەوا هێزی لێك دوور كەوتنەوە لە سپرنگەكەدا پەيدا دەبێ كە هەوڵ ئەدات هەردوو بارستاييەكە بگەرێنێتەوە شوێنی هاوسەنگيان جارێكی تر. بەڵام ئەگەر هەوڵی لێك دووركەوتنەوەی دوو بارستاييەكەماندا، ئەوا هێزی پەيدابوو لە سپرينگەكەدا هێزی كێشكردن دەبێ هەروەها ئەمجارەيان هەوڵ ئەدات دوو بارستاييەكە بگەڕێنێتەوە بە ئاڕاستەی چەقی هاوسەنگ بوون.

چ جۆرە لێك چوونەيەك هەيە لە نێوان ئەم سيستمەدا و سيستمی نێوان دوو گەرديلەی ماددەيەكدا؟

## نموونە 2 (أ)

### دۆخەكانی مادده و هێزی نێوان گەردەكانی

#### پرسيارەكە

دووری نێوان دوو گەرديلە لە گەرديلەكانی مس هەژمێربكە. ئەگەر زانيت بارستە مۆڵی مس دەكاتە $0.064\ kg$ وە چڕيەكەی $8000\ kg/m^3$ ، وا دابنێ كە نەگۆری ئاڤۆگادرۆ دەكاتە $6.02 \times 10^{23}\ mol^{-1}$ .

#### شيكار

**1. دەزانم**

دراو: $M_m = 0.064\ kg$ $\quad \rho = 8000\ kg/m^3$

$N_A = 6.02 \times 10^{23}\ mol^{-1}$

نەزانراو: دووری نێوان دوو گەرديلەی مس « $\ell$ »

**2. پلان دادەنێم**

ياسای $V_m = \frac{M_m}{\rho}$ بەكاردەهێنم بۆ دۆزينەوەی ئەو قەبارەی كە يەك مۆڵ لە مس داگيری دەكات.

$$V_m = \frac{M_m}{\rho} = \frac{0.064\ kg}{8000\ kg/m^3} = 8.0 \times 10^{-6}\ m^3$$

**3. هەژماردەكەم**

بۆ دۆزينەوەی ئەو قەبارەيەی يەك گەرديلە لە مس داگيری دەكات ئەوا قەبارەی يەك مۆڵ دابەشی ژمارەی گەرديلە لە يەك مۆڵ دەكەين كە ئەويش نەگۆڕی ئاڤۆگادرۆيە

$$V = \frac{V_m}{N_A} = \frac{8.0 \times 10^{-6}\ m^3}{6.02 \times 10^{23}\ mol^{-1}} = 1.33 \times 10^{-29}\ m^3$$

وا دابنێ $\ell$ ناوەندە دووريە (تێكرای دووريە) لە نێوان گەردەكانی مس، ئەوا قەبارەی يەك گەرديلەيە:

$$V = \ell^3$$

$$\ell = \sqrt[3]{V} = \sqrt[3]{1.33 \times 10^{-29}\ m^3} = \boxed{2.37 \times 10^{-10}\ m}$$

## ڕاهێنانی 2 (أ)

**دۆخەکانی ماددەو هێزی نێوان گەردەکانی**

**1.** دووری هاوسەنگی لە نێوان گەردیلەکانی توخمێکی کیمیاوی و گەردیلەیەکی تەنیشتی دا دەکاتە $1.2 \times 10^{-10}$ m . ئایا هێزی نێوان ئەو دوو گەردیلەیە لێکدورکەوتنەوەیە یان کێشکردنە کاتێك دووری نێوانیان:

أ. $1 \times 10^{-10}$ m ؟

ب. $1.4 \times 10^{-10}$ m ؟

**2.** چەشنەکانی سێ بۆندەکەی نێوان گەردیلەی ماددەکان چین؟ ئایا ئەم بۆندانە بە هۆی هێزی کارەبایەوە بەرهەم دێ، یان لە ئەنجامی بارستاییەکانەوەیە؟

## پێداچوونەوەی بەندی 1-2

**1.** ئایا گواستنەوەی ماددەکان لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر بەهۆی گۆڕینەوەی بارستاییەکانەوە یان بارگەکانەوە یان وزەوە ڕوو ئەدات؟ وەڵامەکەت ڕوونبکەرەوە.

**2.** لێك دوورکەوتنەوەی گەردیلە زۆر نزیکەکان لە یەکتری ڕووئەدات بەهۆی کارلێکردنی نێوان ئەلیکترۆنەکانیانەوە، ئایا ئەم لێکدوورکەوتنەوە بە هۆی بچووکی ئەلیکترۆنەکانەوەیە یان بەهۆی بچووکی بارستایی یەکانیانەوەیە یان بارگە لێك چووەکانیانەوەیە؟ وەڵامەکەت ڕوون بکەرەوە.

**3.** لەسەر چەماوەی هێز ـ دووری نێوان گەردیلەکان، لەم سێ بارەدا بدوێ؟

أ. $r \simeq r_0$

ب. $r \rightarrow 0$

ج. $r \rightarrow \infty$

**4.** (بارستە مۆل)ێك سۆدیۆم بریتیە لە 22.98 g ، ئایا قەبارە «مۆلی» یەکەی چەندە، ئەگەر زانیت چڕیەکەی $9.71\ g/cm^3$ لە پلەی گەرمی 300 K ؟

بەندی 2-2

# تەنە ڕەقەکان وسیفەتەکانیان

## *Solids and its Properties*

### 2-2 ئامانجەکان

- وەسفی پێکهاتەی گەردی تەنە ڕەقەکان دەکات.
- سەختی تەنەکان و جیریان لێک جیادەکاتەوە.
- فشار و جیفشاری ڕێژەی کە دەکەونە سەر تەن لێک جیادەکاتەوە.
- پێناسەی هاوکۆلگەی یۆنگ دەکات.

## پێکهاتەی تەنە ڕەقەکان

تەنە ڕەقەکان پارێزگاری لە شێوە نەگۆڕەکەی خۆیان دەکەن، بۆیە پێکدێن لە سامپڵی ڕێك و نەگۆڕ لە گەردو گەردیلە لەم سامپڵەدا گەردەکان بە دەوری شوێنەکانیاندا دەلەرنەوە، بەڵام فراوانی لەرینەوەیان کەمە بەبەراوردکرن لەگەڵ دووری نێوانیان.

چۆنیەتی دابەشبوونی گەردەکانی تەنە ڕەقەکان لەسەر زۆر هۆکار بەندە، لەوانە شێوەی گەردەکان و بڕی هێزی کێشکردن لە نێوان گەردەکان و پلەی گەرمی تەنەکان زۆربەی تەنە ڕەقەکان پێکهاتەی گەردیان دەگۆڕێت بە گۆڕانی پلەی گەرمی. هەروەها ئەو فشارەی کە دەکەوێتە سەر تەنی ڕەق کار لە پێکهاتنی گەردی دەکات.

سیفەتەکانی تەنە ڕەقەکان بەندە لەسەر چۆنیەتی پێکهاتنی گەردەکانی ماددەکە، و کاریگەری ئەم پێکهاتەیەش لەسەر چڕی ماددە، باوا دابنێین کە لە باری ئاساییدا گەردەکانی ماددە پێکدێن لە گۆی ڕەقی ڕیزکراو لە شێوەی شەش پاڵوودا وەك لە **وێنەی 7-2** دا دیارە. بۆ ئاسانکردنی کردارەکانی هەژمارکردن وا دادەنێن کە هەر گەردێك قەبارەی سندووقێکی شێوە شەش پاڵو داگیر دەکات وەك **وێنەی 8-2** . لەمەوە دەتوانین کە چڕی تەنی ڕەق بە دابەشکردنی بارستایی هەر گەردێك بۆ قەبارەکەی دیاری بکەین.

ئەوەی پێویست بە باسکردن دەکات لێرەدا کە پێکهاتەی تەنە ڕەقەکان هەموو کاتێك بەم شێوە سادەیە نابێت. جۆرەها پێکهاتەی گەردی جیاواز بۆ تەنە ڕەقەکان هەیە. ئەم پێکهاتەیە سیفەتە میکانیکیەکان و کارەباییەکان و گەرمیەکان و موگناتیسیەکانی ئەو تەنە دیاریدەکات.



**وێنەی 7-2**
گەرد یان گەردیلەکان وەك چەند گۆیەك لە شێوەیەکی شەش پاڵودا ڕێکخراون.

## سیفەتە میکانیکیەکانی تەنە ڕەقەکان

### سەختیەتی Rigidity

یەکێك لە یاساکانی نیوتن لە جووڵەدا باس لەوە دەکات کە کارتێکردنی هێزی بەرەنجام لەسەر تەن دەبێتە هۆی پەیداکردنی تاودان. بەڵام کاتێك هێڵەکانی شەمەندەفەر تووشی کاریگەری کێشی شەمەندەفەری تێپەڕبوو دەبن تاودانیان بۆ پەیدانابێت، لەم بارەدا هێڵەکە لە شوێنی خۆی دەمێنێتەوە بەبێ جووڵە. بە هێڵی شەمەندەفەرەکە دەگوترێت تەنی **سەخت** rigid body .

تەنی سەخت بریتیە لەو تەنەی پارێزگاری لە شێوە نەگۆڕەکەی دەکات لەکاتی سەپاندنی هێزێك بەسەریدا، وە شێوەکەی وەك گازەکان و شلەکان تووشی گۆڕان نابێ. هەموو تەنە سەختەکان تەنی ڕەقن، بەڵام پێچەوانەی ئەوە ڕاست نیە. بۆ نموونە لەتواناماندا هەیە شێوەی بڕێك شەکر کە لەناو کیسەیەك دانرابێت بگۆڕین، لەژێر کاریگەری هێزێك دا. هەرچەندە لێرەدا شەکرەکە تەنێکی ڕەقە، بەڵام سەخت نیە. لە ئاستی مایکرۆسکۆپی دا بەکارهێنانی هێزێکی گەورە لەسەر تەنی سەخت دەبێتە هۆی نزیك بوونەوەیەکی زیاتری گەردەکان لە یەکتری. وە پەیدابوونی هێزێکی دوورکەوتنەوە لە نێوان گەردەکان دا کە ئەوەش دەبێتە هۆی پاراستنی شێوەی تەنەکە لە کۆتاییدا.



**وێنەی 8-2**
گەرد یان گەردیلەکان شەش پاڵووی بچووکن لە ڕێکخستنێکی شەش پاڵویدا.

**سەخت**
ئەو تەنەیە کە پارێزگاری لە شێوە نەگۆڕەکەی دەکات کاتێك هێزێك یا چەند هێزێك دەخرێتە سەری.

هێزی دوورکەوتنەوەی پەیدابوو لە نێوان گەردەکانی تەنی سەخت دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی هەر تاودانێکی هێڵی شەمەندەفەرەکە بەرەو خوارەوە، وە ئەو دووریەی کە هێڵەکە بەرەو خوارەوە دەیبرێت کەمە، بەڵام لە کاتێکدا شەمەندەفەرەکە بەسەر هێڵەکەدا تێپەڕ دەبێت دەتوانرێت تێبینی بکرێت. ئێمە ئەو جووڵانەوە کەمەی کە بەکاریگەری هێزێکەوە دەبێت فەرامۆش دەکەین بەتایبەتی کەکار لەگەڵ تەنە سەختەکان دەکەین. بەڵام زۆر تەن هەیە گەر هێز کاریان تێبکات دەبێتە هۆی تێکدانی شێوەکەی بە ئاشکرا. بۆ نموونە دۆشەکی خەوتن گۆڕانێکی ئاشکرا لە شێوەکەیدا ڕوودەدات کە لەسەری دەخەوین، و بەهەمان شێوە ئەو گۆڕانە بەسەر تۆپی تێنسی سەر زەویدا دێت کاتێك بەر ڕێکتەکە دەکەوێت، ئەو تەنەی کە تووشی تێکچون دەبێ لە شێوەکەی دا لە ژێر کاریگەری هێزێکی دیاریکراودا دەتوانێت بگەڕێتەوە شێوە بنەڕەتییەکەی خۆی دوای لابردنی هێزکە، ئەو تەنە تەنێکی جیرە. بۆیە جیری بەوە پێناسە دەکرێت کە بریتیە لە توانای تەنێك بۆ گەڕانەوەی بۆ شێوە بنەڕەتییەکەی خۆی پاش لابردنی هێزەکانی سەری.

با لە سێ نموونە بکۆڵینەوە کە بەسەر تەنە ڕەقەکان دا دێت کە شێوەکانیان تێك دەدات، لە کاتی بەرکەوتنی تۆپێکی تێنسی سەرزەوی بە ڕێکتی یاریزانەکە کە تێکچوونەکە ڕوون و ئاشکرایە لە شێوەکەیدا وەك لە **وێنە 2-9** دیارە. بەڵام بە خێرایی دەگەڕێتەوە شێوە بنەڕەتیەکەی لەگەڵ کۆتایی هێنان بە بەرکەوتنەکە، بۆیە تۆپەکە بە تەنێکی جیر دادەنێین. بەڵام لە کەوتنە خوارەوەی خشتەکێکی پۆڵاییندا بۆ سەر زەوی شێوانی پەیدابوو لە شێوەکەی زۆر کەمە وە زۆر بەگرانی تێبینی دەکرێت چونکە خشتەکە پۆڵایەکە تەنیکی سەختە. بەڵام کەوتنی بارستایی M بۆ سەر سپرینگێکی شاوڵی وا لە سپرینگەکە دەکات چەند جارێك سپرینگەکە بۆ سەرەوە وخوارەوە بلەرێتەوە، پێش ئەوەی بگەڕێتەوە شێوەی سروشتی خۆی لەدوای نەمانی بارستایەکە یان بۆ درێژیەکی کورتر دەگەڕێتەوە کاتێك بارستایەکە لەسەری جێگیر دەبێت. هەمان شێوە ڕوودەدات ئەگەر هاتوو کتێبێکمان لەسەر مێزێك دانا، بەڵام شێوانی مێزەکە زۆر زۆر کەمتر دەبێ لە شێوانی سپرینگەکە.




وێنەی 2-10

### جیری

توانای گەڕانەوەی تەنە بۆ شێوە بنەڕەتی یەکەی لەدوای لابردنی هێزە کاریگەرە شێوێنەرەکە.



**وێنەی 9.2**

ئەو هێزە گەورەی کە تۆپێك تووشی دەبێت لە میانەی بەرکەوتنیدا کە دەبێتە هۆی شێواندنێکی گەورەو جیر دەست بەجێ نامێنێ دوای بەریەککەوتنەکە.

**وێنەی 10-2**

لەرینەوەی سپرینگێك دوای ئەوەی بارستای M دەکەوێتە سەری.

## هێزی گرژی

یەکێك لە سیفەتەکانی تەنی ڕەق توانای ڕاکێشان و پەستاوتنەیەتی. کاتێك هەر دوولای تەلێك توشی دوو هێز دەبن کە دەبێتە هۆی گۆڕان لە درێژیەکەیدا بۆیە دەڵێن تەلەکە لە باری گرژیدایە tension ، با وا دابنێن تەلێکی ئاسۆی توشی دوو هێزی یەکسان لە برداو پێچەوانە لە ئاڕاستەدا دەبن کە برەکەی $T$ بێت لە هەرلایەك، وەك لە **وێنە 2-11** (أ) بەشە جیاکانی تەلەکە بە پیتی A و B و C و D و E دەستنیشان کراون لە **وێنەی 2-11** (ب) دا دیارە.

**وێنەی 2-11 ( أ )**




**وێنەی 2-11 ( ب )**




### گرژی Tension

ئەو هێزەیە کە لە تەنێکدا پەیدا دەبێت دوای ئەوەی هەوڵدەدرێت درێژ بکرێت یان بپەستێورێت.

**وێنەی 2-11**

دەتوانرێت مامەڵە لەگەڵ تەلێکی ڕاکێشراو بکرێت وەك چەند بەشێکی یەك لەدوای یەك:

A و B و C و D و E.

لەبەر ئەوەی هەربەشێکی تەلەکە لە باری هاوسەنگیدایە، بۆیە بەرەنجامی ئەو هێزانەی کە کاری تێدەکەن دەبێتە سفر. وە بەجێبەجێکردنی یاسای سێیەمی نیوتن لە کارو کاردانەوەدا، تێبینی ئەوە دەکەین کە ئەو هێزەی کاری پێدەکرێتە سەر C یەکسانە بەو هێزەی کە C کاری پێدەکاتە سەر B . دەتوانرێت ئەم بیرۆکەیە جێبەجێ بکرێت بەسەر درێژای تەلەکەدا، بۆیە هێزی گرژی لە تەلەکەدا یەکسان دەبێت بە T ، وە ئەوەش بڕی هەریەك لەو دووهێزە سەپێنراوەیە لەسەر هەردوولای تەلەکە. ئەگەر وامان دانا کە کێشی تەلەکە فەرامۆشکرا و بە گوێرەی هەردوو هێزی T ، ئەوسا هێزی گرژی تەلەکەش هەر T یە، هەتا ئەگەر تەلەکەش لە هەردوو باری گرژی شاوڵی و تاوداندا بێت.

## فشار Stress

فشاری سەپێنراو بۆ درێژکردنی تەلێك پێناسە دەکرێ: بەو هێزەی کە دەخرێتە سەریەکەی رووبەری برگەی تەلێك. وە فشار جاربەجار پێناسە دەکرێ بە بەرگەگری، لەبەر ئەوەی دەتوانرێ هێز بە ئاراستەی جیاجیا بسەپێنرێت. لە باری پەستاوتندا فشار دەبێتە فشارێکی پەستاوتن.

یەکەی پێوانی فشار لە سیستەمی SI بریتیە لە $N/m^2$ ، وە ئەوەش یەکەی پێوانی پەستانە واتە pascal ، لە کاتی سەپاندنی هێزی T بە ئەستوونی لەسەر تەلێکی برگە A ، فشار دەبێتە $\sigma$ (سیگما) بریتیە لە:

$$\sigma = \frac{T}{A}$$

**فشار**

هێزی سەپێنراوی سەر یەکەی رووبەری برگەی تەلێکە.




**وێنەی 2-12**

فشاری ستونی سەرتەلێکە کە رووبەری برگەکەی A بێت کە هێزێکی ڕاکێشانی ستوونی لەسەر رووبەری برگەکەی کار دەکات.

لەم بارەدا کەتیایدا هێزی سەپێنراو ستوونە لەسەر رووبەری برگەی تەلەکە، وەك لە **وێنە 2-12** دا دیارە فشارەکە فشارێکی ڕاکێشان یان پەستاوتنە بەڵام ئەگەر هێزی سەپێنراو لێکەوتبێ بۆ رووبەری برگە ئەوا فشارەکە ناو دەنرێ بە فشاری برین وەك لە **وێنە 2-13**دا دیارە.




**وێنەی 2-13**

فشاری برین لەسەر تەنێك کاتێك هێزێکی $T$ بە شێوەی لێکەوت کار لە برگەکەی دەکات.

## جێفشاری ڕێژەیی Strain

کاتێك سپرینگێکی جیر بە هێزێکی دیاریکراو ڕابکێشرێت، یان بپەستێورێت کە ببێتە هۆی گۆڕان لە درێژیەکەیدا، وە بەهۆی جیری سپرینگەکەوە دەتوانیّ بگەڕێتەوە بۆ شێوەکەی جارانی لەکاتی لابردنی هێزە ڕاکێشانەکە یان پەستاوتنەکە لەسەری. بەڵام ئەگەر هێزی ڕاکێشانەکە یان پەستاوتنەکە زۆر گەورەبێت، بە جۆرێك سپرینگەکە لە سنووری جیریەکەی لابدات ئەوا توشی شێوانێکی هەمیشەیی دەبێ، وە ناگەڕێتەوە بۆ درێژیە بنەڕەتییەکەی. ڕۆبەرت هۆك لە سەدەی هەقدەمدا سەلماندی کە گۆڕانی درێژی لەهەر سپرینگێك دا ڕاستەوانە دەگۆڕێت لەگەڵ ئەو هێزی کرژییەی خراوەتە سەر سپرینگەکە. وەك وێنەی 2-14

$$T = k\,(l - l_0)$$

کە $T$ هێزی گرژیە لە سپرینگەکە وە بە N دەپێورێت.

$(l - l_0)$ درێژبوونی سپرینگەکەیە وەبە m پێوانە دەکرێت.

$k$ نەگۆڕی سەختی سپرینگەکەیە بە N/m پێوانە دەکرێت.

بەڵام کاتێ تەلێکی کانزایی تووشی هێزێکی گرژی بوو ئەوا گۆڕان لە درێژیەکەیدا بەندە لەسەر چەند هۆکارێکی تر بێجگە لە گرژیەکە. وە لەم هۆکارانە نیوە تیرەی برگەی تەلەکە، درێژیەکەی، وە جۆری ماددەی تەنەکە. ئەتوانین هەر هۆکارێك لەو هۆکارانەی کە گۆڕانی درێژی تەلەکەیان لەسەر بەندە بکۆڵینەوە بە جێگیرکردنی هۆکارەکانی تر.




**وێنەی 2-14**

یاسای هۆك کە دەڵێت گۆڕانی درێژی ڕاستەوانە دەگۆڕێت لەگەڵ هێزی بەرگە گرتنی تەنە ڕەقەکان.

چالاکییەکی کرداری

**خێرا**

### جێفشاری ڕێژەیی

### کەرەستەکان

- ✓ بەستەرەوەی لاستیك، ٢ دانە
- ✓ ڕاستەیەکی مەتری
- ✓ بارستاییەکی دیاریکراو

### ڕێنماییەکانی سەلامەتی

لایەکی بەستەورەکە جێگیر بکەو لاکەی تری بە دەست بگرە تاوەکو شێوەیەکی ڕاست وەردەگرێت. درێژییەکەی بپێوە. بارستاییەکە بەلای دووەم هەڵواسەو بە ئەسپایی دەستی لێبەردە. پاش گۆڕان لە درێژی، دوا درێژی بەستەرەوە لاستیکەکە بپێوە . هەوڵەکەت بۆ دوو بەستەرەوەی لاستیکی تەریبی نزیك بەیەکتر دووبارە بکەرەوە، چۆن بەراووردی جێفشاری ڕێژەیی لە نێوان بەستەرەوەی لاستیکی یەکەم و دوو بەستەرەوەی لاستیکی دووەمی تەریب بە یەکتری دەکەیت.

وادابنێ دوو تەل لە هەمان مادده دروست کراون وە هەمان ڕووبەری پانە برگەیان هەیە بەڵام لە درێژیدا جیاوازن. دوو سەنگی (کێش) یەکسان هەڵدەواسین وەك لە **وێنەی 2-15** دیارە. کام لەم دووتەلە گۆڕان لە درێژییەکەیدا زیاتر دەبێت؟ بە بەراوردکردنی ئەم بارە لەگەڵ باری ئەو سپرینگە لێکچوانەی کە لە **وێنەی 2-16** دا دیارە. دەگەینە وەڵام ئەو کۆمەڵە سپرینگە لێکچووە هەڵواسراوانەی کە ژمارەیان زیاترە گۆڕان لە درێژیان زیاتر دەبێت. هەڵواسینی هەمان سەنگ بەهەر لایەکی کۆمەڵەکە دەبێتە هۆی ڕوودانی هەمان گۆڕان لە درێژی هەر سپرینگێکدا. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە گۆڕان لە درێژی ئەو کۆمەڵەی کە لە سێ سپرینگ پێکهاتووە یەکجار و نیو زیاترە لەو کۆمەڵەی کە لە دوو سپرینگ پێك هاتووە.




**وێنەی 2-15**
دووتەل لەژێر کاریگەری هەمان کێش.

بۆیە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە ئەو تەلەی درێژییەکەی زیاترەو دەکەوێتە ژێر کاریگەری هەمان هێزی ڕاکێشان گۆڕان لە درێژییەکەیدا زیاتر دەبێت، بەڵام گۆڕان لە درێژی بۆ یەکەی درێژی تەلەکە بە نەگۆڕی دەمێنێتەوە. جێفشاری ڕێژەی تەلێك پێناسە دەکرێت بەبڕی گۆڕان لە درێژیدا بۆ درێژی یەکەم جاری.

$$\epsilon = \frac{l - l_0}{l_0}$$

کە $l - l_0$ بڕی گۆڕان لە درێژی تەلەکەیە، وە $l_0$ درێژی یەکەم جاریەتی. تێبینی بکە کە $\epsilon$ (ئەپسلۆن) یەکەی پێوانەی نیە چونکە بریتیە لە ڕێژەی نێوان دوو درێژی. با ئیستا لەسەر بەندبوونی گۆڕان لە درێژی بە تیرەی برگەوە بکۆڵینەوە. با وا دابنێین کە دوو تەل لە هەمان مادده کە هەمان درێژیان هەیە وە جیاوازن لە پانە برگەدا بکەونە ژێر هەمان کاریگەری هێزی ڕاکێشانی پەیدابوو بە هۆی دوو سەنگی یەکسان، وەك لە **وێنەی 2-17** دیارە. کام لەم دووتەلە تووشی گۆڕان لە درێژی زیاتر دەبێت؟




**وێنەی 2-16**
سپرینگە دوایەك بەستراوەکان لەژێر هەمان کاریگەری کێشدا.

هەروەها بەراوردی نێوان دوو سیستمی سپرینگی دەکەین کە هەمان سەنگیان پێداهەڵواسراوە، وەك لەوێنەی **2-18** دیارە. ئاشکرایە کە گۆڕان لە درێژی سیستمی سێ سپرینگەکە کەمترە لە گۆڕان لە درێژی سیستمی دوو سپرینگەکە. لەهەر سیستمێکدا، هێزی ڕاکێشان لەهەر سپرینگێکدا یەکسانە بەکێشی هەڵواسراو دابەشی ژمارەی سپرینگەکان. بۆیە هێزی ڕاکێشان لەهەر سپرینگێك لە سیستمی سێ سپرینگیدا دەکاتە $\frac{mg}{3}$ بەڵام هێزی ڕاکێشان بۆ هەر سپرینگێك لە سیستمی دووسپرینگی دەکاتە $\frac{mg}{2}$ لەبەرئەوەی پەیوەندی نێوان هێزی ڕاکێشان و گۆڕان لە درێژی لەهەر سپرنگێك پەیوەندیەکی ڕاستەوانەیە، بۆیە گۆڕان لە درێژی لە سیستمی سێ سپرنگیدا $\frac{2}{3}$ ی گۆڕانە لە درێژی لە سیستمی دوو سپرنگیەکەدا.




**وێنەی 2-17**
گۆڕان لە درێژی تەلێك بەندە لەسەر ڕووبەری پانە برگەکەی.

بۆیە گۆڕان لە درێژی تەلە ئەستوورەکەدا کەمترە لە گۆڕان لە درێژی تەلە باریکەکەدا، لەژێر کاریگەری هەمان کێشی هەڵواسراو، چونکە کێشەکە لەسەر ڕووبەرێکی گەورەتر دابەش دەبێت لە تەلە ئەستوورەکەدا.



**وێنەی 2-18**
سپرینگی هاورێك بەستراو لەژێر کاریگەری هەمان کێشدا.

**جێفشاری ڕێژەیی**

بریتیە لە ڕێژەی نێوان گۆڕان لە درێژی تەلێکی دیاریکراو بۆ درێژییە بنەڕەتییەکەی.

## هاوکۆلکەی یۆنگ (هاوکۆلکەی جیری)

کاتێك فشار دەخرێتەسەر ماددەیەکی دیاری کراو، ئەوا تووشی شێواندن دەبێت کە گونجاوە لەگەڵ ئەو فشارەی کە دەخرێتە سەری بە مەرجێك فشارەکە لە سنووری پەیوەندی ڕاستەوانەی «جیری» دا بێت. هاوکۆڵکەی یۆنگ Young's modulus (E) پێناسە دەکرێت بە ڕێژەی نێوان فشاری سەپێنراو لەسەر ماددەیەکی دیاری کراو بۆ جێفشاری پەیدابوو تێیدا.

$$E = \frac{\sigma}{\epsilon} = \frac{T/A}{\frac{(l - l_0)}{l_0}} = \frac{Tl_0}{A(l - l_0)}$$

**هاوکۆلکەی یۆنگ**

بریتیە لە ڕێژەی نێوان فشار بۆ جیفشار لە ماددەیەکی دیاری کراودا.

یەکەی پێوانەی هاوکۆڵکەی یۆنگ لە سیستمی SI $(N/m^2)$ ، ئەوەش بریتیە لە یەکەی پێوانەی فشار، چونکە یەکەی جێفشاری ڕێژەیی لە نێوان دوو درێژیدایە بۆیە یەکەی پێوانەی نیە.

## نموونە 2 (ب)

### تەنە ڕەقەکان و سیفەتەکانیان

**پرسیارەکە**

تەلێکی پۆلایی تیرەکەی **0.40 mm** ، درێژیە سەرەتایەکەی **2.0 m** بە خاڵێکی جێگیرەوە بە شێوەیەکی شاولی هەڵواسرا. وە بەلاکەی تریدا کێشی **80 N** هەڵواسرا. لە ئەنجامدا گۆڕان لە درێژیەکەیدا بوو بە **6.4 mm** ، ئایا هاوکۆڵکەی یۆنگی ئەو ماددەیەی کە تەلەکەی لێدروستکراوە چەندە؟

**شیکار**

**1.** دەزانم

دراو: $T = 80\ \text{N}$ $l_0 = 2.0\ \text{m}$ $d = 0.40\ \text{mm} = 4 \times 10^{-4}\ \text{m}$

$l - l_0 = 6.4\ \text{mm} = 6.4 \times 10^{-3}\ \text{m}$

نەزانراو: هاوکۆڵکەی یۆنگی ماددەکە «E»؟

**2.** پلان دادەنێم

بۆ هەژمارکردنی هاوکۆڵکەی یۆنگ ئەم پێناسەیە بەکاردەهێنم.

$$E = \frac{\sigma}{\epsilon} = \frac{Tl_0}{A(l - l_0)} = \frac{Tl_0}{\pi r^2\ (l - l_0)}$$

**3.** هەژماردەکەم

نرخەکان لە هاوکێشەدا دادەنێم و ئەوەی دەمەوێ دەستم دەکەوێ.

$$E = \frac{80 \times 2.0}{\pi \left[ \frac{4.0 \times 10^{-4}}{2} \right]^2 \times 6.4 \times 10^{-3}} = \boxed{2.0 \times 10^{11}\ P_a}$$

## ڕاهێنانی 2 (ب)

### تەنە ڕەقەکان وسیفەتەکانیان

**1.** تەلێکی کانزایی تیرەکەی 1.0 mm وە درێژیەکەی 2.3 m ، لە مس دروستکراوە کە هاوکۆڵکەی یۆنگەکەی $1.1 \times 10^{11}\ P_a$ بێت.

أ. ڕووبەری پانە بڕگەی تەلەکە چەندە؟

ب. جێفشار لە تەلەکەدا چەندە ئەگەر گۆڕان لە درێژیەکەدا 0.85 mm بێت.

**2.** لە پرسیاری 1 دا، بڕی فشار و هێزی کاریکەری پێویست بۆ جێبەجێ کردنی ئەم فشارە چەندە؟

## پێداچوونەوەی بەندی 2-2

**1.** بڕی ئەو جێفشارە چەندە کە لولەیەك (بۆڕی) بەرەنگاری دەبێت کە درێژیەکەی 0.4 m بێت. کاتێك دەپەستێورێت و بەبڕی 0.05 m کورت دەبێتەوە؟

**2.** تەلێکی کانزایی بەرەنگاری فشاری $2 \times 10^7\ \text{N/m}^2$ دەبێت. بڕی ئەو هێزە چەندە کە کاردەکاتە سەر تەلەکە ئەگەر ڕووبەری پانە بڕگەکەی $1.5\ \text{mm}^2$ بێت؟

**3.** تەلێکی برۆنزی درێژیەکەی 2.5 m وە ڕووبەری پانە بڕگەکەی $6.5 \times 10^{-7}\ \text{m}^2$ یە. ئایا گۆڕان لە درێژی تەلەکە چەندە، ئەگەر بە هێزی $10^3$ N ڕابکێشرێت؟ هاوکۆڵکەی یۆنگی برۆنز دەکاتە $2.0 \times 10^{11}\ \text{N/m}^2$ .

### ڕۆشناییەك لەسەر بابەتەكە

# ڕەوشتی جیڕی و ڕەوشتی پلاستیكی مادەكان

لەپێشەوە خوێندمان كە ئەو فشارەی ماددەیەكی دیاركراو بەرەنگاری دەبێت ئەوەندە بچووكە بەجۆرێك جێفشاری ڕێژەیی ماددەكە ڕاستەوانەیە لەگەڵ فشاری سەرماددەكە. بەڵام ئەم پەیوەندیە ڕاستەوانەیە لە نێوان ئەم دوو بڕەدا نامێنێت كاتێك فشارەكە زیاد دەكات و دەكەوێتە دەرەوەی سنورێكی دیاریكراو. **وێنەی 19-2** پەیوەندی نێوان فشاری ڕاكێشانی تەلێكی مس بە جێفشارەكەیەوە ڕوون دەكاتەوە. ئەو نرخانەی كە دەكەونە سەر دوو تەوەرەكە نرخی سامپلێك بۆ جۆرێك لە جۆرەكانی مس دەنوێنن، چونكە لە جۆرێكەوە بۆ جۆرێكی تر جیاوازن. ئەم نرخانە بەندن لەسەر پێكهاتەی بلوری مسەكەو، پلەی گەرمیەكەی و ئەو كاریگەرەی كە لە پێشتردا تووشی بووە. بە كۆتایی بەشی هێڵە ڕاستەكەی هێڵكاری ڕوونكردنەوەكە دەڵێن **ئاستی گونجاندن**، وە بە خاڵی A دەنوێنرێت. لە خاڵی تەنیشت ئاستی گونجاندندا ماددەكە **ڕەوشتی جیڕی** ون دەكات، وە **ڕەوشتی پلاستیكی** دەست پێدەكات. بەو خاڵە دەوترێت **ئاستی جیڕی** و بە خاڵی B دەنوێنرێت.  لە باری ڕەوشتی جیڕی دا مادەكە دەگەڕێتەوە شێوە بنەڕەتیەكەی پاش لابردنی هێزی شێواندن كە (لە نێوان دووخاڵی 0 و A دایە لە وێنەی 19-2 دا). بەڵام لەباری ڕەوشتی پلاستیكیدا هێزە سەپێنراوەكە دەبێتە هۆی شێواندنێكی هەمیشەی و ماددەكە ناگەڕێتەوە شێوە سەرەتاییەكەی جارانی. زۆربەی ماددەكان بە شێوەی جیڕی مامەڵە دەكەن وە توشی شێواندنی كاتی دەبن لە فشارە بچووكەكاندا، بەڵام لە فشارە بەرزەكاندا شێواندنەكەی هەمیشەیی و ڕەوشتەكەی پلاستیكی دەبێت. ئەوەی گرنگە لای ئەندازیارە شارستانیەكان كە ئەو قورسایانەی دەكەونە سەر پردەكان تەنها ببێتە هۆی شێواندنێكی كاتی و بتوانن بگەڕێنەوە بۆ شێوە سەرەتاییەكانیان دوای نەمانی قورسایەكان لەسەریان

كاتێك ماددە دەگاتە ئاستی پلاستیكی، هەر فشارێكی بچووك دەتوانێت جێفشاری ڕێژەیی گەورە پەیدابكات. وە ماددە لەم بارەدا پێیدەڵێن **ماددە بۆكشان شیاوەكان** (توانای ڕاكێشان وپیاكێشانی هەیە). لەباری ڕەوشتی پلاستیكیدا پێوانی جێفشار بۆ فشارێكی دیاری كراو زۆر گرانە.

بەشی كۆتایی **وێنەی 19-2** بەتەواوەتی سنوردار نەكراوە بۆیە بەهێڵی پچر پچر دەردەبردرێت. C كە خاڵی كۆتاییە ئەوە دەگەیەنێت كە ئەو بەشە خاڵی فشاری پێویستە بۆ پچرانی تەلەكە. بۆیە **فشاری بڕین** دادەنرێت بە گەورەترین فشار كە دەتوانرێت بخرێتە سەر تەلەكە پێش پچرانی.

**خشتەی 1-2** و **2-2** هاوكۆلكەی یۆنگ و فشاری برینی هەندێ ماددە دەستنیشان دەكەن.




**وێنەی 19-2**
گۆڕانی فشاری ڕاكێشان لە تەلێكی مسدا بەپێی كاریگەری جێفشار.

**خشتەی 1-2 هاوكۆڵكەی یۆنگی هەندێ ماددە**

| ماددە | هاوكۆڵكەی یۆنگ $(1 \times 10^{11}\ Pa)$ |
|---|---|
| ئەلەمنیۆم | 0.70 |
| مس | 1.1 |
| ئاسن | 1.9 |
| پۆڵا | 2.1 |
| شووشە | 0.55 |
| تەنگستن | 4.1 |

**خشتەی 2-2 فشاری بڕین بۆ هەندێ ماددە**

| ماددە | فشاری بڕین $(1 \times 10^{8}\ Pa)$ |
|---|---|
| ئەلەمنیۆم | 2.2 |
| مس | 4.9 |
| ئاسن | 3.0 |
| پۆڵا | 11.0 |
| شووشە | 10 |
| تەنگستن | 20 |

# پوختەی بەشی 2

## بیرۆکە بنەڕەتییەکان

### بەندی 2-1 دۆخەکانی ماددەو هێزی نێوان گەردەکانی

- ماددە سێ دۆخی هەیە بریتین لە: ڕەقی و شلی و گازی سەرەڕای دۆخی پلازما لە پلە گەرمیە بەرزەکاندا.
- لە دووریە زۆرەکاندا هێزی کێشکردنی کارەبایی لەنێوان گەردو گەردیلەکانی ماددەدا هەیە، بەلاّم لە دووریە زۆر کەمەکان دا هێزی لەیەکتر دوورکەوتنەوە هەیە.
- هێزی کێشکردنی نێوان گەردەکان دەبێتە هۆی دروستکردنی بۆندەکان، لەوانە بۆندی ئایۆنی وبۆندی هاوبەش و بۆندی کانزایی.

### بەندی 2-2 تەنە ڕەقەکان وسیفەتەکانیان

- گەردەکانی ماددە ڕەقەکان بە شێوەیەکی ڕێك ڕیزکراون و بەدەوری خاڵی سرەوتنە دیاری کراوەکانیان دا دەلەرنەوە.
- فشار بریتیە لە هێزی سەپێنراو لەسەر یەکەی ڕووبەری برگەی تەلێکی دیاری کراو.
- جێفشاری ڕێژەیی بریتیە لە ڕێژەی نێوان گۆڕان لە درێژی تەلێکی دیاری کراو بۆ درێژیی بنەڕەتیەکەی تەلەکە.
- هاوکۆلکەی یۆنگ بریتییە لە ڕێژەی فشاری سەپێنراو لەسەر ماددەیەکی دیاری کراو بۆ جێفشاری پەیدابوو تێیدا.

**هێمای گۆڕاوەکان**

| بڕ | هێما | یەکە | گۆڕین |
|---|---|---|---|
| فشار | $\sigma$ | $P_a$ باسکال | $1 P_a = N/m^2 = kg/m \cdot s^2$ |
| جێفشاری ڕێژەی | $\epsilon$ | بێ یەکەیە | |
| هاوکولکەی یۆنگ | $E$ | $P_a$ باسکال | $1 P_a = N/m^2 = kg/m \cdot s^2$ |

## زاراوە بنەڕەتییەکان

| | | |
|---|---|---|
| دۆخ | Phase | (لا 34) |
| پلازما | Plasma | (لا 34) |
| بۆند | Bond | (لا 36) |
| سەخت | Rigid | (لا 39) |
| جیرِی | Elastisity | (لا 40) |
| گرژی | Tension | (لا 40) |
| فشار | Stress | (لا 41) |
| جێفشاری ڕێژەیی | Strain | (لا 42) |
| هاوکۆلکەی یۆنگ | Strain Young's modulus | (لا 42) |

# پێداچوونەوەی بەشی 2

## پێدابچۆرەوە و هەڵیسەنگێنە



## دۆخەکانی مادده وهێزی نێوان گەدەکانیان

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**1.** هەرسێ دۆخەکەی مادە رێکبخە بەپێی چڕییەکانیان، وە جیاوازی چڕی نێوانیان لێکبدەرەوە.

**2.** لە کام لە دۆخەکانی ماددا گەردەکان بەشێوەیەکی زۆر رێك دابەشبوون بەسەر شوێنەکانیان دا؟

**3.** ئەگەر بڕێکی گەرمی زۆر بدرێتە شلەیەکی دیاریکراو، ئایا دۆخەکەی دەگۆڕێت بۆ ڕەقی یان بۆ گازی؟ چی ڕوو دەدات ئەگەر هەمان بڕە گەرمی لێوەربگرینەوە؟

**4.** بۆچی بەشی هەرەزۆری گەردوون لە دۆخی پلازمادایە؟

**5.** کام بڕی فیزیاویت دەست دەکەوێت بە دابەش کردنی بارستایی مۆڵی مادده ($M_m$) بەسەر قەبارەی مۆڵی ماددەکەدا ($V_m$)؟

**6.** ئایا بۆی هەیە مادەیەك لەشێوەی تێکەڵەی دوو دۆخی جیاواز لەهەرسێ دۆخەکەی مادە هەبێت؟ نموونەی بۆ بهێنەرەوە.

### پرسیار دەربارەی چەمکەکان

**7.** بۆچی پەستاوتن لە دۆخی گازیدا ئاسانە، بەڵام لە دۆخەکانی ڕەقی وشلیدا گرانە؟

**8.** بۆچی بۆندەکانی نێوان گەردەکانی هیلیۆم ونیۆن لاوازن؟

**9.** پێناسەی بۆندی ئایۆنی بکەو نموونەی لەسەر بهێنەرەوە.

**10.** پێناسەی بۆندی هاوبەش بکەو نموونەی لەسەر بهێنەرەوە.

**11.** کام جۆر لەهەر سێ جۆری بۆندەکان، گەردیلەکانی مادەی قورقوشم بەیەکەوە دەبەستێتەوە؟

**12.** سلیکۆن بە توخمێکی بنەڕەتی نیمچە گەیەنەرەکان دادەنرێت گەردیلە ژمارەکەی 14 یە، ژمارەی ئەلیکترۆنەکانی خوڵگەی دەرەوەی گەردیلەی سلیکۆن چەندە؟ جۆری بۆندی نێوان گەردیلەکان چییە؟

**13.** بۆچی بۆندی ئایۆنی بە هێزترە لە بۆندی هاوبەش؟

### پرسیارەکانی ڕاهێنان

**14.** بارستایی مۆڵی سۆدیۆم دەکاتە 23 g و قەبارە مۆڵیەکەی $23.78 \times 10^{-6}\ m^3/mole$ .

أ. چڕی سۆدیۆم بخەملێنە.

ب. بارستایی نزیك کراوەی یەك گەرد لە گەردەکانی سۆدیۆم هەژماربکە.

**15.** چڕی سلیکۆن بخەملێنە ئەگەر بارستە مۆڵیەکەی 28.0855 g و قەبارە مۆڵیەکەی $1.206 \times 10^{-5}\ m^3$ بێت.

**16.** هێڵکاری چەماوەی نزیکراوەیی هێزی نێوان گەردەکان بکێشە، بەپێی دووری نێوانیان.

أ. مانای چییە گەر بەشێك لە هێزەکە پۆزەتیڤ بێت وبەشەکەی تری نێگەتیڤ بێت.

ب. خاڵی یەکتربڕینی هێزەکە لەگەڵ تەوەرەی دووری دا چی دەنوێنێت.

## تەنە ڕەقەکان و سیفەتەکانیان

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**17.** جیاوازی بکە لەنێوان تەنی ڕەقی سەخت و تەنی ڕەقی ناسەخت.

**18.** جیاوازی بکە لەنێوان تەنی جیر و تەنی ناجیر،

**19.** ئایا ئەو هێزەی کار دەکاتە سەر تەنێك هەموو کات دەبێتە هۆی گۆڕان لە درێژییەکەیدا؟ بۆچی؟

**20.** جیاوازی بکە لەنێوان ئەو فشارەی کاردەکاتە سەر ماددەیەکی دیاریکراو وئەو جێفشارەی کە پەیدا دەبێت تیایدا.

**21.** وا دابنێ سیستمێك پێکهاتووە لە دوو تەختە داری بەستراوە بە سپرینگێکی جیرەوە، ئایا ئەم سیستمە بە ڕەق؟ یان سەخت؟ دادەنرێت، ئەمە ڕوونبکەرەوە.

**22.** جیاوازی بکە لەنێوان فشاری ڕاکێشان و فشاری بڕین، ئەمە بە وێنە ڕوونبکەرەوە.

**23.** هاوکۆلکەی یۆنگی مادده پێناسە بکە وە یەکەی پێوانەکەی بلێ لە سیستمی SI دا.

## پرسیار دەربارەی چەمکەکان

**24.** وا دابنێ سیستمێکی پێك هاتوو لە دوو بارستایی کە بەیەك گەیەنراون بەهۆی تووڵێکی سوکی درێژی نەگۆڕەوە ئایا ئەم سیستمە تەنێکی سەخت دەنوێنێ؟ بۆچی؟ نموونەیەکی لەسەر بهێنەوە.

**25.** چی ڕوودەدات گەر گۆیەك بە دیوارێکەوە بپەستێوڕێت ودوایی وازی لێبهێنرێ؟ چی ڕوو دەدات گەر هەمان کار ئەنجام بدەین لەگەڵ پارچە هەویرێك؟ جیاوازی چییە لە نێوان گۆیەکەو پارچە هەویرەکە؟

**26.** دوو تەلی چوونیەك لە جۆری مادە و درێژیدا وە جیاوازن لە ئەستووریدا، دوو بارستایی یەکسانیان پێوە هەڵواسرا. ئایا گۆڕان لە درێژی کامیاندا زیاترە؟ بۆچی؟

**27.** ئایا تەنی ڕەقی جیڕ تەنێکی سەختە؟ بۆچی؟

**28.** ئایا لادان و خواربوونەوەی چەماوەی فشار و جێفشار دەست نیشانی چی دەکات لە پەیوەندییە ڕاستەوانەکەی نێوانیان؟ لەم پەیوەندیەدا دۆخی مادەکە چی پێدەڵێن؟

## پرسیارەکانی ڕاهێنان

**29.** سەنگێك کێشەکەی 200 N هەڵواسرا بەسەری تەلێکی مس کە درێژیەکەی 1 m بوو. ئایا گۆڕان لە درێژی تەلەکەدا چەندە ئەگەر هاوکۆلکەی یۆنگی ماددەکەی $1.1 \times 10^{7}$ N/m$^2$ بێت و نیوەتیرەی تەلەکە 1 mm بێت؟

**30.** گۆڕان لە درێژی تەلەکەدا لە پرسیاری پێشوودا بدۆزەوە ئەگەر نیوەتیرەی تەلەکە 2 mm بێت.

**31.** چوار تولّی کانزای شێوە لوولەك ڕاکێشران بەجۆرێك هەریەکەیان بەرەنگاری درێژبوونەوەیەکی دیارکراو بووەوە، ئەگەر بڕی هێزیڕاکێشان و ڕووبەری پانەبڕگەی هەر تولێك و درێژبوونەوەکەی، درێژیە بنەڕەتیەکە وەك لەو خشتەیەی خوارەوە دراوە. تولەکان ڕیزبەند بکە بەپێی هاوکۆلکەی یۆنگ بۆ هەریەکەیان لەهاوکۆلکە گەورەکەیانەوە

| ژمارەی تولەکانزاکان | بڕی هێز | ڕووبەری پانەبڕگە | درێژبوونەوە دیاردە لەدرێژی | درێژی بنەڕەت |
|---|---|---|---|---|
| 1 | F | A | ΔL | L |
| 2 | 2F | 2A | 2ΔL | L |
| 3 | F | 2A | 2ΔL | 2L |
| 4 | 2F | A | ΔL | 2L |




## پێداچوونەوەی گشتی

**32.** وا دابنێ ماددەیەکی ڕەق لە دوو دووریدایە، کە لەچەند پەیکەیەکی بازنەیی دروست کراوە نیوە تیرەی هەر یەکەیان r وەك لە وێنەکەدا دیارە. ئەم بازنانە بە شێوەیەك بەریەککەوتوون کە چەقەکانیان چوارگۆشە دروست دەکەن، وە درێژی هەرلایەکی چوارگۆشەکە دەکاتە تیرەی هەر بازنەیەك وە یەکسانە بە 2r .

أ. ڕووبەری هەر پەیکەیەك و ڕووبەری هەر چوار گۆشەیەك چەندە؟

ب. ئەو ڕووبەرەی کە هەر پەیکەیەك داگیری دەکات لەناو چوارگۆشەکان چەندە بە ڕێژەی سەدی.

**33.** تۆڕی بەللوری هەندێ لە تەنە ڕەقەکان لە گەردیلەی گۆیی بەیەکەوە نووساو لەشێوەی شەش پاڵوی سادە پێکهاتوون، وەك لە وێنەکە دیارە، نیوەتیرەی هەر گەردیلەیەك r ە:




أ. قەبارەی هەریەك لە گەردیلە گۆییەکان هەژمێربکە.

ب. درێژی لای شەش پاڵوکەی کە گۆشەکانی جووت دەبێ لەگەڵ چەقی گەردیلە گۆییەکان هەژمێربکە؟ قەبارەکەی چەندە؟

ج. ئەو ڕێژە سەدیە هەژمێربکە کە گەردیلەکان پڕی دەکەونەوە لە قەبارەی شەش پاڵوکە لە لقی (ب)دا.

د. ئەگەر بارستایی هەر گەردیلەیەك m بێت، چڕی مادەکە چەندە؟

**34.** لە تاقی کردنەوەی پشکنینی هێزی بەرگەگرتنی دەزوویەکی نایلۆن کە بە شاوڵی جێگیر کراوە وەبەلای خوارەوەیدا چەند سەنگێك هەڵواسرا. وە لە چەند خاڵێك تیرەی دەزووەکە پێورا ئەم نرخانەمان دەست کەوت: 0.79 mm ،0.81 mm ،0.80 mm ،0.81 mm . هەڵساین بە زیادکردنی سەنگی 1 N بۆ هەر جارێك، کە کێشی سەنگەکان گەیشتە 25 N ئەوا دەزووەکە پچڕا، فشاری بڕینی دەزووەکە چەندە؟ لەسەر وردی ئەو نرخانەی دەست کەوت بدوێ.

**35.** سپرنگێکی جیر بە خاڵێکی جێگیرەوە بە شێوەیەکی شاوڵی هەڵواسرا. لە کاتی هەڵواسینی کێشی 5.0 N بەسەرەکەی تری سپرینگەکەوە درێژییەکەی 450 mm زیاد دەکات.ئایا:

أ. نەگۆڕی سپرینگ $k$ چەندە؟

ب. ئەو کێشە زیادکراوە کە دەبێتە هۆی گۆڕان لە درێژی سپرینگەکە بە بڕی 500 mm چەندە؟

ج. ئەو کێشە چەندە کە لە بری 5.0 N بەکاربێت تاوەکو گۆڕان لە درێژی سپرینگەکە ببێتە تەنها 50 mm .

**36.** نەگۆڕی هەریەکە لەدوو سپرینگی چۆنیەك دەکاتە $k = 400$ N/m ئایا گۆڕان لە درێژی هەریەك لە سپرینگەکان کە هەڵواسراون چەندە وەك لە دوو وێنەکەدا دیارن. ئەگەر بزانی درێژی بنەڕەتی هەر یەکە لە دوو سپرینگەکە 300 mm




**37.** تولێکی لوولەیی فافۆن لایەکی ئاسۆییانە بەدیوارێکی شاوڵی جێگیرکرا، تەنێك بارستایەکەی 1200 g بوو بەلاکەی تری لوولەکە هەڵواسرا. ئەگەر تیرەی بڕگەی لوولەکە 4.8 cm و درێژیەکەی 5.3 cm و هاوکۆلکەی بڕینی فافۆن $3.0 \times 10^{10}$ N/m$^2$ بێت، بارستایی لوولەکە فەرامۆش بکە بۆ هەژمارکردنی:

أ. فشاری بڕین لەسەر تووڵەکە.

ب. لادانی شاوڵی لەلا سەربەستەکەی تووڵەکە.

**38.** تەلێکی کانزایی تیرەکەی 0.41 mm سەنگێك کە کێشەکەی 5.0 N بوو بەلایەکی تەلەکەوە هەڵواسرا وە لاکەی تری تەلەکە بە ڕاگرێك جێگیرکراوە. وە درێژییەکەی لەم بارەدا بوو بە 1.692 m کاتێك کێشی سەنگە هەڵواسراوەکە زیاد دەکرێت بۆ 75.0 N گۆڕانێك لە درێژی تەلەکەدا ڕوویدا بڕەکەی 4.3 mm بوو. ئایا هاوکۆلکەی یۆنگی تەلەکە چەندە؟

**39.** تەلێکی مس تیرەکەی 0.30 mm بێت وە درێژیەکەی 1.50 m بێت بەسەری تەلێکی پۆڵاوە بەسترا کە هەمان تیرەی هەیە و درێژییەکەی 1.20 m بێت. ئەم دوو تەلە بە شێوەیەکی ستوونی هەڵواسران بە جۆرێك سەری تەلە مسەکە بە خاڵێکی جێگیرەوە بەسترا وە بەسەری تەلە پۆڵاکەوە سەنگێکی بچووك هەڵواسرا، ئەم کردارەی بەیەك بەستنی دوو تەلەکە بووە هۆی کورت بوونەوەی درێژی هەر یەکەیان بە بڕی 20 mm . پاشان سەنگێك کێشەکەی 30 N بوو بە تەلە پۆلاکەوە هەڵواسرا ئایا:

أ. فشار لەهەر تەلێکدا چەندە؟

ب. جێفشاری ڕێژەیی هەر تەلێك چەندە ئەگەر بزانیت هاوکۆلکەی یۆنگی مس $1.3 \times 10^{11}$ N/m$^2$ بێت وە هاوکۆلکەی یۆنگی پۆڵا $2.0 \times 10^{11}$ N/m$^2$ .

ج. گۆڕان لە درێژی گشتی دوو تەلەکەدا چەندە؟

## پرۆژە و ڕاپۆرتەکان

**1.** لێکۆڵینەوەیەك ئەنجام بدە دەربارەی پێکهاتەی بەللوری تەنە ڕەقەکان. هەوڵ بدە سێ یان چوار جۆر لە شێوەکانی ڕیزبوونی پێکهاتەی گەردی ماددەکان بناسێنی. وا دابنێ کە گەردەکان گۆی چوونیەکن وە بەریەکدەکەون بە ڕێگەی جیا جیا.

**2.** لە جیاوازی نێوان چەماوەی فشار و جێفشاری بەرگەگرتن (بەزیادکردنی بەرەبەرەی کێش) وەچەماوەی بەتاڵکردنەوە (لابردنی بەرە بەرەی کێش) بۆ سێ جۆری ماددە بکۆڵەوە، یەکێکیان زۆر جیڕ بێت وەك شووشە، وە دووەمیان جیرەکەی کەم بێت وەك لاستیك وە ئەوی تریان توانای ڕاکێشانی هەبێت وەك مس.

# بـــــەشـــــی 3

# میکانیکی شلگازەکان
# *Fluid Mechanics*



بەلەمەوان دەزانێ کە ئەگەر هاتوو کێشەکەی ($F_g$) گەورەتربێت لەچاو پاڵهێزی ئاوەکەدا ($F_B$) «کە هێزێکە یارمەتی دەدات بۆ سەر ئاو کەوتن» ئەوا بێگومان نقوم دەبێت. کەواتە هەموو تەنێکی نوقم بوو لە ئاودا وەك ئەم بەلەمە بە پاڵهێزێك کاری تێدەکرێت بۆ سەرەوە کە یەکسانە بە کێشی ئەو ئاوەی کە تەنەکە شوێنی دەگرێتەوە. (واتە کە تەنەکە لای دەدات یان کێشی ئاوی لادراو) هەر ئەم هێزە پاڵنەرەش یارمەتی بەلەمەکە دەدات بۆ دووبارە سەرکەوتنەوەی بۆسەر ڕووی ئاوەکە، دوای ئەوەی کە لە بەرزی تاڤگەیەکەوە دەکەوێتە ناو ئاوەکە.

## ئەوەی کە پێشبینی بەدیهێنانی دەکرێت

لەم بەشەدا فێری هێزی پاڵنەر یا (پاڵهێزی شلگازو پەستانی شلگازەکان و هاوکێشە بنچینەکانی ڕێکخستنی ڕەوشتی شلگازەکان دەبیت، وە هەروەها ئەم بەشە بابەتی شلگازە جووڵاوەکان و هاوکێشەی یەکبینە ڕۆیشتن ڕووندەکاتەوە.

## گرنگییەکەی چییە

زۆر لە دەزگا هایدرۆلیکیەکان (کە بە شلە کاردەکەن)، وەك وەستێنەری ئۆتۆمبیل «برێك» و بەرزکەرەوەکانی تەنە قورسەکان، ڕەوشتەکانی شلگاز لە کارکردنیاندا بەکاردەهێنرێت، لە دروستکردنی ئەو دەزگایانەی سەرەوەدا تێگەیشتنی ڕەوشتی شلگازەکان کارێکی پێویستە.

## ناوەڕۆکی بەشی 3

بەندی 1-3

# شلگازەکان و هێزی پاڵنەر
*Fluids and Buoyant Force*

## پێناسەی شلگاز

ماده پۆلین دەکرێ بۆ سێ دۆخ: ڕەقی و شلی و گازی وە ئەم کتێبە تاوەکو ئیستا باسی لە جووڵەو هۆکارەکانی جووڵە نەکردووە، تەنها لە ڕێی تەنە ڕەقەکانەوە نەبێت، بەڵام لەم بەشەدا میکانیکی شلەو گازەکان باسی لێوە دەکات.

**وێنەی 1-3** (أ) وێنەی شلەیە، وە **وێنەی 1-3** (ب)، نموونەی گازە. بۆ تاوێك سەیرکە و بیرکەوە، ئایا دەتوانی سیفەتە هاوبەشەکانی نێوانیان دیاری بکەیت؟ سیفەتە هاوبەشەکانی نێوانیان لەوەدا دەردەکەوێت کە توانای ڕۆیشتن و گۆڕینی شێوەیان هەیە لە کردارێکی بەچاوبینراودا، ئەو ماددانەی کە ئەم سیفەتانەیان هەیە پێیان دەڵێن **شلگاز** fluids. تەنە ڕەقەکان بە شلگاز دانانرێن چونکە توانای ڕۆیشتنیان نیەو و شێوەکەیان نەگۆڕە.

### شلەکان قەبارەیان جێگیرە، بەڵام گازەکان قەبارەیان گۆڕاوە

گازو شلە لە شلگازەکانن، هەرچەندە شلەکان بەوە جیادەکرێنەوە کە قەبارەیان جێگیرە، بەڵام گازەکان قەبارەیان دەگۆڕێ. وە شلەو تەنە ڕەقەکان بەوە دەناسرێن کە قەبارەیان جێگیرە، بەڵام شلەکان لە تەنەڕەقەکان بەوە جیادەکرێنەوە کە شێوەیان دەگۆڕێت. وا دابنێ تۆ تانکی ئامێرێکی فریزبڕین پڕ لە بەنزین دەکەیت، لەبەرئەوەی بەنزین شلەیە وە شێوەی تەنکیەکە وەردەگرێت. ئەگەر دەبەکە 20 L بەنزینی تێدابوویێت ئەوا تەنکی فرێزبڕەکە 20 L ی تێدادەبێت. بەڵام گازەکان شێوە و قەبارەیان جێگیر نییە. کاتێك گازێك لە دەفرێکەوە دەخرێتە دەفرێکی تر بە تەنها شێوەکەی ناگۆڕێت، بۆ ئەوەی شێوەی دەفرەکە وەربگرێت بەڵکو بڵاویش دەبێتەوە تاوەکو هەموو دەفرەکە پڕدەکات.



(ب)



(أ)

**1-3 ئامانجەکان**

- شلگاز پێناسە دەکرێت.
- جیاکردنەوەی شلە لە گاز.
- دیاریکردنی بڕی کاریگەری هێزی پاڵنەری شلگاز لەسەر تەنی سەرکەوتەو تەنی نقووم بوو.
- ڕوون کردنەوەی سەرکەوتنی هەندێك تەن و نقومبوونی هەندێکی تر.

**شلگاز**

ئەو ماددەیەیە کە لە دۆخی ڕەقیدا نەبێت (واتە گازبێت یان شلە) کە گەرد و گەردیلەکانی بەسەربەستی دەجووڵێن و لەسەریەکتری دەخلیسکێن.

**وێنەی 1-3**
(أ) شلەکان و (ب) گازەکان هەردووکیان شلگازن لەبەر ئەوەی فیچقە دەکەن وشێوەی خۆیان دەگۆڕن.

# چڕی وهێزی پاڵنەری شلگاز

هەست بەچی دەکەیت، کاتێك لەناو سەرخەرێکی (قەرەباڵغ)ی پڕ لە خەڵکدا وەستاویت؟ ئەو هەستەت لەوانەیە ئەوە دەربخات کەوا چۆن ژمارەیەکی زۆر خەڵك جێگەیەکی بچووکیان لە بۆشایی دا داگیرکردووە. بە واتایەکی تر، چڕی خەڵکەکە لەسەرخەرەکەدا زۆرە. بە شێوەیەکی گشتی چڕی بەوە دادەنرێت کەوا پێوەری بڕی ماددەیە لە ناوچەیەکی دیاریکراوی بۆشاییدا.

## بارستە چڕی ماددە

لەکاتی بەکارهێنانی ووشەی «چڕی» بۆ وەسف کردنی شلگازێکی دیاری کراودا مەبەست لە بارستە چڕی شلگازەکەیە mass density. وە بارستە چڕی بەوە پێناسە دەکرێ کە بارستایی یەکەی قەبارەی ماددەیە وەهێماکەی بەپیتی یۆنانی $\rho$ (ڕۆ) دەخوێندرێتەوە.

**بارستە چڕی ماددە** $\rho$

بارستایی یەکەی قەبارەیە لەماددەدا.

**بارستە چڕی ماددە**

$$\rho = \frac{m}{V}$$

$$\text{بارستە چڕی ماددە} = \frac{\text{بارستایی}}{\text{قەبارە}}$$

یەکەی چڕی لە سیستمی نێودەوڵەتیدا SI بریتیە لە بڕی ژمارەی کیلۆگرامەکان لە مەترە سێ جایەك دا $(kg/m^3)$ . لەم کتێبەدا زاراوەی چڕی بەکاردێت لەجیاتی بارستە چڕی لە **خشتەی 1-3** لیستی چڕیەکانی هەندێ شلگازو هەندێك تەنی ڕەقی گرنگ پیشان دەدرێت. بە شێوەیەکی گشتی تەنە ڕەق وشلەکان توانای پەستاوتنیان کەمە. واتە ئەو گۆڕانەی کە لە چڕیاندا ڕوو دەدات لە ئەنجامی گۆڕانی پەستانیاندا زۆر کەمە. بۆیە چڕی تەنە ڕەقەکان و شلەکان کە لە **خشتەی 1-3** دا هاتووە بەنزیکی لەسەر گۆڕانی پەستانەکەیان بەند نابێت. بەڵام گازەکان دەپەستێورێن و چڕییەکەیان بەسەر مەودایەکی فراوانتردا دابەش دەبێت. بۆیە گازەکان چڕییەکی پێوانەییان نابێت. بە پێچەوانەی شلە و تەنە ڕەقەکانەوە. ئەو چڕیانەی لە خشتەکەدا هاتوون بەپێی پلەیەکی گەرمی وپەستانێکی دیاری کراو نووسراون، بۆیە هەر گۆڕانێك کە لە پلەی گەرمی و پەستاندا ڕوودەدات گۆڕانێکی بەرچاو لە چڕی دا دروست دەکات.

**خشتەی 1-3**

**چڕی هەندێ ماددەی ناسراو**

| ماددەکان | $\rho(kg/m^3)$ |
|---|---|
| هایدرۆجین | 0.0899 |
| هیلیۆم | 0.179 |
| هەڵم (100ºC) | 0.598 |
| هەوا | 1.29 |
| ئۆکسجین | 1.43 |
| دوانە ئۆکسیدی کاربۆن | 1.98 |
| ئیثانۆڵ | $0.806 \times 10^3$ |
| سەهۆڵ | $0.917 \times 10^3$ |
| ئاوی خواردنەوە (4ºC) | $1.00 \times 10^3$ |
| ئاوی دەریا (15ºC) | $1.025 \times 10^3$ |
| ئاسن | $7.86 \times 10^3$ |
| جیوە | $13.6 \times 10^3$ |
| زێڕ | $19.3 \times 10^3$ |

## هێزی پاڵنەری شلگاز لەسەر تەنەکان Buoyant Force ($F_B$)

ئایا تووشی سەر سووڕمان نابیت کاتێك هەست دەکەیت تەنەکان لە ئاودا سووکترن وەك لە هەوادا؟ هۆیەکەی ئەوەیە کە شلگازەکان هێزێك بەرەو سەرەوە دەخەنە سەر ئەو تەنەی کە بەشێکی یان بە تەواوی نقوم دەبێت لەناویدا پێ‌ی دەگوترێت **هێزی پاڵنەری شلگاز** buoyant force . تۆ هەست بەو هێزە دەکەیت کاتێك لەسەر چوپێکی پڕ لە هەوای سەرئاو کەوتوو پاڵکەوتویت وە هەر ئەم هێزەیە سەر ئاوت دەخات. ولەبەر ئەوەی هێزی پاڵنەر بە ئاڕاستەی پێچەوانەی هێزی کێشکردن کار لە تەنەکان دەکات، بۆیە بەرەنجامی هێزی کاریگەر لەسەر تەنە نوقم بووەکەی ناو شلگازەکە بۆنموونە (ئاو)، کەمتر دەبێت لە کێشەکەی. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە کێشی تەنە نقوم بووەکە لە ئاودا وا دەربکەوێت کە کەمتر بێت وە لەکێشەکەیان لەهەوادا. کەواتە کێشی تەنی نقوم بوو لە شلگازێکدا پێ‌ی دەڵێن **کێشی ڕووکەشی** تەن. بۆ نموونە کێشی ڕووکەشی بەردێکی قورس لە ئاودا کەمترە لە کێشەکەی لە هەوادا، لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە تەن نقوم ببێت ئەگەر هێزی پاڵنەر بەشی ئەوە نەکات کە تەنەکە بەسەرکەوتویی بهێڵێتەوە.

**«هێزی پاڵنەری شلگاز» پاڵهێزی شلگاز**

ئەو هێزەیە کە شلگازێك ڕووەو سەرەوە کاری پێ‌ دەکاتە سەر تەنێکی نقوم بوو یان سەرکەوتە.




**وێنەی 2-3**
(أ) بەرد لە دەفرێکی پڕ لە ئاودا نقوم دەبێت.
(ب) بەردەکە جێگەی ئاوی لادراو دەگرێتەوە کە دەرژێتە دەفرە بچووکەکەوە.
(ج) بەردەکە بە تەواوەتی نقوم دەبێت.
(د) قەبارەی ئاوی لادراو (کە بەردەکە شوێنی گرتۆتەوە یەکسانە بە قەبارەی بەردەکە.

## دەستوری ئەرخەمیدس

وادابنێ تۆ بەردێکت لە دەفرێکی پڕ لە ئاودا نقوم کرد وەك لە وێنەی **2-3** دیارە لەلا تەنیشتی دەفرەکەوە لە ئاستی ئاوەکەدا لوولەیەك هەیە ڕێگە بە ئاوە زیادەکە دەدات برژێتە ناو دەفرە بچووکەکەوە، کاتێك بەردەکە نقوم دەبێت ئاستی ئاوەکە بەرزدەبێتەوە لە ڕێگەی لوولەکەوە ئاوەکە دەرژێتە ناودەفرە بچووکەکەوە بڕی قەبارەی ئاوی لادراو لە دەفرەکەوە یەکسانە بە قەبارەی بەشی نقوم بووی بەردەکە.

دەتوانرێت بڕی هێزی پاڵنەری کاریگەر لەسەر بەردەکە لەهەر کاتێکدا بدۆزینەوە بەهۆی دەستوری ئەرخەمیدسەوە، کە دەڵێت: (هەر تەنێك هەمووی یان بەشێکی لە شلگازێکدا نقوم بکرێت دەکەوێتە ژێر کاریگەری هێزێکی پاڵنەر بۆ سەرەوە کە یەکسانە بە کێشی شلگازی لادراو کە تەنەکە شوێنی گرتۆتەوە). بۆ ڕوون کردنەوەی دەستوری ئەرخەمیدس نموونە زۆرە یەك لەم نموونانە بەرزکردنەوەی کەسێك لەناو حەوزی مەلەکردندا ئاسانترە وەك لە بەرزکردنەوەی هەمان کەس لە دەرەوەی ئاوەکەدا.

وە دەستوری ئەرخەمیدس بەم شێوەی خوارەوە دەنووسرێت:

**بڕی هێزی پاڵنەر= کێشی شلگازی لادراو= بارستایی شلگازی لادراو× تاودانی زەوی**

$$F_B = F_{g\,\text{ئاوی لادراو}} = m_{\text{شلگاز}}g$$

$m$ بارستایی شلگازی لادراو، $F_g$ کێش شلگازی لادراو

**پاڵهێزی شلگاز=کێشی شلگازی لادراو=بارستایی شلگازە لادراوەکە × تاودانی زەوی**

**سەرکەوتن یان نقوم بوونی تەن بەندە لەسەر بەرەنجامی هێزە کاریگەرەکانی لە سەری واتە کێشی ڕووکەشی تەن، وە بەم شێوەیەی خوارەوە دەدۆزرێتەوە:**

$$\vec{F}_{\text{کێش ڕووکەش}} = \vec{F}_{\text{بەرەنجام}} = \vec{F}_B + \vec{F}_g$$

$$F_{\text{بەرەنجام}} = F_B - F_g \ (\text{تەن})$$

**دەستووری ئەرخەمیدس جێبەجێ دەکەین بە بەکارهێنانی $m_o$ کە بارستایی تەنی نقوم بوو دەنوێنێت.**

$$F_{\text{بەرەنجام}} = m_{\text{شلگاز}}g - m_o g$$

**$m = \rho V$ لەجیاتی دادەنێین لە هاوکێشەی سەرەوەدا:**

$$F_{\text{بەرەنجام}} = (\rho_{\text{شلگاز}} V_{\text{شلگاز}} - \rho_o V_o)g$$

**مەبەست لە بڕەکانی شلگازەکان لە هاوکێشەی سەرەوە شلگازی لادراوە.**

### ئایا دەزانیت؟

ئەرخەمێدس ماتماتیك زانی یۆنانیە لەشاری سیراکوزا لە سەقلیە لە دایك بووە. مەلیکی سیراکوزا لە زێڕی تاجەکەی کەوتە گومان، فەرمانی دا کە ئەرخەمێدس لەوە بکۆڵێتەوە. دەڵێن ئەرخەمێدس لە گەرماودا نهێنی جۆری زێڕی تاجەکەی بۆ دەرکەوت بە هۆی دەستوورەکەیەوە بۆیە بە ڕووتی هاتە دەرەوەو هاواری دەکرد «دۆزیمەوە» واتە بیرۆکەکەم دۆزیەوە نەك سابونەکە.




**وێنەی 3-3**
پاپۆڕێکی بارهەڵگر سەر ئاو کەوتووە چونکە کێشی پاپۆڕو هێزی پاڵنەر لە بڕدا یەکسانن وە لە ئاڕاستەدا پێچەوانەن.

## بۆ تەنە سەرکەوتەکان (هێزی پاڵنەر = کێشی تەنەکە)

وا بێنە بەرچاوت کە پاپۆڕێکی بارهەڵگر سەر ئاو کەوتووە لەدەریاچەیەکدا دوو هێز کار لە پاپۆڕەکە دەکەن: هێزی کێشکردن بەرەو خوارەوە، وە هێزی پاڵنەری ئاوەکە بەرەو سەرەوە. لەبەر ئەوەی پاپۆڕەکە سەر ئاو کەوتووە لە باری هاوسەنگیدایە، واتە هەردوو هێزەکە لە بڕدا یەکسانن.

**هێزی پاڵنەر لەسەر تەنە سەرکەوتەکان**

**هێزی پاڵنەر = کێشی تەنی سەرکەوتە**

$$F_B = F_g\,(\text{تەنەکە}) = m_o g$$

تێبینی بکە کە پێویست ناکات دەستوری ئەرخەمیدس بەکاربهێنن بۆ دۆزینەوەی ئەو هێزەی کە کاردەکاتە سەر تەنە سەرکەوتوەکە، کاتێك کێشی تەنەکە زانراوبێت.

## چڕی تەن قوڵی نقوم بووی دیاری دەکات

بەرەنجامی هێزی کاریگەر لەسەر تەنە سەرکەوتەکە دەکاتە سفر. بە لەجیاتی دانان لە دەستوری ئەرخەمیدس دەردەچێ.

$$F_{\text{بەرەنجام}} = (\rho_{\text{شلگاز}}\,V_{\text{شلگاز}} - \rho_o V_o)g = 0$$

هاوکێشەکە ڕێکدەخەینەوە $\qquad \dfrac{\rho_{\text{شلگاز}}}{\rho_o} = \dfrac{V_o}{V_{\text{شلگاز}}}$

ئاسایە ئەگەر بلێین قەبارەی شلگازی لادراو گەورەتر نیە لە قەبارەی تەنەکە. بەهەمان شێوە بۆ ئەوەی تەن سەرکەوێت نابێت چڕیەکەی لە چڕی شلگازەکە گەورەتربێت بۆیە ئەنجامی دابەشکردنی قەبارەی گشتی $V_o$ بۆ قەبارەی نقوم بوو ($V_{\text{شلگاز}}$) یەکسانە بە بەرەنجامی دابەشکردنی دوو چڕیەکە، وەکاتێ هەردوو چڕیەکە (چڕی تەن وچڕی شلگاز) یەکسان بن ئەوا تەنەکە بە تەواوەتی نقوم دەبێت بەبێ ئەوەی بەر بنکەکەی بکەوێت.

## گۆڕانی هێزی پاڵنەر بەگۆڕانی تێکڕای چڕی

ڕادەی سەرکەوتنی تەنەکان دەگۆڕێت بە گۆڕانی تێکڕای چڕیەکەی بۆ نموونە، ماسی دەتوانێت تێکڕای چڕیەکەی بگۆڕێت بە هۆی پڕکردن وخاڵی کردنەوەی ئەندامێکی لەشییەوە کە پێی دەڵێن (تورەکەی هەوا). ماسی تورەکەی هەوا پڕدەکات لە گازێك لە ڕێگەی هەڵمژینی هەوای سەر ڕووی ئاوەکە یان بە دەرکردنی گاز لە ڕژێنێکی تایبەتەوە بەهەمان شێوەش ژێر دەریای خۆی سەر ئاو و ژێر ئاو دەخات بە هۆی قورس کردن وسوك کردنی عەمباری ئاوەکەیەوە. ژێر دەریای هەوای پەستێنراو دەنێرێت بۆ عەمبارەکەی و پاڵ بە ئاوەکەی ناویەوە دەنێت بۆ دەرەوە و سەر ئاو دەکەوێ، وە لەکاتی نقوم بوونەوەدا هەواکە دەگۆڕێتەوە بە ئاو. وە تێکڕای چڕی ژێر دەریاییەکە زیاد دەکات و نوقمی دەکات.

## کێشی ڕووکەشی تەنی نقوم بوو لەسەر چڕی بەندە

وادابنێ ئەو پاپۆڕەی لە **وێنەی 3-3** دا دیارە لە ناکاو کون بوو، ئەمە دەبێتە هۆی

**ئایا دەزانیت؟**

مێشکی مرۆڤ بە تەواوەتی نقوم بووە لە شلگازێکدا کەچڕی یەکەی 1007 kg/m³ . ئەمەش تۆزێك کەمترە لە تێکڕایی چڕی مێشك کە (1040 kg/m³) ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەشی زۆری مێشك لەلایەن شلگازەکەوە کە تیایدا نقوم بووە پاڵی پێوە بنرێت و هاوبەشی پاراستنی دەماغ بکات لەکاتی جووڵەی لەناکاوی سەرو بەرکەوتنەکاندا.

نقوم بوونی خۆی وبارەکەی تا ژێر ڕووی ئاوەکە دەکەوێت (وەك لە **وێنەی 4-3** دا دیارە).لێرەدا بەرەنجامی هێزەکان لەسەر پاپۆرو بارەکەی یەکسانە بە کۆی ئاراستەیی هێزی پاڵنەر وکێشی پاپۆرو بارەکەی. کاتێك قەبارەی پاپۆرو بارەکەی کەم دەبێتەوە لە هەمان کاتدا قەبارەی ئەو ئاوەی شوێنی دەگرێتەوە کەم دەبێتەوە، وە بڕی هێزی پاڵنەر کەم دەبێت. دەتوانین بەم هاوکێشەیە هێزی بەرەنجام ڕوون بکەینەوە.

$$F_{\text{بەرەنجام}} = (\rho_{\text{شلگاز}} V - \rho_o V_o)g$$

لەبەر ئەوەی پاپۆرەکەو بارەکەی بەتەواوەتی نقوم بوون لە ئاوەکەدا بۆیە قەبارەی پاپۆر و بارەکەی یەکسانە بە قەبارەی ئەو ئاوەی کە شوێنی گرتۆتەوە:

$$F_{\text{بەرەنجام}} = (\rho_{\text{شلگاز}} - \rho_o)Vg$$

ئەوەی تێبینی دەکرێت بڕ و ئاراستەی هێزی بەرەنجام بەندن لەسەر جیاوازی نێوان چڕی تەن و چڕی شلگازەکە. ئەگەر چڕی تەنەکە زیاتربێت لە چڕی شلگازەکە ئەوا هێزی بەرەنجام سالب دەبێت (بۆخوارەوە) تەنەکە نقوم دەبێت. بە پێچەوانە ئەگەر چڕی تەن کەمتربێت لە چڕی شلگاز ئەوا هێزی بەرەنجام موجەب دەبێت (بەرەو سەرەوە) تەنەکە سەر ئاو دەکەوێت. وە لە کاتی یەکسان بوونی هەردوو چڕیەکەدا ئەوا تەنەکە بە هەڵواسراوی لە ژێر ڕووی ئاوەکەدا دەمێنێتەوە.




**وێنەی 4-3**
پاپۆر وبارەکەی نقوم دەبێت چونکە چڕییان لە چڕی ئاو زیاترە.

دەتوانین لە پەیوەندی نێوان کێشی تەنی نقوم بوو وە هێزی پاڵنەری کارکردوو ئەم هاوکێشەیە دابڕێژین.

$$\frac{F_g\,(\text{تەن})}{F_B} = \frac{\rho_o V g}{\rho_{\text{شلگاز}} V g}$$

$$\frac{F_g\,(\text{تەن})}{F_B} = \frac{\rho_o}{\rho_{\text{شلگاز}}}$$

**ئەم هاوکێشەیە بەکاردێت بۆ شیکارکردنی ئەو پرسیارانەی کە پەیوەستن بە هێزی پاڵنەری سەرتەنەکان.**

## فـیزیا و ژیـــان



**1. سەرکەوتنێکی سروشتی** زۆر جار کەشتیەوانەکانی بۆشایی ئاسمان لە ژێر ئاودا ڕاهێنان دەکەن بۆ ڕاهاتن لەسەر مەلەکردن لە بۆشاییدا. باسی بکە و هۆیەکەی بڵێ.

**2. کێشکردنێکی زیاتر؛** یەکێك لە ڕاهێنەرەکان دەڵێت ئەگەر هێزی کێشکردنی زەوی ببێتە دوو هێندە ئەوا خەڵك توانای مەلە کردنیان نامێنێت. ئایا تۆش هەمان بۆچونت هەیە یان نا؟ ڕوونی بکەوە.

**3. باڵۆن** بۆچی باڵۆنەوانەکا[ن] گازی هیلیۆم بەکاردەهێن[ن] لە جیاتی هەوا باسی بکە؟



## نموونەی 3 (أ)

### هێزی پاڵنەر

**پرسیار**

**بازرگانێك تاجێكی زێرینی كڕی وەك لە وێنەی 5-3 دا دیارە، بۆ دڵنیابوون لە جۆری زێرەكە، تاجەكەی هەڵواسی بە قەپانێكی سپرینگ دارەوە بینی كێشەكەی 7.84 N، ئینجا تاجەكەی نوقمی ئاوكرد بینی كێشەكەی دەبێتە 6.86 N . ئایا تاجەكە لە زێری پوخت دروست كراوە؟ باسی بكە.**



وێنەی 5-3

**شیكار**

**1. دەزانم**

دراو: $F_g = 7.84$ N      كێشی رووكەش = 6.86 N

$\rho_{\text{شلگاز}} = \rho_{\text{ئاو}} = 1.00 \times 10^3$ kg/m$^3$

نەزانراو: $\rho_o = ?$

وێنە:




**2. پلان دادەنێم**

هاوكێشەیەك هەڵدەبژێرم: لەبەر ئەوەی تاجەكە بە تەواوی نقوم بووە لە ئاودا. رێژەی نێوان كێش بۆ هێزی پاڵنەر بەكاردەهێنم.

$$\vec{F}_{\text{كێشی رووكەش}} = \vec{F}_{\text{بەرەنجام}} = \vec{F}_B + \vec{F}_g$$

$$-6.86\text{ N} = F_B - 7.84\text{ N}$$

$$\frac{F_g}{F_B} = \frac{\rho_o}{\rho_{\text{شلگاز}}}$$

بیرۆكەی بەسوود: لە هێڵكارییە ڕوونكراوەكەدا دەردەكەوێت $F_{T,1}$ كێشی ڕاستەقینەی تاجەكەیە، وە $F_{T,2}$ كێشی رووكەشی تاجەكەیە كاتێك لە ئاودا نقوم دەكرێت.

هاوكێشەكە ڕێكدەخەینەوە بۆ دۆزینەوەی داواكراو:

$$\rho_o = \frac{F_g}{F_B}\rho_{\text{شلگاز}}$$

**3. هەژماردەكەم**

بە لە جیاتی دانانی نرخەكان لە هاوكێشەكەدا:

$$F_B = 7.84\text{ N} - 6.86\text{ N} = 0.98\text{ N}$$

$$\rho_o = \frac{F_g}{F_B}\rho_{\text{شلگاز}} = \frac{7.84\text{ N}}{0.98\text{ N}}(1.00 \times 10^3\text{ kg/m}^3)$$

$$\boxed{\rho_o = 8.00 \times 10^3\text{ kg/m}^3}$$

**4. هەڵدەسەنگێنم**

بەراورد دەكەین لە نێوان چڕی زێڕی پێوراو و ئەو چڕییەی لە **خشتەی ژمارە 1-3** دا دراوە: لەبەرئەوەی $8.0 \times 10^3\text{ kg/m}^3 < 19.3 \times 10^3\text{ kg/m}^3$ بۆمان دەردەكەوێ زێڕی تاجەكە پوخت نیە.

## ڕاهێنانی 3 (أ)

### هێزی پاڵنەر (پاڵهێز)

**1.** پارچە کانزایەك کێشەکەی لەهەوا ( 50.0 N )ە، وە لە ئاودا ( 36.0 N )ە، وە لەناو شلەیەکی تردا ( 41.0 N ) ئایا:

أ .چڕی پارچە کانزاکە چەندە؟

ب .چڕی شلە نەزانراوەکە چەندە؟

**2.** دۆشەکێکی هەوا (چوپی سەر ئاو کەوتن) لەشێوەی لاکێشە تەریبدایە بارستاییەکەی 2.8 kg ، درێژیەکەی 2.00 m ، پانیەکەی 0.500 m ، ئەستووریەکەی 0.100 m ، ئایا ئەو بارستاییە چەندە کە پێویستە بخرێتە سەری پێش ئەوەی دۆشەکەکە دەست بکات بە نقوم بوون؟

**3.** کەڵەکێك یا (بەلەمێك) درێژیەکەی 6.0 m ، و پانیەکەی 4.0 m ، کاتێك بار هەڵگرێکی لێ بارکرا 4.00 cm لە کەڵەکەکە نقوم دەبێت. ئایا کێشی بار هەڵگرەکە چەندە؟

**4.** باڵۆنێك بە بەتاڵی بارستایەکەی 0.0120 kg ، پڕکرا بە گازی هیلیۆم لە $0^oC$ دا وە لەژێر پەستانی 1 atm پەستانی هەوا لەباری ئاساییدا. چڕی هیلیۆم $0.179\ kg/m^3$ ، وە نیوە تیرەی باڵۆنە پڕکراوەکە 0.500 m .

أ . ئایا هێزی پاڵنەری کاریگەر لەسەر باڵۆنەکە چەندە؟ (بگەڕێوە بۆ **خشتەی 3-1** بۆ زانینی چڕی هەوا). ؟

ب . هێزی بەرەنجامی کاریگەر لەسەر باڵۆنەکە چەندە؟

## پێداچوونەوەی بەندی 3-1

**1.** جیاوازی چیە لە نێوان ڕەق وشلگاز؟ جیاوازی چیە لە نێوان گازو شلە؟

**2.** کام لەمانە سەر جیوە دەکەوێت؟

أ . خشڵێکی زێڕ.

ب . پارچەیەك سەهۆڵ.

ج . بزماری ئاسن.

د . 5 mL ئاو.

**3.** باڵۆنێکی پێوانی کەش وەهوا بارستاییەکەی 650 kg ، وەبە بارستایی 4600 kg لەگەل وپەل بارکراوە. ئایا قەبارەکەی دەبێتە چەند دوای پڕکردنی بە هیلیۆم لە پلەی گەرمی $0^oC$ و 1 atm دا . بۆ ئەوەی بتوانێ بارەکە بەرزکاتەوە؟ (تێبینی: بگەڕێوە بۆ **خشتەی** چڕی **3-1** ).

**4.** ژێر دەریاییەك جێگەی خۆی ڕاست دەکاتەوە تاوەکو لە وەستانەوە بەرز بێتەوە بە تاودانی $0.325\ m/s^2$ . ئایا تێکڕای چڕیەکەی چەندە لە و ساتەدا؟

(تێبینی: $\rho_{\text{ئاوی سوێر}} = 1.025 \times 10^3\ kg/m^3$ ).

**5.** **فیزیا و ژیان**: هەندێك بەلەم لە ماددەیەکی پلاستیکی و هەندێك ماددەی تری تێکەڵ دروست دەکرێ کە چڕی یەکەیان لە چڕی ئاو زیاترە. چۆن ئەم بەلەمانە دەتوانن سەر ئاو بکەون.

بەندی 2-3

# پەستانی شلگازو پلەی گەرمیەکەی
## *Fluid Pressure and Temperature*

### 2-3 ئامانجەکان

- ئەو پەستانە هەژمار دەکات کە شلگازەکە بەرپێی دەکات.
- چۆن گۆڕانی پەستانی شلگاز لە قوڵایی دا هەژمار دەکرێت.
- وەسفی شلگازەکان دەکرێت بەپێ ی گەرمی.

**پەستان**

بڕی ئەو هێزەیە کە بە ستوونی کاردەکاتە سەریەکەی ڕووبەر.



**وێنەی 6-3**
ژێر ئاو گەڕەکان دەتوانن بەرگەی پەستانی شلگاز بگرن لە قوڵایی 610 m بە هۆی ئەو پۆشاکانەوە. «جل وبەرگانەوە» کە لە بەری دەکەن.

## پەستان

دەریاوانە دۆزەرەوەکان کە دەچنە قوڵایی دەریاوە پۆشاکی «جل وبەرگی» پارێزگاری لە پەستانی هەوا لەبەر دەکەن، وە **وێنەی 6-3** ئەم دیاردەیەمان بۆ ڕون دەکاتەوە کە چۆن ئەم پۆشاکە بەرگری لە هێزی ئاو دەکات وە تۆش هەست بە هێزێکی هاوشێوە دەکەیت کە پەستان دەخاتە سەر گوێچکەکانت کاتێ دەچیتە قوڵایی حەوزێکی مەلەکردن یان کاتێك بەسەر چیایەکدا سەر دەکەویت یان کاتێك بە فرۆکە گەشتێك دەکەیت.

### پەستان هێزی سەر یەکەی ڕووبەرە

شلگازەکان لەو نموونانەی سەرەوەدا پەستان دەخەنە سەر پەردەی گوێچکەکانت. پەستان پێوانی بڕی ئەو هێزەیە کە بەستوونی دەخرێتە سەر ڕووبەرێکی دیاری کراو. وە پەستان بەم شێوەیە دەردەبڕێت:

$$\text{پەستان} = \frac{\text{هێز}}{\text{ڕووبەر}}$$

$$P = \frac{F}{A}$$

یەکەی پێوانی پەستان لە سیستەمی نێودەوڵەتی SI یەکەکاندا بریتیە لە باسکال (Pa) وە یەکسانە بە $N/m^2$ . وە باسکال بە یەکەیەکی بچووکی پێوانی پەستان دادەنرێت وە پەستانی هەوا لەسەر ئاستی ڕووی دەریا یەکسانە بە ( $10^5$ Pa ). وە ئەم بڕە لە باری ئاساییدا بە بنچینەی یەکەیەکی تر دادەنرێ کەپێی دەڵێن (atm) وە 1 atm یەکسانە بە $10^5$ Pa . پەستانی هەوای پەتی ناو تایەی ئۆتۆمبیل دەکاتە نزیکەی $3 \times 10^5$ Pa یان 3 atm ، **خشتەی 2-3** هەندێ نموونەی تر لەسەر پەستان ڕوون دەکاتەوە.

**خشتەی 2-3** چەند نموونەیەکی تری پەستان

| شوێن | پەستان (Pa) |
|---|---|
| چەقی خۆر | $2 \times 10^{16}$ |
| چەقی زەوی | $4 \times 10^{11}$ |
| قوڵایی زەریای پاسفیك | $6 \times 10^{7}$ |
| پەستانی هەوا لە ئاستی ڕووی دەریا | $1.01 \times 10^{5}$ |
| پەستانی هەوا لەبەرزایی 10 km لەسەر ڕووی دەریا | $2.8 \times 10^{4}$ |
| کەمترین پەستانی خاڵیبونەوە لە تاقیگە | $1 \times 10^{-12}$ |

## ئەو پەستانەی دەخرێتە سەر شلگازێك بەیەكسانی بۆ هەموو لایەكی شلگازەكە تەشەنە دەكات

كاتێ هەوا دەكرێتە ناو تایەی پاسكیلێك هێزێك دەخرێتە سەر پەستێنەری پەمپەكە وەپەستێنەرەكەش بەهێزێك كاردەكاتە سەر هەوای ناو تایەكە .وە هەواكەش بە دژە هێزێك نەك تەنها كار لە پەستێنەرەكە دەكات بەڵكو كار دەكاتە سەر لێواری ناوەوەی تایەكەش. وە لە ئەنجامی ئەمەش برِی زیادبونی پەستان بە یەكسانی هەموو تایەكە دەگرێتەوە.

وە بە شێوەیەكی گشتی، ئەگەر پەستان لەسەر هەر خاڵێكی شلگازەكەی ناو دەفرەكە زیاد بكات (وەك وەلفی تایەكە) ئەوا ئەو پەستانە زیادە هەموو خاڵەكانی تری شلگازەكەی ناو دەفرەكە دەگرێتەوە بە هەمان برِ. لەساڵی (1623 – 1662) (بلایز باسكاڵ) ئەم راستیەی ناونا دەستوری باسكاڵ.

### ئایا دەزانیت؟

هەر جارێك پەستان دەخەیتە سەر تیوبی هەویری ددان دەستووری پاسكال بەكردار جێبەجێ دەكەیت، پەستانی پەنجەكانت لەسەر دوو لای تیوبەكە تەشەنە دەكات بۆ بەشەكانی هەویری ناو تیوبەكە و لە دەرچەكە دێتە دەرەوە.

### دەستوری باسكاڵ

**ئەو پەستانەی دەكەوێتە سەر شلگازێك لەناو دەفرێكی داخراودا بە یەكسانی و بەبێ كەمكردن بۆ هەموو خاڵێكی شلگازەكەو بۆ دیواری دەفرەكەش دەگوێزرێتەوە.**

ئەو بەرزكەرەوەیە (جەگ) هایدرۆلیكیەی كە لە **وێنەی 3-7** بەكارهاتووە یەكێكە لە جێ بەجێ كردنەكانی دەستوری باسكاڵ. هێزێكی بچووكی وەك $F_1$ دەخرێتە سەر پەستێنەرە رووبەر بچووكەكە $A_1$ كە دەبێتە هۆی زیادكردنی پەستانی شلگازەكە (رۆنەكە) و بەپێ ی دەستوری باسكاڵ، وە پەستانە سەربارەكە ( $P$ سەربار ) بەبێ كەم كردن دەگوازرێتەوە بۆ پەستێنەرە رووبەر گەورەكە $A_2$ ، وە شلگازەكەش بە هێزی $F_2$ كاردەكاتە سەر پەستێنەرەكە. دەستوری باسكاڵ وپێناسەی پەستان بەكاردەهێنین بۆ دەست كەوتنی ئەم هاوكێشەیە:

$$P_{\text{سەربار}} = \frac{F_1}{A_1} = \frac{F_2}{A_2}$$

**هاوكێشەكە رێك دەخرێت بۆ هەژماركردنی $F_2$**

$$F_2 = \frac{A_2}{A_1} F_1$$

**ولە هاوكێشەی دووەمدا هێزی $F_2$ گەورەترە لە هێزی $F_1$ بە هاوكۆلكەیەك یەكسانە بە رێژەی نێوان هەردووو رووبەری پەستێنەرەكە $\frac{A_2}{A_1}$.**




**وێنەی 3-7**
بەهۆی یەكسان بوونی پەستان لەسەر هەردوولای شلگازە قەتیس كراوەكەی بەرزكەرەوە (جەگ) هایدرۆلیكیەكە. هێزێكی گەورە لەسەر پەستێنەرە روبەر گەورەكەی (لای راست) پەیدابووە بە هۆی هێزێكی بچووكەوە كە لەسەر پەستێنەرە بچووكەكەی (لای چەپ) دانراوە.

## نموونە 3 (ب)

### پەستان

**پرسیارەکە**

ڕووبەری ڕووی پەستێنەرە بچووکەکەی بەرزکەرەوەیەکی (جەگێکی) هایدرۆلیکی دەکاتە $0.20\ m^2$ وە ئۆتۆمبێلێك کە کێشەکەی $1.20 \times 10^4$ N لەسەر پەستێنەرە گەورەکە جێگیر بووە کە ڕووبەری ڕووەکەی $0.90\ m^2$. ئایا بڕی هێزی پێویست چەندە کە بخرێتە سەر پەستێنەرە بچووکەکە بۆ بەرزکردنەوەی ئۆتۆمبێلەکە؟

**شیکار**

**1. دەزانم**

دراو: $A_1 = 0.20\ m^2$ $\quad A_2 = 0.90\ m^2$ $\quad F_2 = 1.20 \times 10^4$ N

نەزانراو: $F_1 = ?$

**2. پلان دادەنێم**

هاوکێشەی پەستان بەکاردەهێنم.

$$\frac{F_1}{A_1} = \frac{F_2}{A_2}$$

**3. هەژماردەکەم**

$$F_1 = \left(\frac{A_1}{A_2}\right)F_2 = \left(\frac{0.20\ m^2}{0.90\ m^2}\right)(1.20 \times 10^4)N$$

$$\boxed{F_1 = 2.7 \times 10^3\ N}$$

## ڕاهێنانی 3 (ب)

### پەستان

**1.** هەوای پەستێنراو هێزێك دەخاتە سەر پەستێنەرێك کە نیوەتیرەکەی $5.00 \times 10^{-2}$ m بۆ بەرزکردنەوەی ئۆتۆمبێلێك کە کێشەکەی $1.33 \times 10^4$ N کە جێگیرکراوە لەسەر پەستێنەرێکی تر نیوەتیرەکەی $15.0 \times 10^{-2}$ m

أ . بڕی هێزی پێویست چەندە بۆ بەرزکردنەوەی ئۆتۆمبێلەکە بەهۆی هەوا پەستێنراوەکەوە؟

ب. ئەو پەستانە چەندە کە ئەم هێزەی دروست کردووە؟ کێشی پەستێنەرەکان فەرامۆش بکە.

**2.** دۆشەکێکی ئاوی درێژییەکەی 2.5 m وە پانی یەکەی 1.5 m کێشەکەی 1025 N ئەو پەستانە چەندە کە دۆشەکەکە دەیخاتە سەر زەوی ژوورێك وادابنێ کە بەشی خوارەوەی دۆشەکەکە بەتەواوەتی بەزەوییەوە نووساوە.

**3.** پیاوێك بەهۆی سەرخەرێکەوە بۆ بەرزی چیایەك دەچێت کە ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕانی کتوپڕی پەستان لەسەر هەر دوو پەردەی گوێچکەکانی، پەستانی گوێی ناوەوە پەستانی دەرەوە یەکسان نین لەسەر پەردەی گوێچکە کە نیوەتیرەی $0.40 \times 10^{-2}$ m. پەستانی هەوا لە $1.010 \times 10^5$ Pa کەمدەکات بۆ $0.998 \times 10^5$ Pa کاتێك پیاوەکە لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەچێت.

أ . پەستانی سەر هەردوو لای پەردەی گوێ لەسەر لوتکەی چیاکە چەندە؟

ب. بڕی بەرەنجامی هێز لەسە هەریەکە لە پەردەی گوێچکەکانی چەندە؟

## گۆڕانی پەستانی شلگاز لەگەڵ قوڵیدا

هەر چەندە ژێر دەریای بچێتە قولاییەکی زیاتری ئاو پەستانی ئاو لەسەری زیاد دەکات. ئەوەش پێویستی بە بوونی بەرگرییەکی زۆر هەیە لەلایەن لەشیەوە بۆ ئەوەی بەرگەی ئەو پەستانە گەورەیە بگرێت، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە پەستانی ئاو زیاد دەبێ بە زیادبوونی قوڵی.

لەبەر ئەوەی ژێردەریایەکە لە قولایەکی دیاریکراودایە دەبێ بەرگەی کێشی ئەستونە ئاوەکە بگرێت کە دەکەوێتە سەری. بیهێنە بەرچاوت کە چۆن ئەستونێکی ئاو بەتەواوی بە هێزێك کار دەکاتە سەر شوێنێکی دیاری کراوی ژێر دەریاییەکە و ئەو هێزەش دەکاتە کێشی ستونە ئاوەکە. وا دابنێ قەبارەی ستونە ئاوەکە $Ah$ ، کە $A$ ڕووبەری پانە برگەی ستونە ئاوەکەیە وە $h$ بەرزیەکەیەتی. وە بارستایەکەی یەکسان دەبێت بە $m = \rho V = \rho A h$ . لەهەردوو هاوکێشەی پەستان و چڕیەوە دەتوانین هاوکێشەی پەستان بەهۆی قوڵیەوە بنووسین:

$$P = \frac{F}{A} = \frac{mg}{A} = \frac{\rho V g}{A} = \frac{\rho A h g}{A} = \rho h g$$

ئەم هاوکێشەیەی سەرەوە کاتێك ڕاستە کە چڕی شلگازەکە نەگۆر بێت. ئەو پەستانەی لەم هاوکێشەیەدا دەردەچێت پێی دەوترێت پەستانی پێوراو و ئەم پەستانە یەکسان نییە بە پەستانی گشتی لەو قولاییەدا چونکە پەستانی هەوا لەسەر ڕووەکە هەیە کەواتە پەستانی پێوراو یەکسانە بە پەستانی گشتی (پەتی) $P$ کەپەستانی هەوا $P_0$ ی لێ دەرکرابێت:

$$\rho g h = P - P_0$$

**پەستانی گشتی (پەتی)**

$$P = P_0 + \rho g h$$

**پەستانی گشتی (پەتی) = پەستانی هەوا + (چڕی × تاودانی زەوی × قوڵی)**

ئەو دەربرینە تایبەتیەی پەستان لەناو شلگازدا یارمەتی تێگەیشتنی هێزی پاڵنەر دەدات: وا دابنێ سەندوقێکی لاکێشەیی نقومی دەفرێك ئاو دەکەین وەك لە **وێنەی 3-8** دا دیارە. ئەو پەستانە گشتییەی ئاوەکە بەرەو خوار دەیخاتە سەر ڕووی سەرەوەی سندوقەکە دەکاتە $-(P_0 + \rho g h_1)$ ، وە پەستانی گشتی ئاوەکە ڕووەو سەرەوە لەسەر ڕووی خوارەوەی سەندوقەکە دەکاتە $P_0 + \rho g h_2$ . بەرەنجامی پەستانی بەرێکراو لەسەر سەندوقەکە دەکاتە کۆی دوو پەستانەکە.

$$P_{\text{بەرەنجام}} = P_{\text{ڕووی خوارەوە}} + P_{\text{ڕووی سەرەوە}}$$
$$= (P_0 + \rho g h_2) - (P_0 + \rho g h_1) = \rho g (h_2 - h_1) = \rho g L$$




**وێنەی 3-8**
پەستانی شلگاز لە خوارەوەی ڕووی سەندوقەکە گەورەترە لە پەستانی سەر سندووقەکە.

## فیزیا و ژیان



1. **پەستانی هەوا:** بۆچی سەربانی تەلارەکان نارِوخێن بەهۆی ئەو پەستانە زۆرەی هەواوە؟
2. **هێزو ئیش:** کام لەدوو پەستێنەرەکەی جەگی هایدرۆلیکی گەورەکە یان بچووکەکە دووریەکی زیاتر دەبڕێت، کاتێك بەهۆی جەگەکەوە تەنێك بەرز دەکرێتەوە؟
3. **پێڵاوی ناوبەفر:** ئافرەتێك پێڵاوی ناو بەفری لەپێکردوەو لەسەر بەفر بەپێوە وەستاوە بەبێ ئەوەی بچەقێت، ئەگەر پێڵاوەکانی دابکەنێت ئەوا بەخێرایی دەچەقێت، بەپێی هێز و پەستان ئەوەی ڕوودەدات ڕوون بکەوە.



کە $L = h_2 - h_1$

**ئەو ئەنجامە بەکاردەهێنین بۆ دۆزینەوەی هێزی بەرەنجام**

$$F_{\text{بەرەنجام}} = P_{\text{بەرەنجام}} A \quad \rho gLA = \rho gV = \rho gV = m_{\text{شلگاز}}\, g$$

سەرنج بدە ئەم هاوکێشەیە دەربڕینی دەستوری ئەرخەمیدسە. بەگشتی دەتوانین بڵێین کە هێزی پاڵنەر لە ئەنجامی بوونی جیاوازی لە پەستانی شلگازەکە لە نێوان سەرەوەی تەنەکەو نزمترین خاڵی تەنە نقوم بووەکەیە.

## پەستانی هەوا

کێشی هەوا لەبەشی سەرەوەی بەرگە هەوای زەویدا پەستان دەخاتە سەر چینەکانی خوارەوەی هەوا کە پێی دەڵێن پەستانی هەوا. ئەو پەستانەی کە دەکەوێتە سەر هەر یەك لە ئێمە (وادابنێ ڕووبەرەکە $2m^2$ )، هێزێکی زۆر گەورە پەیدا دەکات کە لەوانەیە بگاتە $200\ 000\ N$. چۆن دەتوانین بەرگەی ئەو هێزە زۆرە بگرین و لەشمان تێك نەشکێت؟ بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە: چونکە کونۆچکە وشانەکانی لەشمان شلگازی تێدایە کە بۆ دەرەوە دەردەرێت بە هۆی پەستانێکەوە کە یەکسانە بە پەستانی هەوا واتە لەشمان لە باری هاوسەنگیدایە، چونکە هێزی پاڵنەری پەستانی هەوا یەکسانە بەو هێزە ناوەکیە پاڵنەرەی کە ڕووەو دەرەوەیە.




**وێنەی 3-9**
بەرزی ستوونی جیوەکە لەناو لوولەکەدا پەستانی هەوا دەگەیەنێت لە بارۆمەترەکەدا.

پەستانی هەوا بە ئامێرێك دەپێورێت پێی دەڵێن بارۆمەتری جیوەیی. کە **وێنەی 3-9** شێوەیەکی ساکاری ئەم بارۆمەترەیە کە پێکهاتوە لە لوولەیەکی درێژ، یەك لە سەرەکانی کراوەیە سەرەکەی تری داخراوە پڕ کراوە لە جیوە، کاتێك بە شێوەیەکی شاوڵی لە حەوزێکی جیوەدا سەرەوخوار دەکرێتەوە جیوەی ناو لوولەکە دێتە خوارەوە تا بەرزیەکی دیاری کراو. بەم جۆرە هێزی پەستێنەر لەسەر جیوەی حەوزەکە یەکسان دەبێت لەگەڵ کێشی ستوونە جیوەکە لەناو لوولەکەدا. بۆیە وادانراوە هەر گۆڕانێك لەبەرزی ستوونە جیوەکە گۆڕان لەپەستانی هەوا دەگەیەنێت.

## جووڵە بیردۆزی گازەکان وپەستانی گاز

بەدرێژایی چەند ساڵێك چەند پێشکەوتنێك لەسەر چەند سامپلێکی گازەکان ڕویداوە کە هەوڵدان بوو بۆ ڕوونکردنەوەی ڕەوشتە بەچاو بینراوەکانی گازێك. وەك پەستان بەهۆی ئەوەی کە ڕوودەدات لە گازەکانداو بە مایکرۆسکۆب دەبینرێ. وە سەرکەوتووترینیان جووڵە بیردۆزی گازەکانە.

ئەم بیردۆزە تەنۆڵکەکانی گاز وەك کۆمەڵێك تۆپی بلیارد دادەنێت کە بەردەوام بە بەریەکتری دەکەون. ئەم نموونە سادەیە بەسەرکەوتوویی ڕەوشتە بەچاوبینراوەکانی گازی لێك دایەوە. بۆ نموونە، کاتێ ئەم تەنۆلکانە بەردیواری دەفرێك دەکەون هەندێ لە تەوژمەکەیان وون دەکەن، وە تێکڕایی تەوژمی گوازراوە بۆ دیواری دەفرەکە یەکسانە بەو هێزەی کە گازەکە بەستوونی دەیخاتە سەر دیواری دەفرەکە. هێزی سەر یەکەی ڕووبەر پێی دەگوترێت پەستانی گاز.

## نموونە 3 (ج)

### پەستان بەپێی قوڵی

**پرسیار**

**پەستانی پەتی ئاوی زەریایەك چەندە لە قوڵایی $1.00 \times 10^3$ m وادابنێ چڕی ئاو $1.025 \times 10^3$ kg/m$^3$ وە $P_0 = 1.01 \times 10^5$ Pa .**

**شیکار**

**1. دەزانم**

دراو: $h = 1.00 \times 10^3$ m $\quad P_o = 1.01 \times 10^5$ Pa

$\rho = 1.025 \times 10^3$ kg/m$^3$ $\quad g = 9.81$ m/s$^2$

نەزانراو: $P = ?$

**2. پلان دادەنێم**

هاوكێشەی پەستانی شلگاز بەپێی قوڵی بەكاربهێنە لە لاپەڕە 60 .

$$P = P_0 + \rho gh$$

**3. هەژماردەكەم**

$$P = P_0 + (1.025 \times 10^3 \text{ kg/m}^3)(9.81 \text{ m/s}^2)(1.00 \times 10^3 \text{ m})$$

$$P = 1.01 \times 10^5 \text{ Pa} + 1.01 \times 10^7 \text{ Pa}$$

$$\boxed{P = 1.02 \times 10^7 \text{ Pa}}$$

## ڕاهێنانی 3 (ج)

### پەستان بەپێی قوڵی

1. زەریای باسفیك قوڵیەكەی لە یەكێك لە شوێنەكان 11.0 km . ئەگەر پەستانی هەوا لەسەر ڕووی دەریا $1.01 \times 10^5$ Pa بێت ، ئایا ئەو پەستانە چەندە كە دەبێت ژێر دەریاییەك بەرگەی بگرێت بۆ ئەوەی بگاتە ئەم قوڵیە؟ (**خشتەی 1-3** بەكاربهێنە).
2. دەفرێك تا قوڵایی 20.0 cm ئاوی تێكرا. لەسەر ڕووی ئاوەكە چینێك زەیت بە ئەستووری 30.0 cm وە چڕی $0.70 \times 10^3$ kg/m$^3$ هەیە.
   أ . پەستانی پەتی لەسەر ڕووی ئاوەكە چەندە؟
   ب. پەستانی پەتی لەسەر بنكەی دەفرەكە چەندە؟ (خشتەی **1-3** و **2-3** بەكاربهێنە)
3. پەرداخێكی پڕ جیوە لە ژوورێكی خاڵی كراوە لە هەوادا لە تاقیگە دانرا. ئایا بەرزی جیوەكە لە پەرداخەكەدا چەندە ئەگەر پەستان لەسەر بنكەكەی $2.7 \times 10^4$ Pa بێت؟ ( خشتەی **1-3** بەكاربهێنە وەئاگاداری نرخی پەستانی هەوا بە كە بەكاری دەهێنی .)
4. قوڵی خاڵێك دیاری بكە لە زەریایەكدا كە پەستانی پەتی تیایدا یەكسانە بە سێ ئەوەندەی پەستانی هەوا ( خشتەی **1-3** ، **2-3** بەكاربهێنە).

# پلەی گەرمی لە گازدا

**پلەی گەرمی**

پێوانی تێکڕایی جوولە وزەی تەنۆلکەکانی ماددەیە.

بە تەنها بەکارهێنانی چڕی و پەستان بۆ ناساندنی شلگاز بەس نین، بەڵکو پێویستە پلەی گەرمیش باس بکرێت لەبەر گرنگیەکەی، پلەی گەرمی پەیوەستە بە بڕی گەرمی یا ساردی تەنەکەوە لەکاتی دەست لێدانیدا. هەستەکانمان نیشانەیەکمان دەدەنێ بۆ زانینی پلەی گەرمی تەنەکان. بۆ تێگەیشتنی زیاتر پێویستە بگەڕێینەوە بۆ جوولە بیردۆزی گازەکان، تێگەیشتن لە پلەی گەرمی وەك تێگەشتنی پەستانە لە ڕوانگەی پێوەری گەردییەوە. جولە بیردۆز پێشبینی پەیوەندی ڕێژەیی پلەی گەرمی لەگەڵ تێکڕای جولە وزەی تەنۆلکەکانی گازدا دەکات.

لەگەڵ زیادبوونی پلەی گەرمی گازەکاندا خێرایی تەنۆلکەکانی گاز زیاد دەبێت لەئەنجامدا تێکڕای بەرکەوتن لەگەڵ دیواری دەفرەکەدا زیاد دەبێت، ئەمەش دەبێتە هـۆی گـواسـتـنـەوەی بـڕێـکـی زیـاتـر لـە گـەرمـی لـەگـەڵ دیـواری دەفـرەکـە لـەکـاتـێـکـی دیاریکراودا، کە ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوون لە پەستاندا، جوولە بیردۆز دەڵێت پەیوەندی لە نێوان پلەی گەرمی و پەستاندا هەیە.

یەکەی پێوانەی پلەی گەرمی لە سیستمی نێودەوڵەتی SI بە کلڤن K و پلەی سیلیزیە ($C^o$). بۆ گۆڕینی پێوەری سیلیزی بۆ پێوەری گلڤن، 273 کۆدەکەینەوە لەگەڵ پلەی سیلیزیدا، بۆ زانین پلەی گەرمی ئاسایی ژوورێك نزیکەی 293 K ($20^oC$) یە.

$$T_k = T_{C^o} + 273$$

## پێداچوونەوەی بەندی 2-3

**1.** کام لەم تەنانەی کە لەسەر زەوی ژوورەکە جێگیر بوون پەستانی زیاتر دروست دەکات؟

أ . سەندوقێکی شەش پاڵو کێشەکەی 25 N بێت و درێژی لایەکی 1.5 m بێت.

ب . لوولەکێك کێشەکەی 15 N بێت و نیوەتیرەی بنکەکەی 1.0 m .

ج . سەندوقێکی شەش پاڵو کێشەکەی 25 N بێت و درێژی لایەکی 2.0 m بێت.

د . لوولەکێك کێشەکەی 25 N بێت و نیوەتیرەی بنکەکەی 1.0 m .

**2.** بەهۆی ماتۆڕێکی ئاوی تایبەتەوە دەمانەوێ ئاو بەرزکەینەوە بۆ شوێنێکی چیای سەفین کە بەرزیەکەی 321 m ئایا بڕی پەستانی پێویست چەندە بۆ پاڵنانی ئاوەکە بۆ ئەو بەرزییە ( بڕوانە خشتەی **1-3** ) .

**3.** پلەی گەرمی ژوورێك لەنهۆمی خوارەوەی نەخۆشخانەیەك $20^oC$ وەپلەی گەرمی ژوورێکی تر لە نهۆمی سەرەوەی $22^oC$ لەکام لەم دوو ژوورەدا تێکڕای جوڵەوزەی گەردەکانی هەوا زیاترە؟

**4.** شنەبایەکی بەیانی پلەی گەرمیەکەی $11^oC$ ئایا بە پێوەری گلڤن پلەی گەرمیەکەی چەندە؟

**5.** ژێر دەریایەك لە قووڵای $5.0 \times 10^2$ m دایە ئایا بڕی ئەو پەستانە چەندە کە بەرگەی دەگرێت بە یەکەی (pa ). ئایا چەند جار ئەو پەستانە زیاترە لەو پەستانەی کە لەسەریەتی کاتێك لەسەر ڕووی ئاوەکەیە ( بڕوانە خشتەی **1-3** ، **2-3** ).

بەندی 3-3

# جووڵەی شلگازەکان
*Fluids in Motion*

## 3-3 ئامانجەکان

- لە جووڵەی شلگازەکان دەکۆڵێتەوە بەهۆی هاوکێشەی یەکبینە ڕۆیشتنی شلگازەکانەوە.
- هاوکێشە برنۆلی بەکاردێت بۆ شیکارکردنی پرسیارەکان دەربارەی ڕۆیشتنی شلگاز.
- کاریگەری دەستووری برنۆلی لە جووڵەی شلگاز پێناسە دەکرێت.

## ڕۆیشتنی شلگاز

ئایا هەرگیز سەوڵت لێداوە بۆ جووڵاندنی بەلەمێك لە ئاوی ڕووبارێکدا؟ تێبینی دەکەیت ئەو بەشەی ڕووبارەکە کە ئاوەکەی بە هێمنی دەجووڵێت، دەتوانیت بە ئاسایی تیایدا سەر ئاو کەوێت، بەڵام بەردو پێچی تیژ لە شوێنەکانی تری ڕووبارەکەدا دەبێتە هۆی دروستکردنی کەفێکی سپی.

کاتێ شلگاز دەجووڵێت، وەك لە ڕووباردا، جووڵەی تەنۆلکەکانی شلگازەکە لەسەر ڕێڕەوێك دەبێت کە پێیان دەگوترێت هێڵەکانی ڕۆیشتن ئەم هێڵانە ڕێڕەوی تەنۆلکەکانی شلگازێکی جووڵاو دیاری دەکەن، وەهێڵەکان خەیاڵین. جووڵەی شلگاز بەیەکێك لەم ڕێگایانە دەناسرێتەوە، ڕۆیشتنی ڕێك و خشۆکانە، (چینی) یا ڕۆیشتنی شێواو (نارێك) کاتێك هەر تەنۆلکەیەك لە خاڵێکەوە دەست بە جووڵە بکات و ڕێڕەوێکی ڕەوانی وابگرێت کە هێڵەکانی ڕۆیشتنە جیاوازەکان دەیانگرنە بەرو لەسەر ڕێڕەوی خاڵە جووڵاوەکانی تر جووت دەبێت و شلگازەکە پارێزگاری ئاراستەی جووڵەکەی خۆی دەکات، جووڵەی ئاوی ڕووبارەکان بە ڕۆیشتنی خشۆکانە دادەنرێت بە درێژایی ڕووبارەکە، وە لەلایەکی ترەوە ڕۆیشتنی شلگاز شێواو و نارێك دەبێت ئەگەر خێرایەکەی زیاتر بوو لە خێراییەکی دیاریکراو یان لەژێر کاریگەری باروودۆخێکدا کە دەبێتە هۆی گۆڕانی لەناکاوی خێرایی وەك بونی بەربەست و پێچی تیژ لە ڕووبارەکەدا، بەم جووڵە نارێکەی شلگازەکان دەڵێن: تەوژمی لوولدان، ئەمەشە ڕۆیشتنی شێواو جیادەکاتەوە لە ڕۆیشتنی خشۆکانەو چینی. لە نموونەکانی ڕۆیشتنی شێواو وەك ئەو شوێنکارەی لە ئاودا بەجێ دەمێنێ لە ئەنجامی هەژینەوەی یا (ڕۆیشتنی) پاپۆڕەکەدا یان بەکارتێکرانی تەوژمە هەواییەکان بەهۆی ڕوودانی زریانێکی هەورە تریشقاوی بەهێزەوە.




**وێنەی 3-10**
ڕۆیشتنی ئاو لە دەوری لولەکێك دیاری دەکات کە خشۆکانە (چینی) و شێواوە.

لە وێنە **3-10** وێنەی ڕۆیشتنی ئاوە بە دەوری لولەکێکدا کە بڵقی هایدرۆجینی کراوەتە ئاوەکەوە تاکو هێڵەکانی ڕۆیشتنی تەوژمی لوولدان دەربکەون، سەیری ئەو جیاوازیە گەورەیە بکە لە نێوان شێوازی ڕۆیشتنی خشۆکانەو شێواودا هەیە، ڕۆیشتنی چینی (خشۆکانە) زۆر ئاسانەو دەگونجێت بۆ هێنانەوەی نموونە، چونکە دەتوانرێت پێشبینی بکرێت، بەڵام ڕۆیشتنی شێواو هەڵچوو زۆر بە گرانی پێشبینی دەکرێت.

### شلگازی نموونەیی Ideal Fluid

**شلگازی نموونەیی**

ئەو شلگازەیە کە لێکخشاندنی ناوەکی یان لینجی نییەو ناپەستێورێت.

دەتوانین کە لەچەند سیفەتێکی جووڵەی شلگاز بگەین بەهۆی لێکۆڵینەوە لە ڕەوشتەکانی شلگازی نموونەیەوە ideal fluid کاتێك باسمان لە چڕی و هێزی پاڵنەر کرد وامان دانا کە هەموو شلگازە بەکارهاتووەکان لە پرسیارەکاندا بە کردار توانای پەستاوتنیان نەبوو، شلگاز ناتوانرێ بپەستێورێت ئەگەر چڕیەکەی بە نەگۆڕی بمێنێتەوە، وە لینجی پەیوەندی بە بڕی لێکخشاندنی ناو شلگازەکەوە هەیە، لەوانەیە لێکخشاندنی ناوەکی ڕووبدات کاتێ چینێکی شلگاز بەسەر چینێکی تردا دەخلیسکێت، ڕۆیشتنی شلگازی زۆر لینج لەناو بۆریدا زۆر هێواشترە لە ڕۆیشتنی ئەو شلگازەی کە لینجی کەمە، لەکاتی ڕۆیشتنی شلگازێکی لینجدا بەشێك لە جووڵە وزەی شلگازەکە دەگۆڕێت بۆ وزەی ناوەکی.

لە ئەنجامی لێکخشاندنی ناوەکییەوە. شلگازە نموونەیەکان وا دادەنرێت کە لینج نین واتە ووزەی ناوەکی وون نابێت لەکاتی جووڵەدا. هەروەها شلگازی نموونەیی بەوە جیادەکرێتەوە جووڵەکەی بەدوای یەکدا دێت واتە خێرایی وچڕی وپەستان لە هەموو خاڵەکانی شلگازەکەدا نەگۆڕ دەبێت. هەروەها ڕۆیشتنی شلگازی نموونەی شێواو نیە، واتە تەوژمی لوولدان لە کاتی جووڵەکەیدا نیە.

لەگەڵ ئەوەشدا ڕەوشتەکانی شلگازی نموونەی جێبەجێ نابێت بەسەر شلگازی ڕاستەقینەدا بەڵام نموونەکەی سەرەوە یارمەتی دەرە بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕەوشتەکانی شلگازی ڕاستەقینە، ئەم نموونەیە وەك ئامرازێکی کاریگەرە لە شیتەڵکردندا.

وە لەبەر ئەوەی هیچ شلگازێك دیاری نەکراوە بۆیە هەر شلگازێك کە لەمەودوا باسیان دەکەیت شلگازی نموونەیین.

# بنەماکانی جووڵەی شلگاز

لێکۆڵینەوە لە ڕەوشتی شلگازەکان زۆر ئاڵۆزە. وە ئەگەر بمانەوێ بە تەواوی هێزی کاریگەری سەر شلگاز شیبکەینەوە زۆر گرانە تەنانەت بە کۆمپیوتەریش ناتوانرێ هاوشێوەی بۆ دابنرێت، بەڵام دەتوانرێت بنەما گشتیەکان بۆ باسکردنی ڕەوشتی شلگاز دابڕێژرێت ئەویش بە پشت بەستن بە یاسا گشتیەکانی فیزیا.

**هاوکێشەی بەردەوامی (هاوکێشەی یەکبینە ڕۆیشتن) ئەنجامی پاراستنی بارستاییە،** شلگازێکی نموونەی بێنە بەرچاوت کە بە سەرێکی بۆڕییەکدا تێپەڕ دەبێت و وە لەسەرەکەی ترەوە دەردەچێت وەك لە وێنەی **11-3** دیارە، نیوەتیرەی هەردوو سەری بۆڕیەکە جیاوازە. چۆن خێرایی تێپەڕبوونی شلگازەکە دەگۆڕێت لەکاتی تێپەڕبوونی بەناو بۆڕیەکەدا؟

لەبەر ئەوەی بارستایی پارێزراوەو شلگازەکە ناپەستێوریێ بۆیە پێویستە بارستایی $m_1$ کە دەچێتە ناو بۆڕیەکەوە یەکسان بێت بە بارستایی $m_2$ کە لەسەرەکەی ترەوە دێتە دەرەوە وەك لە وێنەکەدا دیارە:

$$m_1 = m_2$$

ئەگەر زانیت $m = \rho V$ وە قەبارەی لوولەك یەکسان بێت بە $V = A\Delta x$ ،

$$\rho_1 V_1 = \rho_2 V_2$$
$$\rho_1 A_1 \Delta x_1 = \rho_2 A_2 \Delta x_2$$

لەبەر ئەوەی درێژی لولەکەکە $\Delta x$ یەکسانە بەو دووریەی کە شلگازەکە دەیبڕێت ئەمەش یەکسانە بە ئەنجامی لێکدانی خێرایی ڕۆیشتن و کات: کەواتە

$$\rho_1 A_1 v_1 \Delta t = \rho_2 A_2 v_2 \Delta t$$

لەبەر ئەوەی چڕی وکاتی خایەنراو بۆ شلگازی نموونەیی هەمان بڕن بۆیە لەهەردوو لای هاوکێشەکە کورت دەکرێتەوە و هاوکێشە بەرهەمهاتووەکەش هاوکێشەی بەردەوامیە

**هاوکێشەی بەردەوامی**

$$A_1 v_1 = A_2 v_2$$

**ڕووبەری برگەی یەکەم × خێرایی لەبەشی 1 = ڕووبەر برگەی دووەم × خێرایی لەبەشی 2**

**ئایا دەزانیت؟**

ئەو ڕێکلامە لکێنراوانەی کە بۆ ناساندنی ڕۆنی ماکینەی ئامێرەکان دەکرێت کە دەری دەخات لینجیان بەپێ ی ستانداریتی (پێوەری) جیهانیە، ئەو ڕۆنانەی کەوا لینجیان زۆرە بەکاردێت بۆ کەشە گەرمەکان وە خێرایی لێخورینی زۆر، بەڵام ئەو ڕۆنانەی کە لینجیان کەمە لە کەشی زۆر ساردا بەکاردەهێنرێن کە مەکینەکان زۆربەی کاتەکان ساردن.




**وێنەی 11-3**

بڕی بارستایی شلە جووڵاوەکەی دێتە ناو بۆڕیەکەوە یەکسانە بەو بارستاییەی کە دێتە دەرەوە لەهەمان کاتی خایەنراودا.

## خێرایی ڕۆیشتن بەندە لەسەر ڕووبەری پانە برگە

لە هاوکێشەی بەردەوامییەوە تێبینی ئەوە دەکەین کە $A_1$ و $A_2$ بەدوو ڕووبەری جیاواز بۆ بۆریەکە دادەنرێت نەك تەنها بۆ هەردوو سەری بۆریەکە. لە هاوکێشەکەوە بەدیاردەکەوێت کە خێرایی ڕۆیشتنی شلگاز لە برگە بچووکەکەدا زیاترە وەك لە برگە فراوانەکەدا. سەرەنجامی لێکدانی $Av$ پێ ی دەوترێت **تێکرای ڕۆیشتنی قەبارەیی** وە بەیەکەی قەبارە بۆیەکەی کات $\frac{\Delta V}{\Delta t}$ دەپێورێت. تێکرای ڕۆیشتن نەگۆڕ دەبێت بە درێژایی بۆریەکە دەتوانین هاوکێشەی بەردەوامی ڕوون بکەینەوە ئەویش بە پەنجە خستنە سەر لایەکی سۆندەی ئاو. وەك لە **وێنەی 3-12** دا دیارە. چۆن پەنجەی گەورە بەشێك لەو ڕووبەرە دەگرێت کە ئاوەکەی لێوە دەردەچێت، ئاوەکە بەخێراییەکی زۆر زیاتر دەردەچێت وەك لەوەی کە پەنجە دانەنرابێت، هاوکێشەی بەردەوامی ئەوەش ڕوون دەکاتەوە کە چۆن ئاو لە شوێنی تەسك وتەنکاوەکاندا بەخێرایەکی زیاتر دەڕوات لەچاو شوێنە فراوان و قوڵەکاندا.



**وێنەی 3-12**
پەنجە گەورەت دەمی سۆندەکە بچووك دەکاتەوە دەبێتە هۆی خێرابوونی دەرچوونی ئاوەکە.

## پەیوەندی پەستان بەخێرایی ڕۆیشتنەوە

وادابنێ کە گەڵایەکی دار بەبۆری ئاوی ژێرابدا تێپەڕ دەبێت وەك **وێنەی 3-13** ، بەپێی هاوکێشەکەی بەردەوامی شلگازەکان ئاو بەناوچە تەسکەکەدا خێراتر تێپەڕ دەبێ وەك لە ڕۆشتنی بە ناو ناوچە فراوانەکەیدا. بۆیە کە گەڵاو ئاوەکە دەگەنە بەشە تەسکەکەی بۆریەکە کە خێراییان زیاد دەکات.

ئەگەر خێرایی ئاووگەڵاکە زیادببێت کاتێك دەچنە ناوچە تەسکەکەوە، واتە تاودانێك وەردەگرن وئەم تاودانەش بەپێی یاسای دووەمی نیوتن هێزێکی لاسەنگ دروستی کردووە ئەویش لەوەوە دروست بووە کە پەستانی ئاوی پێش گەڵاکە کەمترە لە پەستانی ئاوی دواوەی گەڵاکە. ئەم جیاوازی پەستانە وادەکات کە خێرایی گەڵاو ئاوەکە زیاد بکات کاتێك دەچنە بەشە تەسکەکەی بۆریەکەوە، ئەم نموونەیە بنەمایەکی گشتی ڕوون دەکاتەوە کە پێی دەڵێن دەستوری برنۆلی کە دەقەکەی بریتیە لە:




**وێنەی 3-13**
گەڵاکە کاتی تێپەربوونی بە برگە تەسکەکەدا بەتاودان دەڕوات نیشاندەری پەستان پێو پیشاندەدات کە پەستانی ئاو لە لای ڕاست کەمترە وەك لەلای چەپ

**دەستوری برنۆلی**
**بە زیادبوونی خێرایی شلگاز پەستان کەمدەکات.**

هێزی بەرزکەرەوەی کاریگەر لەسەر باڵەکانی فرۆکە بەپشت بەستن بە دەستوری برنۆلی یەوە لێکدەدرێتەوە. کاتی هەڵسانی فرۆکە هەوای دەوری فرۆکەکە و باڵەکان دەجولێت، وەك لە **وێنەی 3-14** دیارە. باڵەکانی فرۆکە بەشێوەیەك دروست کراون کە وابکات خێرایی ڕۆیشتنی هەوا لەسەرەوەی باڵەکان زیاتر بێت وەك لە ژێرەوەی بۆیە پەستانی هەوا لەسەرەوەی باڵەکان کەمتر دەبێت وەك لەژێرەوەی ئەمەش هێزێکی کاریگەر لەسەرباڵەکان دروست دەکات کە بەرەنجامەکەی بەرەو سەرەوەیە. کە پێی دەڵێن هێزی بەرزکەرەوە.




**شێوەی 3-14**
کاتێك هەوای دەوری باڵەکان دەجووڵێت خێرایی هەوا لە سەرەوەی باڵەکانی زیاترە وەك لە ژێرەوەی، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی پەستانی هەوای ژێر باڵەکانی گەورەتر بێت لە پەستانی سەرەوەی باڵەکان کە ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی فرۆکەکە.

## هاوکێشەی برنۆلی پەستان و جووڵەوزە لە شلگازی جووڵاودا بەیەکترەوە دەبەستێتەوە

وادابنێ شلگازێك لە بۆریەکدا دەجووڵێت کە ڕووبەری پانە برگەکەی وبەرزیەکەی گۆڕاون، وەك لە **وێنەی 3-15** دا دیارە، کاتێك شلگازەکە بەناوچە پانە برگە جیاوازەکاندا تێپەڕ دەبێت ئەوا خێرایی و پەستانەکەی بە درێژایی ڕێڕەوەکەی دەگۆڕێت. وە لەگەڵ گۆڕانی خێرایەکەیدا جووڵە وزەکەش دەگۆڕێت. ئەو گۆڕانە لە جووڵە وزەدا گۆڕانی ماتە وزەی کێشکردن شوێنی دەگرێتەوە یان گۆڕان لە پەستانەکەدا شوێنی دەگرێتەوە، بەوەش وزە پارێزراو دەبێت.

دەستەواژەی پاراستنی وزە لە شلگازەکاندا پێی دەڵێن هاوکێشەی بڕنۆلی بەم شێوە دەنوسرێت:

پەستان + جوولە وزەی یەکەی قەبارە +
ماتە وزەی کێشکردنی یەکەی قەبارە =
نەگۆڕێك بە درێژایی ڕێڕەوێکی ڕۆیشتنی دیاری کراو

$$P + \frac{1}{2}\rho v^2 + \rho gh = \text{نەگۆڕ}$$




**وێنەی 3-15**
کاتی ڕۆیشتنی شلگازێك بە بۆریەکدا لەوانەیە خێرایی وپەستان و بەرزی بگۆڕێت.

تێبینی جیاوازییەکی سادە دەکرێت لە نێوان هاوکێشەی بڕنۆلی وە یاسای پاراستنی وزە، یەکەمیان لەلای چەپی هاوکێشەکە دوو دەستەواژەی هاوشێوەی دەستەواژەی جوولە وزە و ماتەوزەی کێش کردنن بەڵام چڕی $\rho$ لە جیاتی بارستایی $m$ تێدایە هۆیەکەشی بڕە پارێزراوەکەی هاوکێشەی بڕنۆلی بڕی وزەی یەکەی قەبارەیە، بە تەنها وزە نیە، لەبەر ئەوەی چڕی هاوتای بڕی بارستایی یەکەی قەبارەیە. وە هاوکێشەی پاراستنی وزە لە شلگازدا دەستەواژەیەکی تری تێدایە کە ئەویش پەستانە $P$ . تێبینی دەکەین کە یەکەکانی پەستان هاوشێوەی یەکەکانی وزەن لە یەکەی قەبارەدا. ئەگەر ویستت جیاوازی بکەی لە نێوان وزە و قەبارەیەکی دیاری کراوی شلگاز لە دوو خاڵی جیاوازدا هاوکێشەی بڕنۆلی دەگۆڕێ و بەم شێوەی خوارەوە دایدەڕێژن.

$$P_1 + \frac{1}{2}\rho {v_1}^2 + \rho gh_1 = P_2 + \frac{1}{2}\rho {v_2}^2 + \rho gh_2$$

## بارێکی تایبەت بە هاوکێشەی بڕنۆلی (دەستوری بڕنۆلی)

ئەوەی شایانی باس کردنە لێرەدا دوو باری تایبەتی هاوکێشەی بڕنۆلی باس دەکەین.

یەکەم: **ئەگەر شلگازەکە مەنگ بێت** هەردوو خێراییەکەی دەکاتە سفر. ئەو بارە بە وەستاو دادەنرێت وەك ئەو ستوونە ئاوەی لەناو لولەکێکدایە. ئەگەر بەرزی بۆریەکە $h_1$ بە ئاستی سفر دابنێن و $h_2$ قوڵی بێ، هاوکێشەی بڕنۆلی دەگۆڕێ بە هاوکێشەیەکی تر بە گوێرەی قوڵی.

$$P_1 = P_2 + \rho gh_2 \quad \text{(شلگازی مەنگ)}$$

دووەم: گەر شلگازێك لەناو بۆریەکی ئاسۆی کە تەسك بوونەوەیەکی تیابێ، وەك لە **وێنەی 3-16** دا دیارە ولەبەر ئەوەی بەرزی شلگازەکە نەگۆڕە، ئەوا ماتەوزەی کێش کردن ناگۆڕێت، هاوکێشەی بڕنۆلی بەم شێوەیە کورت دەکرێتەوە:

$$P_1 + \frac{1}{2}\rho {v_1}^2 = P_2 + \frac{1}{2}\rho {v_2}^2 \quad \text{(بۆری ئاسۆی)}$$

ئەگەر $v_1$ گەورەتر بێت لە $v_2$ لە دووخاڵی جیاوازی ڕێڕەوەکەدا کەواتە $P_1$ کەمتر دەبێ لە $P_2$ . بە دەربڕینێکی تر پەستان کەم دەکات ئەگەر خێرایی زیاد بکات. ئەوەش دیسان بارێکی تایبەتی دەستوری بڕنۆلیە. کەواتە مەرجی پێویست بۆئەوەی دەستوری بڕنۆلی ڕاست بێت دەبێت بەرزی نەگۆڕ بێت.

چالاکییەکی کرداری
**خێرا**
**دەستوری بڕنۆلی**
**کەرەستە**
✓ یەك پەرە کاغەز

دەتوانین لە ڕاستی کاریگەری دەستوری بڕنۆلی بکۆڵینەوە بە گرتنی پەرە کاغەزێك بە شێوەیەکی ئاسۆیی وە بە فوکردن لە ڕووی سەرەوەی، ئەوا پێویستە کاغەزەکە بەرزبێتەوە لە ئەنجامی کەم بوونی پەستان لەسەر ڕووی سەرەوەی کاغەزەکە.




**وێنەی 3-16**
کاتی چوونی شلگازێك بۆناو بۆریەکی ئاسۆی کە تەسك بونەوەیەکی تیابێت ولەبەرزیەکی نەگۆڕدابێت شلگازەکە تووشی گۆڕان لە خێرایی وپەستاندا دەبێت.

## نموونە 3 (د)

### هاوکێشەی بڕنۆلی

**پرسیار**

**تانکیەکی ئاو لە خوارەوەی یەك لە تەنیشتەکانی کونێکی بچووك هەیە وە سەری تەنکیەکە کراوەیە. خێرایی فیچقە کردنی ئاوەکە لەو کونەوە چەندە ئەگەر بەرزی ئاوەکە لەسەرو کونەکەوە 0.500 m بێت.**

**شیکار**

**1. دەزانم**

دراو: $h_2 - h_1 = 0.500 \text{ m}$

نەزانراو: $v_1 = ?$

وێنە:




**2. پلان دادەنێم**

**هاوکێشەیەك هەڵدەبژێرم:** لەبەر ئەوەی پرسیارەکە لەسەر شلگازەو دوو بەرزی جیاوازی تێدایە، شیکارکردنی پێویست بە بەکارهێنانی دەستووری بڕنۆلی دەکات.

$$P_1 + \frac{1}{2}\rho v_1^2 + \rho g h_1 = P_2 + \frac{1}{2}\rho v_2^2 + \rho g h_2$$

خاڵی **1** ئاستی کونەکەیەو خاڵی **2** ئاستی ئاوی ناو تانکیەکەیە ئەگەر وامان دانا کە کونەکە زۆر بچووکەو دابەزینی ئاستی ئاوەکە زۆر هێواشە، دەتوانیت $v_2$ بە نزیکەی بە سفر دابنرێت، دیسان سەرنج بدە کە $P_2 = P_0$ وە $P_1 = P_0$ ، چونکە کونەکە و تانکیەکە سەریان کراوەیە.

$$P_0 + \frac{1}{2}\rho v_1^2 + \rho g h_1 = P_0 + \rho g h_2$$

**3. هەژمار دەکەم**

هاوکێشەکە ڕێك دەخەم بۆ جیاکردنەوەی نەزانراوەکە.

$$\frac{1}{2}\rho v_1^2 = \rho g h_2 - \rho g h_1$$

$$v_1^2 = 2g(h_2 - h_1)$$

$$v_1 = \sqrt{2g(h_2 - h_1)}$$

**نرخەکان لە هاوکێشەکەدا دادەنێم وە شیکاری دەکەم:**

$$v_1 = \sqrt{2(9.81 \text{ m/s}^2)(0.500 \text{ m})}$$

$$\boxed{v_1 = 3.13 \text{ m/s}}$$

**4. هەڵیدەسەنگێنم**

بەنزیکراوەیی دەردەچێت:

$$v_1 = \sqrt{2(10)(0.5)} \approx 3 \text{ m/s}$$

## ڕاهێنانی 3 (د)

### هاوکێشەی برنۆلی

**1.** کونێك لەیەکێك لە تەنیشتەکانی تانکیەکی پڕ ئاوی سەر کراوەدایە کونەکە دەکەوێتە دوری $16\ m$ لەژێر ئاستی ئاوەکەوە ئەگەر تێکڕایی فیچقەکردنی ئاو $\frac{2.5 \times 10^{-3}}{60}\ m^3/s$ ، ئایا:

أ . خێرایی فیچقەی ئاو لە کونەکەوە چەندە؟

ب . تیرەی کونەکە چەندە؟

**2.** شلەیەك چڕیەکەی $1.65 \times 10^3\ kg/m^3$ لەناو دوو بۆری ئاسۆیی دا کە لە هەردوو سەرەوە بەیەکەوە بەستراون لە تۆڕی دابەشکردنی ئاودا دەڕوات. ڕووبەری پانە برگەی بەشی یەکەم $10.0\ cm^2$ وە خێرایی جوولەی شلەکە $275\ cm/s$ ، وە پەستانەکەی $1.20 \times 10^5\ Pa$ . ئەگەر ڕووبەری پانە برگەی بەشی دووەم $2.50\ cm^2$ بێت ئایا:

أ . خێرایی ڕۆیشتن لەبەشە بچووکەکەدا چەندە؟

ب . پەستان لەبەشە بچووکەدا چەندە؟

**3.** کاتێك هەناسە وەردەگرین هەوا بە خێرایی $15\ cm/s$ لەناو بۆریەکانی هەوادا دەجوولێت تێکرایی خێراییەکەی دەبێتە دوو هێندە کاتێك دەگاتە یەکێك لە بۆرییە تەسکەکانی هەوا. وا دابنێ ڕۆشتنەکە خشۆکانەیە (بەبێ پەستاوتنە)، دابەزینی پەستان لە بەشە تەسکەکەدا چەندە؟

## پێداچوونەوەی بەندی 3-3

**1.** بۆ پڕکردنی سەتڵێك ئاو بەهۆی سۆندەی باخچەوە پێویستیمان بە $30.0\ s$ هەیە، ئەگەر بە پەنجەمان بەشێکی دەمی سۆندەکە بگرین بۆ ئەوەی خێرایی فیچقەکردنی ئاو ببێتە دوو هێندەی خێراییە سەرەتاییەکەی، چەند کاتت پێوستە بۆ پڕکردنی سەتڵەکە؟

**2.** ئاو لە بۆریەکی ئاسۆییەوە دێتە دەرەوە بە پەستانی $3.00 \times 10^5\ Pa$ و بە خێرایی $1.00\ m/s$ وە ئەگەر تیرەی بۆریەکەی بۆ $\frac{1}{4}$ تیرە سەرەکیەکەی تەسك ببێتەوە ئایا:

أ . خێرایی ڕۆیشتن لەبەشە تەسکەکە چەندە؟

ب . پەستان لەبەشە تەسکەکە چەندە؟

**3.** ئاو دەدرێتە تەلارێك بە هۆی بۆریەکی سەرەکی ئاسۆییەوە کە تیرەکەی $6.0\ cm$ ، لەسەرەوەی بە بۆڕیەکی تر دەگەیەنرێت کە $2.0m$ لێوەی بەرزە و کۆتایەکەی بە بەلوعەیەکەوە بەستراوە کە تیرەکەی $2.0\ cm$ ئاودەکاتە دەفرێك کە فراوانیەکەی (قەبارەکەی) $2.5 \times 10^{-2}\ m^3$ و دەفرەکە بە $30.0\ s$ پڕدەبێت.

أ . خێرایی دەرچوونی ئاو لە بەلوعەکەوە چەندە؟

ب . پێوانەی پەستان لە بۆریە سەرەکیەکەدا چەندە؟

# پوختەی بەشی 3

## زاراوە بنەڕەتییەکان

| | |
|---|---|
| شلگاز | Fluid لا (52) |
| بارستە چڕی ماددە | Mass density لا (53) |
| هێزی پاڵنەر | Buoyant force لا (53) |
| پەستان | Pressure لا (59) |
| پلەی گەرمی | Temperature لا (65) |
| شلگازی نموونەیی | Ideal fluid لا (66) |

## بیرۆکە بنەڕەتییەکان

### بەندی 3-1 شلگاز و هێزی پاڵنەر

- شلگاز: ماددەیەکە توانای ڕۆیشتنی هەیە، بۆیە شێوەی دیاری کراوی نیە. شلەو گازەکان هەردووکیان شلگازن.
- هێزی پاڵنەر: ئەو هێزەیە کە ئاراستەی بەرەو سەرەوەیە کە شلگاز کاری پێدەکاتە سەر تەنێکی سەرکەوتە یان نقوم بوو تیایدا.
- بڕی هێزی پاڵنەر لەسەر تەنی نقوم بوو یان سەرکەوتە بە پێ ی دەستوری ئەرخەمیدس دیاری دەکرێ، وە یەکسانە بە کێشی شلگازی لادراو (کە تەنەکە شوێنی دەگرێتەوە).
- بڕی هێزی پاڵنەر لەسەر تەنی سەرکەوتە یەکسانە بە کێشی تەنە سەرکەوتەکە، چونکە تەنەکە هاوسەنگە.

### بەندی 3-2 پەستانی شلگاز وپلەی گەرمیەکەی

- پەستان پێوەرێکە بۆ بڕی ئەو هێزەی بەستونی کاری کردۆتە سەر ڕووبەرێکی دیاریکراو.
- بەپێی دەستوری باسکاڵ پەستانی سەربار لە دەفرێکی داخراودا بە یەکسانی و بێ کەمکردن دەگوێزرێتەوە بۆ هەموو خاڵەکانی شلگازو دیواری دەفرەکە.
- پەستانی شلگاز زیاد دەبێت بە زیادبونی قوڵیەکەی.

### بەندی 3-3 جووڵەی شلگازەکان

- شلگازەکان جووڵەیان بە شێوەی خشۆك (چینی) یا شێواو دەردەکەوێ.
- بەپێی هاوکێشەی بەردەوامی، بڕی شلگازی دەرچوو لە بۆریەکەوە لەکاتێکی دیاریکراودا هەمان بڕی شلگازەکەیە کە دەچێتە ناو بۆریەکە لە هەمان کاتدا.
- بەپێ ی دەستوری برنۆلّی شلگازە خێرا جولاوەکان پەستانێکی کەمتر پەیدا دەکەن لە چاو شلگازە هێواش جوولاوەکاندا.

**هێمای گۆڕاوەکان**

| بڕ | یەکە | گۆڕین |
|---|---|---|
| $\rho$ چڕی | $\frac{کگم}{م^3}$ kg /m³ | $1\ kg/m^3 = 10^{-3}\ g/cm^3$ |
| $P$ پەستان | Pa پاسکاڵ | $1\ Pa = 1\ N/m^2 = 10^{-5}\ atm$ |



# پێداچوونەوەی بەشی 3

## پێدابچۆرەوە و هەڵیسەنگێنە

## چڕی وسەر شلگاز کەوتن

### پرسیار دەربارەی چەمکەکان

**1.** گەر تۆپێکی پڕ هەوات لە گۆمێك ئاودا نقوم کرد ئینجا بەرەڵات کرد تۆپەکە بەرەو سەرەوە پاڵدەنرێت. هۆی چیە؟ بە بەکارهێنانی دەستوری ئەرخەمیدس ڕوونیبکەوە.

**2.** ئایا لە ئاو یان لە جیوەدا پارچە سەهۆڵێك زیاتر سەردەکەوێ؟ (**خشتەی 3-1** لاپەڕە 53 بەکاربهێنە).

**3.** سەهۆڵێکی شەش پاڵو نقومی کوپێك ئاو کرا ئایا ئاستی ئاوەکە چی بەسەر دێت لە ئەنجامی شلبوونەوەی سەهۆڵەکەوە؟

**4.** ئایا پاپۆڕ لە دەریاچەیەکی ئاوی سازگار یان لە زەریایەکدا زیاتر سەرئاو دەکەوێت؟

**5.** چڕی پۆڵا زیاترە لە چڕی ئاو چۆن سەرکەوتنی پارچەیەك پۆڵا لە ئاودا لێکدەدیتەوە؟

**6.** پارچە پۆڵایەکی بچووك بەسترا بە سەروی پارچە تەختەیەکەوە کاتێك پێکەوە دەخرێنە ئاوەوە دەبینین نیوەی بلۆکە تەختەکە نقوم بووە، ئەگەر هەر یەکەیان بە جیا بخرێتە ناو ئاو ئایا قەبارەی بەشی نقوم بوی تەختەکە زیاد دەکات یان کەم دەکات؟ یان وەکو خۆی دەمێنێتەوە؟

**7.** ماسیەك بەبێ جووڵە (وەستاو) لەناو سەتڵێك ئاودایە، لەسەر قەپانێك دانراوە وکێشەکەی پێورا، ئایا کێشەکەی دەگۆڕێت ئەگەر ماسیەکە دەست بە جووڵە بکات؟

### پرسیارەکانی ڕاهێنان

**8.** کێشی تەنێك 315 N لەهەوادا وە 265 N لەئاودا، وە 269 N لە زەیت دا، ئەمانە بدۆزەوە:

أ. چڕی تەنەکە.

ب. چڕی زەیت. (سەیری **نموونەی** 3 (أ) بکە)

**9.** کێشی پارچەیەك لە مادەیەکی نەزانراو 300.0 N لە هەوا،وە 200.0 N لە گیراوەیەکی کهولی دا کە چڕی یەکەی $0.70 \times 10^3$ kg/m³ . ئایا چڕی ماددەکە چەندە؟ (سەیری **نموونەی** 3 (أ) بکە).

## پەستان

### پرسیار دەربارەی چەمکەکان

**10.** لەکام باردا خشتەکێك بەرەنگاری پەستانێکی کەمتر دەبێ، کاتێك لەسەر بزمارێك دادەنرێت، یان لەسەر چەند بزمارێك دادەنرێت، باسی بکە.

**11.** ئەگەر بەهێواشی دەرزیەکی پۆڵا بەشێوەیەکی ئاسۆیی لەسەر ڕووی ئاو دابنرێت سەردەکەوێت، بەڵام گەر بە شێوەی شاوڵی دابنرێت نقوم دەبێت. هۆکەی باس بکە؟



**وێنەی 3-17**

**12.** تەلارێکی لولەکی (سایلۆ) کە دانەوێڵەی تێدایە بەچەند پشتێنەیەك دەورە دراوە وەك لە **وێنەی 3-17** دادیارە. بۆچی دووری نێوان پشتێنەکان کەمتر دەبێتەوە هەر چەندە لە بنکەی تەلارەکە نزیك بینەوە؟

**13.** کام بەنداو بەهێزترە: ئەو بەنداوەی $1.0 \times 10^5$ m³ ئاو دەگرێت لە قولایی 10 m یان ئەو بەنداوەی 1000 m³ ئاو دەگرێت لە قولایی 20 m ؟

**14.** بەپێ ی جووڵە بیردۆزی گازەکان ئەمانە ڕوون بکەرەوە:

أ. کشانی گاز بەگەرم کردن.

ب. ئەو پەستانەی گاز دروستی دەکا.

**15.** لەکاتی بەکارهێنانی قامیشی شلە هەڵمژیندا، پەستانی ناودەمت کەم دەبێت پەستانی هەوای دەرەوە پاڵ بە شلەکەوە دەنێت بۆ ناو قامیشەکە. ئایا دەتوانیت قامیشی شلە هەڵمژین بەکار بهێنی لەسەر هەیڤ؟

### پرسیارەکانی ڕاهێنان

**16.** پەستانی پەتی هەوای ناو هەر چوار تایەی ئۆتۆمبیل $2.0 \times 10^5$ Pa ئایا کێشی ئۆتۆمبیلەکە چەندە ئەگەر ڕووبەری بەرکەوتنی تایەکان بەزەوی $0.024$ m² .

**17.** پەستانی ئاو لە بۆرییەیەکدا $5.00 \times 10^5$ Pa زیاترە لە پەستانی هەوا. ئەگەر کونێك لە بۆرییەکە بکرێت بە تیرەی 4.00 mm وە بە هۆی بنێشتێکەوە کونەکە بگرین ئایا بڕی ئەو هێزە چەندە کە بنیشتەکە بەرگەی دەگرێت؟ (سەیری **نموونەی** 3 (ب) بکە).

**18.** لە **وێنەی 3-18** دا، تیرەی پەستێنەری A ‎0.64 cm‎ . وە تیرەی پەستێنەری B ‎3.8‎ cm . ئایا بڕی هێزی $\vec{F}$ پێویستە چەند بێت بۆ ئەوەی بەرگەی 500.00 N ، بگرێت بە فەرامۆشکردنی هێزی لێکخشان؟ (سەیری **نموونەی** 3 (ب) بکە).



**وێنەی 3-18**

**19.** ژێردەریایەك لە قولآی 250 m لە ئاوی دەریایەك جێگیر دەبێت.

أ. پەستانی پەتی لەو قولیەدا چەندە وا دابنێین چڕی ئاو $1.025 \times 10^3$ kg/m³ . وە پەستانی هەوا $1.01 \times 10^5$ Pa . (سەیری **نموونەی** 3 (ج) بکە).

ب. بڕی هێزی کارکردوە سەر پەنجەرەیەکی بازنەیی کە تیرەکەی 30.0 cm چەندە لە هەمان قولآیدا؟ (سەیری **نموونەی** 3 (ج) بکە).

## ڕۆیشتنی شلگاز

### پرسیار دەربارەی چەمکەکان

**20.** سەگە کێوییەکان لە کونێکی دوو دەرچەیی دا دەژین، بۆ ئاڵوگۆڕکردنی هەوا، سەگەکان تەپۆڵکەیەکی خۆڵ لەبەردەم یەکێك لە دەرچەکاندا دروست دەکەن، بەڵام دەرچەکەی تر بەکراوەیی بۆ هەوای نەجووڵاو لە ئاستی ڕووی زەوی دەهێڵنەوە. دەستوری برنۆلی بەکاربهێنە بۆ ڕوون کردنەوەی چۆنیەتی ڕۆیشتنی هەوا بۆ ناو ئەو کونە.

**21.** ئاو بەسەر ماڵاندا دابەش دەکرێت دوای ئەوەی کە لە تەنکی گەورەدا عەمبار کراوە تەنکیەکەش لە شوێنێکی بەرز دادەنرێت. لەبەرچی دەرچوونی ئاو لە بەلوعەی نهۆمی زەوی خێراترە وەك لە نهۆمەکانی سەرەوەدا؟

**22.** کاتێك کە فو لە بەشی سەرەوەی تۆپێکی سەرمێزدا بە هۆی قژ وشککەرەوەیەکی کارەباییەوە دەکرێت تێبینی دەکەین تۆپەکە بەرز دەبێتەوە و دەلەرێتەوە لە هەوادا ئەمە چۆن ڕوودەدات؟

### پرسیارکانی ڕاهێنان

**23.** جوتیارێك تێبینی کرد لە بن تانکیەکی ئاودا کە بۆ ئاودان ئامادە کراوە کونێك هەیە لەدوری 0.30 m خوار ئاستی ئاوەکە. خێرایی دەرچوونی ئاوەکە لە کونەکەوە چەندە ئەگەر زانیت تانکیەکە سەری کراوەیە. (سەیری **نموونەی** 3 (د) بکە).

**24.** سرنجێکی دەرزی لێدان کە لە وێنەی **3-19** دیارە دەرمانێکی شلی تێدایە کە چڕیەکەی یەکسانە بە چڕی ئاو وە ڕووبەری پانەبڕگەی پەستێنەرە لوولییەکەی $2.50 \times 10^{-5}$ m² وە ڕووبەری پانەبڕگەی دەرزیەکەی $1.00 \times 10^{-8}$ m² بێت لە کاتێکدا کە هێزی پەستێنەر لەسەر پەستێنەرەکە نەبێت ئەوکاتە پەستان لەهەموو شوێنەکان یەکسان دەبێت بە پەستانی هەوا کاتێك بەهێزی 2.00 N کار لە پەستێنەرەکە دەکرێت دەرمانەکە لە دەرزیەکەوە دەردەچێت، وادابنێ پەستانی ناو دەرزیەکە هەمان پەستانی هەوایە و سرنجەکە لەبارێکی ئاسۆییدایە وەخێرایی دەرچوونی شلەکە لە سرنجەکەوە هەمان خێرایی دەرچونی شلگازەکەیە لە دەرزی یەکەوە، خێرایی دەرچوونی شلەکە بدۆزەوە.



**وێنەی 3-19**

## پێداچوونەوەی گشتی

**25.** ئەندازیارێك هەندێك جیوەی کێشا کە چڕییەکەی $(\rho = 13.6 \times 10^3$ kg/m³$)$ بینی کێشەکەی 4.5 N نیوتن ئایا قەبارەکەی چەندە؟

**26.** بڕی ئەو هێزە چەندە کە پەستانی هەوا دەیخاتە سەر ڕووبەری 1.00 km² ی زەوی لە ئاستی ڕووی دەریادا؟

**27.** پیاوێك بارستاییەکەی 70.0 kg لەسەر کورسیەك دادەنیشێ کە بارستاییەکەی 5.0 kg وە کێشەکەی بە یەکسانی دابەش بووە بەسەر هەر چوار قاچی کورسییەکەدا وا دابنێ کە ڕووبەری بەرکەوتنی قاچی کورسیەکە لەگەڵ زەویدا بازنەییە وە نیوە تیرەکەی 1.0 cm ، ئەو پەستانە چەندە کە دەخرێتە سەر زەوی بەهۆی هەر قاچێکەوە؟

**28.** سییەکانی مەلەوانێك دەتوانێت $8.20 \times 10^{-4}$ m³ لە هەوا بگرێت کاتێك لە قوڵیەکی دیاری کراو لە دەریاچەیەکدا مەلە دەکات پەستانی پەتی هەوا چەندە لە قوڵی 10.0 m . ئەگەر زانیت پەستانی هەوا یەکسانی 95% ی پەستانی دەرەوەیە لە هەموو کاتەکاندا وە پەستانی هەوا $1.013 \times 10^5$ Pa وە چڕی ئاوی دەریاچەکە $1.00 \times 10^3$ kg/m³ (پلەی گەرمی نەگۆڕە)؟



وێنەی 20-3

**29.** ئەو بۆقەی کە لە **وێنەی 20-3** دا دیارە خەریکە سەر شلەی دەفرێکی نیوە گۆی دەکەوێت کە نیوە تیرەکەی 6.00 cm و شلەیەکی تێدایە کە چڕی یەکەی $1.35 \times 10^3$ kg/m³ . ئایا بارستایی بۆقەکە چەندە؟ وادابنێ قەبارەی بۆقەکە یەکسانە بە قەبارەی شلە لادراوەکە.

**30.** حەوزێکی مەلەی بازنەیی لەسەر ئاستی ڕووی دەریایە، بنکەکەی تەختە وە درێژی تیرەکەی 6.00 m تا بەرزایی 1.50 m . ئاوی تێکرا:

أ. پەستانی پەتی لەسەر بنکەکەی چەندە؟

ب. تێکرایی پەستانی پەتی چەند زیاد دەکات ئەگەر دووکەس سەرئاوی حەوزەکە بکەون، بارستایی هەردووکیان 150 kg بێ؟

**31.** بایەك بە خێرایی 30.0 m/s لەسەر سەربانی خانوویەك هەڵدەکات.

أ. وا دابنێ هەوای ناو خانووکە تا ڕادەیەك وەستاوە، ئایا جیاوازی نێوان پەستانی هەوای سەربانەکەو، وپەستانی هەوای ناوەوەی خانووکە چەندە؟

ب. بەرەنجامی ئەو هێزە چەندە کە ئەو جیاوازی پەستانە لەسەر ڕووبەری 175 m² پەیدای دەکات وە ئاڕاستەکەی چۆنە.

**32.** کیسێکی پڕ لە خوێن چڕی خوێنەکەی ناوی $1050^3$ kg/m . بەرزکرایەوە بۆ بەرزی 1.00 m سەرو ئاستی باسکی نەخۆشێك. پەستانی خوێن چەند زیاد دەکات لەسەر باسکی نەخۆشەکە لە ئەنجامی بەرزکردنەوەی کیسەکە تا ئەم ئاستە؟

**33.** بەشی نقوم بووی کەشتیەکی جەنگی 2.5 cm زیاد دەکات ئەگەر باربکرێت بە بڕی $1.0 \times 10^6$ N . ڕووبەری پانە برگەی ئەو کەشتیە بخەمڵێنە لەسەر ڕووی ئاوەکە. (سەیری **خشتەی 1-3** لاپەڕە 53 بکە).

**34.** دەفرێك بارستایەکەی 1.0 kg و 2.0 kg زەیتی تیایە کە چڕی یەکەی 916 kg/m³ یە و لەسەر تای تەرازوویەك دانراوە وەك لە **وێنەی 21-3** دا دیارە. پارچە ئاسنێك بارستایەکەی 2.0 kg بوو بە قەپانە سپرینگدارەکەوە هەڵواسراو بە تەواوەتی لەناو زەیتەکەدا نقوم کرا، ئایا خوێندنەوەی هەر یەکە لە قەپانە سپرینگدارەکەو تەرازووەکە چەندە؟ (سەیری **خشتەی 1-3** لاپەڕە 53 بکە).

21-3

**35.** کەڵەکێك لەدار دروست کراوە قەبارەکەی 0.60 m³ و چڕی یەکەی 600.0 kg/m³ . ڕووبەری بنکەکەی 5.7² m . ئایا بەرزی بەشی نقوم بووی لە ئاوێکی سازگاردا چەندە کە چڕی یەکەی $1.0 \times 10^3$ kg/m³ ؟

**36.** درێژی کتێبێکی فیزیا 26 cm و پانیەکەی 21 cm ئەستووریەکەی 3.5 cm.

أ. چڕیەکەی چەندە ئەگەر کێشەکەی 19 N بێت.

ب. ئەو پەستانە چەندە کە کتێبەکە دەیخاتە سەر مێزێك کاتێك لەسەر ڕووبەری ڕووە گەورەکەی دادەنرێت.

ج. ئەو پەستانە چەندە کە کتێبەکە پەیدای دەکات ئەگەر شاوڵیانە لەسەر ڕووبەرە هەرە بچووکەکە دابنرێت.

**37.** ئامێرێکی برێکی هایدرۆلیکی کەلە (**وێنەی 3-22** دیارە) پێك هاتووە لە دوو پەستێنەری لوولەی پەستێنەرە سەرەکیەکە ڕووبەرەکەی 6.40 cm² و پەستێنەرێکی برێك گرتن کە ڕووبەرەکەی 1.75 cm² هێزی لێکخشاندنی نێوان ڕووی ناوپۆشی لولەی برێکەکەو پەیکەکەی چەندە؟ ئەگەر بزانیت هاوکۆلکەی لێکخشاندنی نێوانیان 0.50 یە وە هێزی کارکراو لەسەر پایدەرەکە 44 N بێت.




**وێنەی 3-22**

**38.** بۆرییەکی گازی سروشتی تیرەکەی 0.250 m ، لەهەر چرکەیەکدا 1.55 m³ گازی لێوە دەردەچێت. ئایا خێرایی دەرچوونی گازەکە چەندە؟

**39.** پارچە سابونێك ئەستوریەکەی 2.0 cm سەر ئاو دەکەوێت، بەشی نقوم بووی سابونەکە 1.5 cm . بڕێك زەیت کرایە ئاوەکە کە چڕی یەکەی 900.0 kg/m³ ، ئاستی ڕووی سەرەوەی سابونەکە گەیشتە ئاستی ڕووی زەیتەکە. ئایا ئەستوری چینە زەیتە زیادکراوەکە چەندە؟

**40.** چڕی زەیت 930 kg/m³ لەبەر ئەوە سەر ئاو دەکەوێ. وە پارچە تەختەیەکی شێوە لاکێشەیی چڕیەکەی 960 kg/m³ وە ئەستوریەکەی 4.00 cm ، لە نێوان ئاو وزەیتەکەدا کە بە تەواوی داپۆشیوە سەر ئاو دەکەوێت، تا چ قوڵیەك لە ڕووە جیاکەرەوەکەی نێوان ئاو وزەیتەکەوە بنکەی پارچە تەختەکە نقوم دەبێت؟ (بەرزی بەشی نقوم بوو لە ئاوەکەدا چەندە).

**41.** پارچە تەختەیەك کێشەکەی لە هەوادا 50.0 N . ئەگەر نقوم کەرێکی پیا هەڵواسرا نقوم کەرەکە بە تەواوەتی لە ئاودا نقوم بوو، ئەوا کێشی پارچە تەختەکەو نقوم کەرەکە پێکەوە 200.0 N . بەڵام کە هەردووکیان لە ئاودا نقوم دەکرێت کێشەکەیان 140.0 N . چڕی پارچە تەختەکە بدۆزەرەوە؟

**42.** لە وێنەی **3-23** تانکیەکی ئاو دەردەکەوێت کە لەخوارەوەیدا زمانەیەك هەیە. ئایا بەرزترین بەرزایی چەندە کە ئاو دەیگاتێ لە لای ڕاستی تەنکیەکە؟ وا دابنێ $h = 10.0$ m و $L = 2.0$ m و $\theta = 30.0°$ ، ئەگەر زانیت کە ڕووبەری پانە بڕگەی $A$ زۆر گەورەترە لە ڕووبەری پانە بڕگەی $B$ .



وێنەی **3-23**

**43.** تێکڕایی 0.20 m³/s ئاو بە بۆریەکدا تێپەڕ دەبێت کە نیوەتیرەکەی 0.30 m وە پەستانەکەی یەکسانە بە پەستانی هەوا، وە بۆریەك بەرەوخوارەوە لار دەبێتەوە تاوەکو ئاو بداتە بۆریەیەکی تر کە 0.60 m لەلای خوارەوە دوورە، ونیوەتیرەکەی 0.15 m . ئایا پەستانی ئاوەکە لە بۆری دووەمدا چەندە؟

**44.** قەپانێکی سپرینگداری سووك نەگۆڕی جیری سپرینگەکەی 90.0 N/m بە شێوەیەکی شاوڵی جێگیرکراوە لەسەر مێزێك وەك لە **وێنەی 3-24** (أ). باڵۆنێك بارستایەکەی 2.00 g بە گازی هیلیۆم پڕکرا لە (1 atm ، 0°C) بۆ ئەوەی قەبارەکەی ببێتە 5.00 m³ ئینجا بەسترا بە سپرینگەکەو بووە هۆی زیادبوونی درێژیەکەی وەك لە وێنەی **3-24** (ب)، لە باری هاوسەنگیدا سپرینگەکە درێژیەکەی چەند زیاد دەکات؟ (سەیری خشتەی **3-1** بکە، و لەبیرنەکەی $F = k\Delta x$ ).



(أ) (ب) وێنەی **3-24**

**45.** ناوەندە ڕووبەری پانە بڕگەی شاخوێنبەری گەنجێك دەگاتە 2.0 cm² .

أ. تێکڕای ڕۆیشتنی خوێن لە خوێنبەرەکەدا چەندە بەیەکەی g/s ئەگەر خێرایەکەی 42 cm/s . ($\rho = 1.0$ g/cm³)

ب. وا دابنێ کە خوێنبەرەکە دەبێت بە چەند لقێکی بۆری خوێنی بچوك (بۆری موویین) کە کۆی ڕووبەری پانە بڕگەکانیان $3.0 \times 10^3$ cm² . ئایا خێرای جووڵەی خوێن چەندە لە بۆریە موویینیەکاندا.

**46.** تیرەی ناوەوەی شاخوێنبەر دەگاتە 1.6 cm وە هی بۆریە موویینیەکانیش دەگاتە $1.0 \times 10^{-6}$ m بە نزیکەی. وە تێکڕایی خێرایی ڕۆیشتن لە شاخوێنبەردا دەگاتە نزیکەی 1.0 m/s وە لە بۆریەکان 1.0 cm/s . ژمارەی بۆریە موویینیەکان بخەمڵێنە لە سوڕی خوێن دا وادابنێ ڕۆیشتنی خوێن لەناو بۆریەکاندا خشۆکانەیە.

**47.** جوتیارێك تانكیەكی ئاو پڕ دەكات كە درێژیەكەی 1.5 m وە پانیەكەی 65 cm وە قوڵیەكەی 45 cm ، بە هۆی سۆندەیەكەوە تیرەكەی 2.0 cm چەند كاتی پێویستە بۆ پڕكردنی. ئەگەر خێرایی ڕۆیشتنی ئاو لە سۆندەكەوە 1.5 m/s بێت.

**48.** گۆیەكی ناو بۆش بارستاییەكەی 1.0 kg وە نیوە تیرەكەی 0.10 m پڕكرا لە هەوا، لەوەستانەوە لە بنی حەوزێك كە قوڵی ئاوەكەی ناوی 2.0 m بەرەڵاكرا. تا چ بەرزیەك بۆ سەر ڕووی ئاوەكە گۆیەكە بەرز دەبێتەوە؟ لێكخشاندن و جووڵەی گۆیەكە فەرامۆش بكە كاتێك گۆیەكە بەشێكی لە ئاودا نقوم بووە.

**49.** سپرینگێكی سووك نەگۆڕەكەی 16.0 N/m جێگیركرا بە شاوڵی لە بنی دەفرێكی گەورەی پڕ لە ئاو وەك لە **وێنەی 25-3** (أ) دا دیارە. پارچە تەختەیەك بارستایەكەی $5.00 \times 10^{-3}$ kg وە چڕیەكەی 650.0 kg/m³ بە لای سەرەوەی سپرینگەكە بەسترا، ئامێرەكە (پارچە دار ـ سپرینگ) بەرەڵا كرا تا هاوسەنگ بێت، وەك لە **وێنەی 25-3** (ب) بە دیار دەكەوێ. ئایا درێژی سپرنگەكە چەند زیاد دەكات؟




(أ) (ب) **وێنەی 25-3**

## پرۆژە و ڕاپۆرتەكان

### هەڵسەنگاندنی بەجێهێنان

**1.** نەخشەی هایدرۆمەترێك دابرێژە (كە بۆ پێوانی چڕی شلگازەكانە) و لە دروستكردنیدا بۆڕییەكی تاقیگەی درێژ بەكاربهێنە لەگەڵ هەندێ لم لە بنكەكەی، وە دەمەوانەیەك كە دەست بەسەر بڕی لمی پێویستدا دەگرێت بۆ ئەوەی بۆڕیەكە زۆربەی شلەكان بە شێوەیەكی شاوڵی سەرخات. بۆڕیەكە پلە پلە بكە بەو شلانەی كە چڕیان زانراوە بە هۆی لەزگەیەكەوە كە هێماكانی لەسەر بێت. چڕی ئەو خۆراكە شلانەی خوارەوە بپێوە: شیرێكی چەوری لێ گیراو، شیری ئاسایی (كە هەموو ماددە بەهێزكەرەكانی تیا بێت) زەیتی ڕووەكی، دۆشاو، شیلەی شەكر. ئەنجامەكانت بە خشتەی هێڵی بەیانی كورت بكەرەوە.

**2.** ڕوونیبكەرەوە چۆن دەتوانی ئەو جیاوازیانەی كە لەپەستاندا ڕوودەدات بەكاربهێنیت بۆ پێوانی گۆڕان لە بەرزییەكاندا، وا دابنێ چڕی هەوا نەگۆڕە، وردی ئەنجامەكانی بارۆمەترەكەت چەندە بۆ ئەوەی 1 m جیاوازی لە نێوان بەرزییەكەی وبەرزی ڕاستەقینەی دوو تەلارو چیایەكدا هەبێت كە بەرزیەكانیان یەك لە دوای یەك 55 m و 255 m و 2200 m ؟

### هەڵسەنگاندنی دۆسیە

**3.** هەندێ نموونە تۆماربكە لەسەر پەمپی هەندێ لە ئامێرەكانی وەك ماتۆڕ وە هەندێ ئامێری تردا كە لە ماوەی هەفتەیەكدا لەوانەیە بەكاریان بهێنی. بەكورتی شێوەو كاركردنی ئەم پەمپانە وەسف بكە. ئینجا توێژینەوەیەك بكە لەسەر ئیش كردنی یەكێك لەم پەمپانە بە بەراوردكردنی لەگەڵ پەمپی ئاوی ئۆتۆمبیل وپەمپی هەوای پاسكیلدا. لەگەڵ هاوڕێكانت گفتوگۆ بكە دەربارەی ئەو زانیاریانەی دەست كەوت، بەهۆی زانراوەكانەوە نموونەیەكی بەیانی یان هێڵكاری بەیانی دروست بكە دراوەكانی كۆمەڵەكە كورتبكاتەوە.

# بەشی 4

# گەرمی

## *Heat*



ئەو باڵۆنەی لە وێنەکەدا دیارە بەکاردەهێنرێت بۆ ناردنی ئامرازە زانستیەکان، و ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکان لە بۆشایی ئاسماندا دەتوانرێت باڵۆنەکە بە سامپڵی سیستمێکی داینامیکی گەرمی ساکاردابنرێت بۆ نموونە لەوانەیە گۆڕانی پلەی گەرمی دەوروبەری باڵۆنەکە ببێتە هۆی ئاڵوگۆڕ کردنی وزە لە نێوان ئەو گازەی لە ناو باڵۆنەکەدایە وە ئەو هەوایەی دەوری باڵۆنەکەی داوە، ئاڵوگۆڕی وزەیەکە لە ڕێگەی گەرمییەوە ڕویداوە دەبێتە هۆی گۆڕینی وزەی ناوەکی باڵۆنەکە و ئەوانەی لەخۆی گرتووە.

## ئەوەی کە پێشبینی بەدیهێنانی دەکرێت

ئەوەی کە لەم بەشەدا فێری دەبیت جیاوازی کردنە لە نێوان پلەی گەرمی و بڕی گەرمی وە هەروەها کە چۆن ئاڵوگۆڕی وزە لە نێوان ماددەکاندا دەبێتە هۆی گۆڕانی پلەی گەرمی ماددەکان و گۆڕان لە دۆخەکەیاندا. هەروەها فێریش دەبێت کە چۆن ئاڵوگۆڕ کردنی وزە لە هەردوو ڕێگەی ئیش و گەرمییەوە دەبێتە هۆی گۆڕانی وزەی ناوەکی سیستمێك.

## ناوەڕۆکی بەشی 4

بەندی 1-4

# پلەی گەرمی و بڕی گەرمی
*Temperature and Heat*

## پێناسەی پلەی گەرمی و بڕی گەرمی

### 1-4 ئامانجەکان

- باسی ئەو گۆڕانکاریانەی لە پلەی گەرمی دوو تەندا ڕوو دەدات بۆ گەیشتن بە باری هاوسەنگی گەرمی.
- باسی ئەوە دەکات کە گەرمی بریتییە لەو وزەیەی لە نێوان دوو تەندا ئاڵوگۆڕ دەکرێت بە هۆی جیاوازی پلەی گەرمیانەوە.
- بڕی گەرمی و پلەی گەرمی هەست پێکراو وەجووڵەی تەنۆلکەکانی لە سەر ئاستی میکروسکۆبی بینراو بەیەکەوە دەبەستێت
- یاسای پاراستنی وزە جێبەجێ دەکات لەسەر ئەو گۆڕانانەی کە لە ماتەوزە و جوڵەوزە و وزەی ناوەکیدا ڕوودەدەن.

لە بەشی پێشوودا چەمکی پلەی گەرمی باسکرا لە ڕێگەی پلەی گەرمی گازەکانەوە، زۆرجار پلەی گەرمی بەبڕی ئەو ساردیە یان گەرمیەوە دەبەستینەوە کە بەدەست لێدانی تەنەکان هەستی پێ دەکرێت. زۆر جاریش پێدانی گەرمی یان وەرگرتنی گەرمی لە تەنێکەوە دەبێتە هۆی گۆڕانی پلەی گەرمییەکەی. پلەی گەرمی لەگەڵ جووڵە وزەی ئەو گەردو گەردیلانەوە کە ماددەکەیان لێپێکهاتووە ڕاستەوانە دەگۆڕێت.

بۆ پێوانی پلەی گەرمی وا دادەنێن کە پارچە سەهۆڵێك لە ناو کوپێك ئاودا دانرا، دوای چەند خولەکێك سەهۆڵەکە شلدەبێتەوە و پلەی گەرمی ئاوی ناو کوپەکە نزم دەبێتەوە لەو کاتەدا دەتوانێن بڵێن ئەو سیستەمەی لە سەهۆڵوئاوەکە پێکهاتبوو چووە باری **هاوسەنگی گەرمیەوە** thermal equilibruim لەوکاتەدا دەتوانرێت تەنهاباسی پلەی گەرمی ئەو سیستمە بکرێت لە بەرئەوە بیرۆکەی هاوسەنگی بنچینەیە بۆ پێوانی پلەی گەرمی کاتێك دەمانەوێت بە هۆی گەرمی پێوێك پلەی گەرمی تەنێك بپێوین گەرمی پێوەکە بە تەنەکەوە دەنوسێنینو تۆزێك چاوەڕێ دەکەین تا هاوسەنگی گەرمی دێتەدی، لەوکاتەدا خوێندنەوەی گەرمی پێوەکە پلەی گەرمی تەنەکە نیشان دەدات.

ئەوە بەبیر خۆمان بهێنینەوە کەوا چەند پێوەری جیاواز بۆ پلەی گەرمی هەیە گرنگترینیان پێوەری سیلیزی و فەهرەنهایتی و پێوەری پەتی (یان پێوەری گلڤن). بۆ گۆڕینی پێوەرێکیان بۆ ئەوەی تریان یەکێك لەم دوو پەیوەندیە بەکاردەهێنرێت.

**گۆڕین لە پێوەرێکەوە بۆ یەکێکی تر:**

$$T_K = T_C + 273.15 \qquad T_F = \frac{9}{5} T_C + 32.0$$

$T_F$ پلەی گەرمییە بە پێوەری فەهرەنهایتی

$T_C$ پلەی گەرمییە بە پێوەری سیلیزی

$T_K$ پلەی گەرمییە بە پێوەری گلڤن

**هاوسەنگی گەرمی**

ئەو بارەیە کە پلەی گەرمی دوو تەنی (بەریەککەوتوو) یان بەیەکەوە نوساو لە ڕووی فیزیاییەوە تێدا یەکسان دەبن.




**وێنەی 1-4**
وزەی گەرمی لەو تەنانەوە کەپلەی گەرمی یان بەرزە (وەك شەربەتی ناو قوتوەکە) دەچێت بۆ ئەو تەنانەی کە پلەی گەرمیان نزمترە ( وەك ئاوی سارد ).

## گەرمی و وزە Heat and Energy

لەوانەیە فیزیای گەرمی وا دەرکەوێت ئاسان نەبێت کاتێك لەسەر ئاستی وردبینی لێی بکۆڵرێتەوە چونکە تەنە گەرمەکان وەك سارد دەردەکەون بە بێ هیچ هۆیەکی ئاشکرا لە پێناو تێگەیشتنی فیزیای گەرمیدا دەبێت گرنگی بە ڕەفتاری گەرد و تەنۆلکەکان لە ناو ماددەکەدا بدەین، ئەوەی کەبەسەر تەنۆلکە ووردەکاندا دێت (ئەوانەی بەوورد بین دەبینرێن) ئەتوانرێت بە هۆی میکانیکەوە لێکبدرێتەوە، ئەوەش یارمەتیمان دەدات بۆ تێگەیشتنی ئەوەی بە چاو تێبینی دەکرێت (لەسەر ئاستی بینین). لەم وانەیەشدا گرنگی بە هەردوو ئاستەکە دەدرێت. ئەگەر قوتویەك لە خواردنەوە گازیەکان بکەوێتە ناو ئاوێکی ساردەوە وەك لە **وێنەی 4-1** دیارە ئەوا پلەی گەرمی قوتوەکە و خواردنەوەکەی ناوی دادەبەزێت و پلەی گەرمی ئاوەکەش بەرزدەبێتەوە تاوەکو یەکسان دەبن و دەچنە باری هاوسەنگی گەرمیەوە، وزە لە قوتوەکەوە بۆ ئاوەکە دەچێت چونکە پلەی گەرمییەکەیان جیاوازە ئەو جۆرە وزەیە کەلەم بارەدا دەگوێزرێتەوە پێیدەگوترێت گەرمی heat .

**گەرمی**

ئەو وزەیە کە لەنێوان تەنەکاندا دەگوازرێتەوە بە هۆی جیاوازی پلەی گەرمیەکەیانەوە.

## گواستنەوەی وزە بەشێوەی گەرمی

بەپێ ی تێڕوانینی بینراو بەچاو، وزە بە شێوەی گەرمی هەمیشە لەو تەنەوە کە پلەی گەرمییەکەی بەرزترە دەگوێزرێتەوە بۆ ئەو تەنەی کە پلەی گەرمییەکەی نزمترە دەتوانرێت ئەمە وەك ڕەوشتی میکانیکی تەنەکان دابنرێت کاتێك لەو شوێنەوە. کە ماتە وزەکەی زیاترە دەچن بۆ ئەو شوێنەی کە ماتە وزەکەیان کەمترە وەك ئەوەی کە پێنوسێك لەسەر کورسییەکەتەوە دەکەوێتە خوارەوە بۆ سەر زەوییەکەوە ناتوانێت لە زەوییەوە بگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی، بەهەمان شێوە وزە سەربەخۆ (لەخۆوە) لەو تەنەوە کە پلەی گەرمییەکەی بەرزترە دەچێت بۆ ئەو تەنەی کە پلەی گەرمییەکەی نزم ترە و هەرگیز بە پێچەوانە وە نابێت (ناڕوات). دەتوانین باسی ئەو ئاڕاستەیە بکەین کە وزەی گەرمی تێدا دەگوازرێتەوە لەسەر ئاستی ووردبینی (مایکروسکۆبی).

لەسەرەتادا تێکرای جووڵە وزەی تەنۆڵکەکانی قوتوە خواردنەوەکە زیاترە لە جوڵە وزەی تەنۆلکەکانی ئەو ئاوەی دەوری قوتوەکەی داوە وەك لە وێنەی **4-2** أ دا دیارە .

ئەم وزەیە لە خواردنەوەکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ قوتوەکە بە هۆی بەرکەوتنی گەردەکانی خواردنەوەکە بە گەردیلەکانی کانزای قوتوەکە بەوەش گەردیلەکانی کانزاکە خێراتر دەلەرنەوە بە هۆی بەرزبوونەوەی وزەکەیانەوە، بەمەش ئەو وزەیە لە قوتوەکەوە دەگوێزرێتەووە بۆ گەردەکانی ئاوەکە. وێنەی **4-2** ب لەگەڵ بەرە بەرە زیادبوونی وزەی گەردەکانی ئاوەکەدا وزەی گەردیلەکانی قوتو و خواردنەوەکەی ناوی بەرە بەرە کەم دەبێتەوە تاکو تێکڕای جووڵە وزەی گەردەکانی یەکسان دەبێت. وە لەوانەشە بڕێك ووزە لە گەردەکانی ئاوەکەوە کە وزەی کەمترە بەهۆی **بەریەککەوتنەوە** بگوێزرێتەوە بۆ گەردەکانی خواردنەوەکەو قوتوەکە، کە وزەکەیان زیاترە.




**وێنەی 4-2**
وزە بە شێوەی گەرمی لە گەردەوزە بەرزەکانەوە بۆ گەردەوزە نزمەکان دەگوێزرێتەوە.

کەواتە وزە دەتوانێت بەهەردوو ئاراستەکە بگوێزرێتەوە. لە بەر ئەوەی تێکرا جووڵە وزەی گەردیلەکانی ئەو تەنانەی پلەی گەرمیان بەرزترە زیاترە بۆیە ئەو وزەیەی کە لێوەی دەگوێزرێتەوە زیاترە لەو وزەیەی کە بۆی دەچێت و سەرئەنجام وزە بەشێوەی گەرمی دەگوێزرێتەوە تەنها بەیەك ئاراستە.

## گواستنەوەی گەرمی و گۆڕانی پلەی گەرمی

دەتوانین هاوسەنگی گەرمی بە پێ ی ئاڵوگۆڕکردنی وزە لە نێوان دوو تەندا کە پلەی گەرمیان وەك یەك بێت تێبگەین. کاتێك قوتوە شەربەتەکەو ئەو ئاوەی قوتوەکەی لەناو دایە لەهەمان پلەی گەرمی دا بن، وەك لە **وێنەی 4-3** دا دیارە، بڕی ئەو وزەیەی لە قوتوەکەوە بۆ ئاوەکە دەچێت یەکسانە بەو وزەیەی لە ئاوەکەوە بۆ قوتوەکە دەچێت بەوەش بەرەنجامی ئاڵوگۆڕکردنی وزە لە نێوان هەردوو تەنەکەدا یەکسان دەبێت بە سفر، لەوەی پێشەوە جیاوازی نێوان پلەی گەرمی و بڕی گەرمی دەردەکەوێت. گەردیلەی تەنەکان لە جووڵەیەکی بەردەوامدان ئەم جووڵەیەش **وزەی ناوەکی** internal energy دەدات بە هەموو تەنەکان. وە پلەی گەرمیش پێوەری ئەو وزەیەیە، بۆیە هەر تەنێك پلەی گەرمی دیاریکراوی خۆی هەیە. بەڵام بڕی گەرمی ئەو وزە ئاڵوگۆڕ کراوەی نێوان دوو تەنە کە بەهۆی جیاوازی نێوان پلەی گەرمییانەوە ڕوودەدات. هەر کاتێك جیاوازی لە نێوان پلەی گەرمی تەنێك و دەوروبەرەکەیدا نەبێت وزەی ئاڵوگۆڕکراویش بە شێوەی گەرمی نیە. وزەی ئاڵوگۆڕ کراو بە شێوەی گەرمی لەسەر جیاوازی نێوان پلەی گەرمی تەنەکان بەندە، لەبەر ئەوە هەتا ئەو جیاوازیە زیاتر بێت وزەی ئاڵوگۆڕ کراویش بە شێوەی گەرمی زیاتر دەبێت. بۆ نموونە لە وەرزی زستاندا وزە بە شێوەی گەرمی لە ڕووی ئۆتۆمبێلێکەوە کە پلەی گەرمی یەکەی 30°C بێت بۆ دڵۆپە بارانێکی سارد دەچێت کە پلەی گەرمی یەکەی 5°C بێت، بەڵام لە وەرزی هاویندا وزە لە ڕووی ئۆتۆمبێلێکەوە کە پلەی گەرمی یەکەی 45°C بێت بۆ ئەو دڵۆپە بارانە شلەتێنە دەچێت کە پلەی گەرمی یەکەی 20°C لەبەرئەوەی لە هەردوو بارەکەدا جیاوازی پلەی گەرمی یەکسانە بە 25°C بۆیە وا چاوەڕوان دەکرێت کە وزەی ئاڵوگۆڕکراویش یەکسان بێت. **وێنەی 4-4** .

هەریەکە لە چەمکەکانی بڕی گەرمی و پلەی گەرمی دەتوانن هۆی ئەوە لێکبدەنەوە کە بۆچی بەدوو شێوەی جیاواز هەست دەکەی کاتێك دەست دەخەیتە ناو دوو قاپی جیاوازەوە کەیەکێکیان ئاوی گەرم و ئەوەی تریان ئاوی ساردی تێدابێت، هەر کاتێکیش ئەم دوو ئاوە بکرێتە یەك قاپەوە ئاوێکی شلەتێنمان دەست دەکەوێت دەمارەکانی بەشی سەرەوەی پێستی دەستت هەست بەو ئاڵوگۆڕکردنەی گەرمی دەکەن کە لە نێوان لەشی تۆو تەنەکاندا ڕوئەدات، کاتێك پلەی گەرمیان جیاوازە، ئەگەر یەکێك لە دەستەکانت لە باری هاوسەنگیدا بێت لەگەڵ ئاوی سارددا، ئەوا لە چینی دەرەوەی پێستی دەستەوە وزەیەکی زیاتر دەچێت بۆ ئاوەکە لە چاو ئەو وزەیەدا کە خوێن دەیداتەوە بە دەستت کە پلەی گەرمی خوێنەکە 37.0°C یە. کاتێك ئەو دەستە دەگوێزرێتەوە بۆ ئاوێکی شلەتێن، کە پلەی گەرمی یەکەی لە ساردەکە زیاترە ئەوا گەرمییەکی زیاتر لە ئاوە شلەتێنەکەوە بۆ دەستت دێت وە ئەو دەستەی تریان کە لە ئاوە گەرمەکەدا بووە و وزەی لێوە وەرگرتووە وزە گەرمییەکە دەداتە ئاوە شلەتێنەکە کاتێك دەستت دەخەیتە ناوی.

## یەکەی پێوانی بڕی گەرمی

پێش ئەوەی زانایان بگەنە دانانی ئەم شێوازەی ئێستای گەرمی چەندەها یەکەی جیاوازی پێوانیان بۆ دانابوو ئەو یەکانەش تائێستا بە شێوەیەکی فراوان بەکاردێت وەك لە خشتەی **4-1** دا دیارە و لەبەر ئەوەی گەرمی وەك ئیش شێوەیەکە لە شێوەکانی ئاڵوگۆڕکردنی وزە بۆیە دەتوانین هەموو جۆرە یەکەکانی تر بۆ (جول) بگۆڕین کە ئەویش یەکەی پێوانی وزەیە لە سیستمی نێودەوڵەتیدا ( SI ).




**وێنەی 4-3**
لەباری هاوسەنگی گەرمی دا بەرئەنجامی ئاڵوگۆڕی وزە لە نێوان دوو تەندا یەکسانە بە سفر.

**وزەی ناوەکی**
ئەو وزەیەیە کە لە جووڵەی هەڕەمەکی تەنۆلکەکانی ماددەوە پەیدا دەبێت، وە دەکاتە کۆی وزەی هەموو تەنۆلکەکان.




**وێنەی 4-4**
گەرما وزەی ئاڵوگۆڕکراو لە نێوان ڕووی ئۆتۆمبێلەکە و دڵۆپە بارانەکاندا هەروەك ئەوە وایە کە لە پلە گەرمییە نزمەکاندا ڕوودەدات (أ) وە پلە گەرمییە بەرزەکان (ب)، بەمەرجێك جیاوازی پلەی گەرمی نەگۆڕ بێت.

خشته 1-4 یەكەكانی گەرمی بە جول

| یەكەی گەرمی | بڕە هاوتاكەی | بەكارهێنانەكانی |
| --- | --- | --- |
| جول ( J ) | $1\ kg\cdot\left(\frac{m^2}{s^2}\right)$ | یەكەی وزەیە لە سیستمی SI |
| كالۆری ( cal ) | 4.186 J | یەكەی گەرمیە لە سیستمی SI دا نی یە، كیمیای و فیزیایە كۆنەكان بەكاریان هێناوە |
| كیلۆ كالۆری kcal | $4.186 \times 10^3$ J | یەكەی پێوانی گەرمیە لە سیستمی SI دا نی یە |
| گەرمۆكەی خۆراكی | $4.186 \times 10^3$ J = 1 kcal | زانستی خۆراك |
| یەكەی گەرمی بەریتانی Btu | $1.055 \times 10^8$ J | یەكەیەكی بێوانی گەرمی بەریتانیی‌یە لە بوارەكانی ئەندازە و ساردكردنەوەو گەرم كردنا بەكاردێت. |

لەبەرئەوەی كە بۆ هەر جۆرێك لە جۆرەكانی وزە هێمای جیاكەرەوەی خۆی هەیە، بۆ نموونە $PE$ بۆ ماتە وزە $KE$ بۆ جووڵە وزە $U$ بۆ وزەی ناوەكی $W$ بۆ ئیش. بۆ گەرمیش هێمای $Q$ دادەنێین.

## گەرمی و ئیش Heat and Work

بە چەكوشێك بزمارێك بە پارچە تەختەیەكدا دابوكتە، دوای چەند خولەكێك بزمارەكە لە تەختەكە دەربهێنەو دەستی لێدە دەبینیت گەرمە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە گەرمی لە بزمارەكەوە بۆ دەستت چووە بۆ دەرهێنانی بزمارەكە ئیشێك كراوە، بزمارەكەش تووشی لێكخشاندنی دەبێ لە گەڵ تەختەكە، بەشی زۆری ئەو وزەیە كە پێویستە هەبێت بۆ زاڵ بون بەسەر لێكخشاندنەكەدا دەگۆڕێت بۆ وزەی ناوەكی، زۆربونی وزەی ناوەكیش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی بزمارەكە، وەجیاوازی نێوان پلەی گەرمی بزمارەكەو دەستت دەبێتە هۆی ئەوەی كە وزە بە شێوەی گەرمی لە بزمارەكەوە بچێت بۆ دەستت.

لێكخشاندن یەكێكە لەو رێگایانە كە وزەی ناوەكی تەنەكانی پێ زیاد دەكات. لە باری تەنە رەقەكاندا دەكرێ گۆڕینی شێوەش ببێتەوە هۆی زیادبوونی وزەی ناوەكی تەنەكە وەك لەكاتی راكێشانی پارچە لاستیكێك یان لە كاتی قەدكردنی پارچە كانزایەكدا.

چالاكییەكی كرداری
**خێرا**

### ئیش و گەرمی

#### كەرەستەكان

✓ پارچە لاستیكێك پانیەكەی لە نێوان 7 mm و 10 mm دابێت.


**رێنمایی سەلامەتی**

بۆ ئەوەی پارچە لاستیكەكە نەپچڕێت لە چەند سینتیمترێك زیاتر رایمەكێشە، وە هەروەها لاستیكە راكێشراوەكە ئاراستەی كەس مەكە هەردوو سەری پارچە لاستیكەكە بە هەردوو پەنجە گەورەكەت بگرەو پلەی گەرمی

ناوەڕاستەكەی بە لێوەكانت هەست پێ بكە، هەردوو سەری بەخێرایی ڕابكێشەو جارێكی تر بە لێوەكانت، هەست بە گەرمیەكە بكە بزانە ئایا پلەی گەرمی یەكەی گۆڕاوە، لەوانەیە بۆ ئەوەی گۆڕانێكی بەرچاو لە پلەی گەرمی لاستیكەكەدا ڕوبدات دەبێت چەند جارێك كردارەكە دووبارە بكەیتەوە.

## پاراستنی وزەی گشتی

کاتێك گفتوگۆ لەسەر بیرۆکەی وزەی میکانیکی دەکرێت، لە کاتی ڕوداني لێکخشاندن لە نێوان تەنەکاندا هەموو ئیشەکە نابێت بە وزەی میکانیکی. جووڵە وزەش هەمیشە بە شێوەی جووڵەوزەی تەواو نامێنێتەوە لە کاتی بەریەککەوتنە ناجیرەکاندا بەڵکو بەشێك لەم وزەیە هەڵدەمژرێت و دەبێتە وزەی ناوەکی تەنەکان، لە بەر ئەوەیە لە کاتی دەرهێنانەوەی بزمارەکەدا بزمارەکە و کونی تەختەکە کەمێك گەرم دەبن، بە بەرچاو گرتنی گۆڕانەکانی وزەی ناوەکی و گۆڕانەکانی وزەی میکانیکی ئەوا وزە بەشێوەیەکی گشتی پارێزراو دەبێت.

**پاراستنی وزە**

$$\Delta PE + \Delta KE + \Delta U = 0$$

$\Delta$ ماتە وزە + $\Delta$ جووڵە وزە + $\Delta$ وزەی ناوەکی = 0

## نموونە 4 (أ)

### پاراستنی وزە

**پرسیارەکە**



ئەو وێنەیەی لە تەنیشتەوەیە تاقیکردنەوەیەك ڕووندەکاتەوە لێکچووی ئەو تاقیکردنەوەیە کە بۆ ڕونکردنەوەی پاراستنی وزە بەکارهێنراوە. جووڵەی ڕەوڕەوە پەرەکە دارەکان لەناو ئەو دەفرەدا کە پڕە لەئاو بەهۆی ئەو سەنگانەوە دەبێت کە بەرەوخوار دەجولێن ئەوەش دەبێتە هۆی گەرم کردنی ئاوەکەو زیادکردنی وزە ناوەکیەکەی بەوەش پلەی گەرمی ئاوەکە بەرزدەبێتەوە. ئەوەش بەڵگەی بەرزبوونەوەی ووزەی ناوەکییەکەیەتی ئەگەر بارستایی سەنگەکە 11.5 kg بێت و لادانی 1.3 m دابەزێت و هەموو وزە میکانیکیەکە بگۆڕێت بۆ وزەی ناوەکی ئایا وزەی ناوەکی ئاوەکە چەند زیاد دەکات؟ (وادابنێ کە هیچ وزەیەك لە دەفرەکەوە بۆ دەوروبەر ناچێت وە بە پێچەوانەش)

**شیکار**

**1. دەزانم**

دراو: $m = 11.5$ kg $\quad h = 1.3$ m $\quad g = 9.81$ m/s$^2$

نەزانراو: $\Delta PE = ?\quad \Delta EK = ?\quad \Delta U = ?$

**2. پلان دادەنێم**

هاوكێشەیەك (یان چەند هاوكێشەیەك) هەڵدە بژێرم، یاسای پاراستنی وزە بەم شێوەیە دەنوسم، وزەی گشتی سەرەتایی یەکسانە بە وزەی گشتی کۆتایی لەبەر ئەوەی سیستەمەکە بە گشتی جووڵە وزەی نییە لەسەرەتای هاتنە خوارەوەی تەنەکە یان لەکاتی وەستانیدا، هەریەك لە $KE_i$ و $KE_f$ سفرە و لەبەرئەوەی هەموو ماتەوزەکە گۆڕا بۆ وزەی ناوەکی بۆیە $PE_i$ دەکاتە $mgh$ کاتێك $PE_f$ سفرە.

$$\Delta PE + \Delta KE + \Delta U = 0$$
$$PE_i + KE_i + U_i = PE_f + KE_f + U_f$$
$$PE_i = mgh$$
$$PE_f = 0$$
$$KE_i = 0$$
$$KE_f = 0$$
$$mgh + 0 + U_i = 0 + 0 + U_f$$
$$\Delta U = U_f - U_i = mgh$$

بیرۆکەی بەسوود: ئەوەت لە بیر بێت هەر گۆڕانێك لە بڕێکدا نیشانەی ( $\Delta$ )ی بۆ دادەنرێت یەکسانە بەبڕی کۆتایی کەم (−) بڕی سەرەتایی. بۆ نموونە. $\Delta u = u_f - u_i$

**3. هەژماردەکەم**

نرخەکان لە هاوکێشەکەدا دادەنێم.

$$\Delta U = (11.5\text{ kg})(9.81\text{ m/s}^2)(1.3\text{ m})$$
$$= 146.6595\text{ J}$$
$$\boxed{\Delta U = 147\text{ J}}$$

**وەڵامی ئامێری ژمێرەر**

لەبەر ئەوەی کەمترین ژمارەی ڕەنوسە واتاییە دراوەکان تەنها دوانن لەبەر ئەوە دەبێت وەڵامی ئامێرە ژمێرەرەکە 146.6595 J بۆ دوو ڕەنووسی واتایی نزیك بخەینەوە کە ئەویش 147 J .

**4. هەڵدەسەنگێنم**

دەتوانیت وەڵامەکە بخەملێنیت بەنزیك کردنەوەی نرخەکانی $m$ و $g$ بەم شێوەیە $m \approx 10$ kg و $g \approx 10$ m/s$^2$ بەوەش $\Delta U \approx 130$ J ئەمەش لە نرخە ڕاستییە هەژمارکراوەکە وە نزیکە کە دەکاتە 147 J .

## ڕاهێنانی 4 (أ)

### پاراستنی وزە

1. لەو وێنەیەی نموونەی 4 (أ) دا ئەگەر بارستایەکەی دەرەوە لادانی 6.69 m دابەزێت ئایا وزەی ناوەکی ئاوەکە چەند زیاد دەکات.

2. کرێکارێك پوازێکی بارستای 0.500 kg ی بە پارچە تەختەیەکدا داکوتا بەهۆی چەکوشێکەوە کە بارستایەکەی 2.50 kg چەکوشەکە بەخێرایی 65.0 m/s بە پوازەکەدا دەکێشێت ئەگەر سێ یەکی وزەی چەکوشەکە بگۆڕێت بۆ وزەی ناوەکی لە هەریەکە لە چەکوش و پوازەکەدا ئایا ئەو زیادبونەی لە وزە ناوەکیەکەدا ڕوودەدات چەندە؟

3. پارچە دراوێکی لەمس دروستکراو کە بارستایەکەی $3.0 \times 10^{-3}$ kg لە بەرزی 50.0 m وە کەوتە سەر زەوی، ئەگەرلە 65 % ماتەوزە سەرەتایەکە بگۆڕێت بۆ وزەی ناوەکی لە پارچە دراوەکەدا ئایا وزەی ناوەکی چەند زیاد دەکات؟

4. بۆ بەرزکردنەوەی پلەی گەرمی 0.25 kg ئاو بە بڕی 0.2ºC پێویستمان بەوزەیەکی ناوەکی دەبێت کە بڕەکەی 209.3 J ئایا دەبێت بە چ خێرایەك گۆیەك کە بارستایەکەی 0.25 kg بهاوێژرێت بە جۆرێك کە جووڵە وزەکەی یەکسان بێت بە وزەی ناوەکی پێویست.

## پێداچوونەوەی بەندی 1-4

1. دەفرێك ئاو لە پلەی گەرمی ژورێکدایە بۆ ماوەیەکی کەم لە ناو بەفرگرەیەکدا دانرا، دەفرێکی هاوشێوەی ئەو لەبەر تیشکی خۆرەوە هەڵگیراو کرایە ناو بەفرگرێك بۆ هەمان کات، ئایا دەبێت چی بزانیت بۆ ئەوەی ئەوە دیاری بکەی کەلە چ بارێکییاندا وزەیەکی زیاتر ئاڵوگۆڕ کراوە

2. تێڕوانینی مایکرۆسکۆپی بۆ بڕی گەرمی و پلەی گەرمی بەکاربهێنە بۆ ڕون کردنەوەی ئەوەی بۆچی بە (فو) تێکردن دەستت گەرم دەبێتەوە کەچی بە فو لێکردن شوربا سارد دەبێتەوە.

3. ئەگەر دەفرێکی پڕ لە ئاو زۆر بەخێرایی بجوڵێنرێت، ئایا جوڵەوزە ناوەکییەکەی ئاوەکە دەگۆڕێت؟ بۆچی؟

بەندی 2-4

# گۆڕان لە پلەی گەرمی و گۆڕان لە دۆخدا

## *Changes in Temperature and Phase*

### 2-4 ئامانجەکان

- هەڵدەستێت بە چەند کردارێکی ژمارەیی دەربارەی فراوانی گەرمی تایبەتی.
- هەڵدەستێت بە چەند کردارێکی ژمارەیی دەربارەی ماتە گەرمی.
- ناوچە جیاوازەکانی چەماوەی گەرمی لێکدەداتەوە



**وێنەی 5-4**
ئاوی حەوزەکە و هەوای دەوری حەوزەکە وزە لە خۆرەوە وەردەگرن بەڵام پلەی گەرمی هەواکە زیاتر بەرز دەبێتەوە وەك لە پلەی گەرمی ئاوەکە.

## فراوانی گەرمی تایبەتی

## specific heat capacity ($c_p$)

لەوانەیە لە ڕۆژێکی گەرمدا سەرەنجی هەوای دەوری حەوزێکی مەلەکردنت دابێت وێنەی 4-5 هەست دەکەیت هەوای دەوری حەوزەکە گەرمە، بەڵام ئاوی حەوزەکە ساردە لەوانەیە ئەوەت لا ڕون نەبێت، چونکە هەریەکە لە هەوا و ئاوەکە وزە لە خۆرەوە وەردەگرن. لەوانەیە ساردی ئاوەکە لە چاو هەواکەدا بەشێکی بگەڕێتەوە بۆ کرداری بەهەڵم بوون، چونکە بە هەڵم بوون کرداری ساردکردنەوەیە. بەڵام ماددەکان سیفەتێکیان هەیە وایان لێ دەکات کە پلەی گەرمیان جیاواز بێت هەر چەندە هەمان وزە وەربگرن یا هەمان ووزە بدەن.

ئەکرێ باسی ئەو سیفەتەی مادە بکەین بە پێی جووڵەی گەرد و گەردیلەکانی، کە کاردەکاتە سەر بڕی گۆڕانی پلەی گەرمی ماددەکە کاتی پێدانی یان وەرگرتنی بڕێکی دیاری کراو لە ووزە . هەر ماددەیەك بڕێکی دیاری کراوی لە ووزە پێویستە

بۆ بەرزکردنەوەی پلەی گەرمی 1 kg لە ماددەکە، بەبڕی 1°C ئەو بڕە گەرمییەش پێی دەگوترێت **فراوانی گەرمی تایبەتی** ماددەکە **specific heat capacity** (یان گەرمی تایبەتی) کە بارستایی مادده و گۆڕان لە پلەی گەرمی مادەکە و بڕی گەرمی پێویستی ئاڵو گۆڕ کراو بەیەکەوە دەبەستێتەوە. بەم شێوەیەی خوارەوە:

$$\text{فراوانی گەرمی تایبەتی} = \frac{\text{وزەی گەرمی ئاڵو گۆڕکراو}}{\text{بارستایی} \times \text{گۆڕان لەپلەی گەرمیدا}}$$

$$c_p = \frac{Q}{m \,.\, \Delta T} \qquad \therefore\; Q = c_p \,.\, m \,.\, \Delta T$$

پیتی $p$ بۆ فراوانی گەرمی تایبەتی بەکار هێنراوە کە لە ژێر پەستانێکی نەگۆڕدا پێوراوە ئەمەش مەرجێکی گرنگە بۆ دیاری کردنی سیفەتە گەرمییەکانی ماددە گازییەکان کە گۆڕانی پەستان کاریان تێدەکات زیاتر لە ماددە ڕەق و شلەکان، بڕوانە گۆڕانی 1°C لە پلەی گەرمی یەکسانە بەبڕی 1K بەوەش گۆڕانەکانی پلەی گەرمی $\Delta T$ لە هەردوو پێوەرەکەدا یەکسان دەبن.

ئەو تەنانەی کە گەرمی لە ناوەندی دەورووبەر دەمژن هاوکێشەی فراوانی گەرمی تایبەتیان لەسەر جێبەجی دەکرێت، هەروەها بۆ ئەو تەنانەش کە گەرمی دەدەن بە ناوەندی دەوروبەر. نیشانەی $\Delta T$ وە $Q$ پۆزەتیڤ دەبێت کاتێك گەرمی لە دەوروبەر وەردەگرێ وە پلەی گەرمیان بەرز دەبێتەوە، نیشانەکەش نێگەتیڤ دەبێت کاتێك گەرمی بەناوەندی دەوربەر ئەدەن و پلەی گەرمیشیان نزم دەبێتەوە.

**فراوانی گەرمی تایبەتی $c_p$**

بڕی گەرمی پێویستە بۆ بەرزکردنەوەی پلەی گەرمی 1 kg لە ماددەیەك بە بڕی 1°C بە جێگیربوونی پەستان.

| ماددەکان | $c_p(J/kg\cdot°C)$ | ماددەکان | $c_p(J/kg\cdot°C)$ |
|---|---|---|---|
| ئەلەمنیۆم | $8.99 \times 10^2$ | قورقوشم | $1.28 \times 10^2$ |
| مس | $3.87 \times 10^2$ | جیوە | $1.38 \times 10^2$ |
| شووشە | $8.37 \times 10^2$ | زیو | $2.34 \times 10^2$ |
| زێر | $1.29 \times 10^2$ | هەڵم | $2.01 \times 10^3$ |
| سەهۆڵ | $2.09 \times 10^3$ | ئاو | $4.186 \times 10^3$ |
| ئاسن | $4.48 \times 10^2$ | | |

**خشتەی 2-4** فراوانی گەرمی تایبەتی هەندێك لە ماددەکانە

## دیاری کردنی فراوانی گەرمی تایبەتی:

بۆ پێوانی فراوانی گەرمی تایبەتی ماددەیەکی دیاریکراو دەبێت هەریەکە لە بارستایی، گۆڕانی پلەی گەرمی، وزەی گەرمی ئاڵوگۆڕ کراو، بپێورێت، دەتوانین بارستایی و پلەی گەرمی ڕاستەوخۆ بپێوین، بەڵام پێوانی بڕی گەرمی کارێکی گرانە و لەبەر ئەوەی فراوانی گەرمی تایبەتی ئاو زۆر بەوردی زانراوە $(4.186\ kJ/kg\cdot°C)$ بۆیە ئەتوانیت وزەی گەرمی ئاڵوگۆڕ کراو لە نێوان بڕێکی دیاریکراو ئاوو تەنێکدا کە فراوانی گەرمی تایبەتیەکەی نەزانراوبێ بە ئاسانی بپێورێت ئەگەر تەنێکی گەرم لە دەفرێکی جیاکراوە لە گەرمی کە ئاوی ساردی تێدابێت دابنرێت، ئەوا بە پێ ی یاسای پاراستنی وزە، بڕی ئەو گەرمیەی تەنەکە ونی دەکات یەکسانە بە بڕی ئەو گەرمیەی ئاوەکە وەریدەگرێت، هەرچەندە بڕێك لەو گەرمیە دەچێتە ئەو دەفرەی کە ئاوەکەی تێدایە بەڵام برەکەی زۆر کەمە، فەرامۆش دەکرێت. دەتوانین یاسای پاراستنی وزە بۆ مەبەستی پێوانی فراوانی گەرمی تایبەتی $c_{p,x}$ بۆ مادەیەك بە کارهێنرابێت کە بە پیتی $x$ هێما دەکرێت).

بڕی گەرمی وەرگیراوی ئاوەکە = بڕی گەرمی وون بووی ماددەکە

$$Q_x = Q_w$$

$$c_{p,x} m_x \Delta T_x = c_{p,w} m_w \Delta T_w$$

ئەو گەرمیەی کە تەنێك وەردەگرێت بە پۆزەتیڤ دای دەنێین وە ئەو گەرمیەی کە تەنێك دەیدات بە نێگەتیڤ دایدەنێین. دەتوانین نیشانە نێگەتیڤەکەش فەرامۆش بکەین ئەگەر هەریەکە لە $\Delta T_x$ و $\Delta T_w$ بە شێوەیەك بنوسین کە جیاوازی نێوان پلە گەرمیە بەرزەکەو پلە گەرمیە نزمەکە بێت لەبەر ئەوە دەبینیت کە $\Delta T$ هەمیشە پۆزەتیڤ دەبێت لە بەکارهێنانی هاوکێشەکەی پێشوودا. ئەم ڕێگەیەی دیاریکردنی فراوانی گەرمی تایبەتی ماددەیەك پێی دەگوترێت **پێوانی بڕی گەرمی** calorimetry ئەو دەفرانەش کە بۆ پێوانەکان بە کاردێت پێیان دەگوترێت گەرمۆکە پێوەکان. گەرمۆکەپێو گەرمی پێوێکی تێدایە کە دوا پلەی گەرمی دەپێوێت واتە لەو بارەدا کە تەنەکان لە باری هاوسەنگی گەرمیدابن هەروەها تێکۆدەرێکی تێدایە بۆ ئەوەی وزە گەرمیەکە بە یەکسانی بە هەموو بەشەکانی ئاوەکەدا بڵاو بکاتەوە.

**پێوانی گەرمی**

ڕێگەیەکی تاقیگەییە بەکار دەهێنرێت بۆ پێوانەکردنی وزەی گەرمی ئاڵوگۆڕ کراو لە نێوان دووتەنەدا




**وێنەی 4-6**

**کالۆری میتەر** گەرمۆکە پێوێکی سادەیە بۆ پێوانی فراوانی گەرمی تایبەتی ماددەیەك.

## نموونە 4 (ب)

### پێوانی گەرمی

**پرسیار**

برغوویەکی لە ئەلەمنیۆم دروستکراو کە بارستاییەکەی **0.050 kg** گەرم کرا بۆ پلەیەکی گەرمی سەرەتایی نەزانراو خرایە ناو گەرمۆکە پێویکەوە کە **0.15 kg** ئاوی تێدایە لە پلەی گەرمی سەرەتایی **21.0ºC** بەوەش دوا پلەی گەرمی کۆمەڵەکە بووبە **25.0ºC** ، ئایا سەرەتا پلەی گەرمی برغووەکە چەند بووە ئەگەر بزانیت فراوانی گەرمی تایبەتییەکەی **899 J/kg•ºC** (ئەو گەرمییەی کە گەرمۆکە پێوەکە وەریدەگرێت فەرامۆشبکە).

**شیکار**

**1. دەزانم**

دراو:

$m_{\text{ئەلەمنیۆم}} = m_m = 0.050\ \text{kg}$ $\qquad c_{p,m} = 899\ \text{J/kg•ºC}$

$m_{\text{ئاو}} = m_w = 0.15\ \text{kg}$ $\qquad c_{p,w} = 4186\ \text{J/kg•ºC}$

$T_{\text{ئاو}} = T_w = 21.0\text{ºC}$ $\qquad T_{\text{کۆتایی}} = T_f = 25.0\text{ºC}$

نەزانراو:

$T_{\text{کانزا}} = T_m = ?$

وێنە: پێش دانانی تەنە گەرمەکە لەناو گەرمۆکە پێوێکدا — دواى گەیشتن بەباری هاوسەنگی





$m_m = 0.050\ \text{kg}$ $\qquad m_w = 0.15\ \text{kg}$ $\qquad T_w = 21.0\text{ºC}$



$T_f = 25.0\text{ºC}$

**2. پلان دادەنێم**

**یاسایەك هەڵدەبژێرم:** ئەو گەرمییەی برغووەکە ونی دەکات یەکسان بێت بەو گەرمییەی ئاوەکە وەریدەگرێت.

بڕی گەرمی وەرگیراوی ئاوەکە = بڕی گەرمی ون بوی ئەلەمنیۆمەکە

$$c_{p,m} m_m \Delta T_m = c_{p,w} m_w \Delta T_w$$

**یاساکە ڕیکدەخەمەوە بە جۆرێك کە نەزانراوەکە جیابکرێتەوە.**

$$\Delta Tm = \frac{m_w cp_{,w}\ \Delta\ T_w}{m_m cp_{,m}}$$

**3. هەژماردەکەم**

نرخەکان لە یاساکەدا دادەنێم:

بینیم دەبێت $\Delta T_w$ پۆزەتیڤ بێت.

$$\Delta T_w = T_f - T_w = 25.0\text{ºC} - 21.0\text{ºC} = 4.0\text{ºC}$$

$$\Delta T_m = \frac{(0.15\ \text{kg})\left(\dfrac{4186\ \text{J}}{\text{kg•ºC}}\right)(4.0\text{ºC})}{(0.050\ \ \text{kg})\left(\dfrac{899\text{J}}{\text{kg•ºC}}\right)}$$

$$\Delta T_m = 56^oC$$

$$T_m = T_f + \Delta T_m$$

$$T_m = 25^oC + 56^oC = 81^oC$$

$$\boxed{T_m = 81^oC}$$

**بیرۆکەی بەسوود**: لەبەرئەوەی $T_w$ بچووکترە لە $T_f$ بزانە کە دەبێت $T_m$ گەورەتر بێت لە $T_f$

## ڕاهێنانی 4 (ب)

### پێوانی گەرمی

**1.** کاتێك پارچە زێرێك بارستایی یەکەی 3.0 kg بوو وە پلەی گەرمییەکەی 99°C بخرێتە ناو 0.22 kg ئاوەوە کە پلەی گەرمییەکەی 25°C بوو ، دوا پلەی گەرمی کۆمەڵەکە چەندە؟

**2.** پارچە تەنەکەیەك بارستایەکەی 0.225 kg بوو لە پلەی گەرمی 97.5°C خرایە ناو 0.115 kg ئاوەوە، کە پلەی گەرمییەکەی 10.0°C ئەگەر بزانیت فراوانی گەرمی تایبەتی تەنەکەکە 230 J/kg•°C ئایا دوا پلەی گەرمی کۆمەڵەکە چەندە.

**3.** ئەگەر 0.032 kg شیر لە پلەی گەرمی 11°C بکرێتە ناو 0.16 kg لە گیراوەی قاوە لە پلەی گەرمی 91°C ؟، ئایا دوا پلەی گەرمی تێکەڵەکە دەبێتە چەند ئەگەر بزانیت فراوانی گەرمی تایبەتی هەردوو ماددەکە یەکسانە بە فراوانی گەرمی تایبەتی ئاو؟ وادابنێ هیچ وزەیەکی گەرمی لە گیراوەکانەوە ناچێت بۆ دەوروبەر.

**4.** تەنێك بارستایەکەی 0.75 kg و پلەی گەرمییەکەی 36.5°C خرایە ناو ئاوێکەوە کە بارستایەکەی 1.25 kg و لە پلەی گەرمی 20.0°C دایە بەوەش دوا پلەی گەرمی کۆمەڵەکە بوو بە 24.4°C ئایا فراوانی گەرمی تایبەتی تەنەکە چەندە؟

**5.** پارچەیەك لە مسی زەرد بارستایەکەی 0.59 kg لە پلەی گەرمی 98.0°C دایە خرایە ناو 2.80 kg ئاو کە لە پلەی گەرمی 5.0°C دایە ئەگەر پلەی گەرمی باری هاوسەنگی 6.8°C بێت، ئایا فراوانی گەرمی تایبەتی مسە زەردەکە چەندە؟ (مسی زەرد دارشتەیەکە لە مس و تۆتیا پێك هاتووە).

**6.** پلەی گەرمی هەوای سەر ناوچە کەنارییەکان بەهۆی فراوانییە گەرمییە تایبەتییە گەورەکەی ئاوەوە کاریان تێدەکرێت ئەگەر بڕێك وزەی گەرمی لە هەواوە بچێت بۆ ئاو بەوەش پلەی گەرمی 1.0 kg ئاو بە بڕی 1.0°C بەرزدەبێتەوە ئایا قەبارەی ئەو هەوایەی گەرمییەکە وون دەکات و پلەی گەرمیەکەی 1.0°C نزم دەبێتە وە چەندە؟ وا دابنێ فراوانی گەرمی تایبەتی هەوا 1000.0 J/kg•°C وە چڕی هەواکە $1.29\ kg/m^3$ .

**7.** پارچە دراوێکی مسی گەرمکراو خرایە ناو 101 g لە ئاوێکی ساردە وە بەوەش گۆڕانێك لە پلەی گەرمی ئاوەکەدا ڕویدا بەبڕی 8.39°C وە هەروەها گۆڕانێك لە پلەی گەرمی پارچە دراوەکەدا ڕویدا بە بری 68.0°C ئایا بارستایی پارچە دراوەکە چەندە؟ وادابنێ هیچ وزەیەك لە ئاوەکەوە بۆ دەوروبەر ناگۆێزرێتەوە.

**8.** پلەی گەرمی ئاوی بەرزترین خاڵی تاڤگەکانی نیاگارا 10.0°C ئەگەر 505 kg لە ئاو لە بەرزی 50 m بکەوێتە خوارەوە ئایا پلەی گەرمی ئەو ئاوە لە خوارەوەی تاڤگەکەدا دەبێتە چەند ئەگەر بزانیت هەموو ماتە وزەی ئاوەکە بووە بە هۆی بەرزکردنەوەی وزەی ناوەکی ئاوەکە، و هەر 4186 J/kg دەبێتە هۆی بەرز کردنەوەی پلەی گەرمی ئاوەکە 1.0°C

# گەرم کردن و ساردکردنەوە لەزەوییەوە

دانیشتووە کۆنەکانی ئەشکەوتەکان هەستیان بەوە کرد بوو کە یەکێك لە ڕێگەکانی پارێزگاری کردنی گەرمی لە زستاندا و ساردی لە هاویندا نیشتەجێبوونە لە ژیر زەویدا ئیستاش زانا و ئەندازیارەکان هەمان بیرۆکە جێبەجیێ دەکەن، بە بەکارهێنانی تەکنیکە نوێیە سوود بەخشەکان. ئەوەیش بۆ مەبەستی ساردکردن و گەرم کردنی ئەو خانوانەی لەسەر زەوی دروست کراون بە تێچونێکی کەمتر لە ڕێگە باوەکان. (گانار و ئلمیث) لە سەنتەری « NYSERDA »ی ئەمریکی دەڵێن (پلەی گەرمی زەوی لە هەرناوچەیەکدا نرخێکی وەرزی ناوەندی هەیە کە نزیکەی 10°C یە لە شاری نیویورك بە درێژای ساڵ) هەر چەندە تێکرای فراوانی گەرمی تایبەتی زەوی لەهی هەوا کەمترە، بەڵام چڕی زەوی زیاترە، واتە لە نزیك ماڵێکەوە بارستاییەکی زیاتر لە زەوی هەیە لە چاو هەوادا بەوەش لە هەر گۆڕانێکی پلەی گەرمی بە بڕی 1°C ئاڵوگۆڕی گەرمی لەگەڵ زەوی دا زیاتر دەبێت وەك لەگەڵ هەوادا. لە بەر ئەوە لە زستاندا پلەی گەرمی زەوی زیاترە وەك لە پلەی گەرمی هەوا، بەڵام لە هاویندا بە پێچەوانەوەیە. ئەو ترومپا گەرمییەی بە زەوی گەیەنراوە یارمەتی خاوەن ماڵەکان دەدات کەپلەی گەرمی ژێر زەوی بەکار بهێنن بۆ گەرم کردنەوەی خانوەکانیان لە زستاندا هەروەها سارد کردنەوەیان لەهاویندا. ترومپاکە لە تۆڕێك بۆری پلاستیکی پێکهاتوە لە قوڵی دوو یان سێ مەتر لە ژێر زەوی دا دادەنرێت، بۆ گەرم کردنی خانووەکان شلەیەك لە ناو ئەو بۆریانەدا دەسوڕێتەوە گەرمی ژێر زەوی وەردەگرێت و دەیبات بۆ ترومپا گەرمیەکەی ناو ماڵەکە. ترومپا گەرمییەکە لە پەستێنەرێکی هەوا و کۆمەڵێك بۆری و سارد کەرەوەیەك کە بۆ گواستنەوەی وزە لە شلەکەوە بۆ هەوای ناو ژورەکە پێکدێت، سیستمی پاڵنان هەوا گەرمەکە لە ڕێگەی چاوگەکانی گەرمییەوە دابەش دەکات بەناو ماڵەکەدا. بەپێی دەستەی NYSERDA ئەم سیستمە دەتوانێت چوار هێندەی ئەو وزە کارەبایەی بەکاردەهێنرێت بۆ ئیش پێکردنی وزە بدات بە ماڵەکە، وەك هەموو ترومپا گەرمیەکانی تر ئەم سیستمە دەتوانێت بە پێچەوانەشەوە ئیش بکات واتە لە هاویندا وزەی گەرمی لە هەوای ماڵەکەوە وەردەگرێت دەیکاتە ناو بۆریەکانی ژێر زەوییەوە. ئێستا لە وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دا دەیان هەزار لەو ترومپا گەرمیانە هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم سیستمە دەتوانێت لە هەموو شوێنەکانی سەر زەویدا کاربکات بەڵام بۆ ئەو شوێنانەی ئاو و هەوایان خێرا خێرا دەگۆڕێت بەکارهێنانیان باش نییە. چونکە ناگونجێت لەگەڵ ڕێگای ئیش کردنی ئەم سیستمەدا.



# گەرمی شاراوە (ماتە گەرمی) Latent Heat

ئەگەر پارچەیەکی بچوک لە سەهۆڵ کە لە پلەی گەرمی $-25^{o}C$ دابێت بخرێتە ناو تاوەیەکەوە و لەسەر ئاگر دابنرێت ئەوا پلەی گەرمی سەهۆڵەکە بەرز دەبێتەوە لە $0^{o}C$ دا دەست دەکات بەشل بوونەوە بەزانینی بارستایی سەهۆڵەکەو فراوانی گەرمی تایبەتییەکەی دەتوانیت بڕی ئەو وزەیە بپێوین کە سەهۆڵەکە لە ئاگرەکەی وەرگرتووە، هەتا هەڵمژینی وزەی گەرمی ببێتە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی یەکەی و خۆیشی بە سەهۆڵی بمینێتەوە ئەو چەماوەیەی **وێنەی4-7** و داتاکانی **خشتەی 4-3** گۆڕانی پلەی گەرمی $10.0\ g$ سەهۆڵ ڕوون دەکاتەوە کاتێك وزە وەربگرێت. بڕوانە لە $-25^{o}C$ هەتا $0^{o}C$ پلەی گەرمی سەهۆڵ بەرزدەبێتەوە کاتێك وزەی دەدرێتێ (بەشی **A** چەماوەکە).




**وێنەی 4-7**
وێنەی هێڵکاری نموونەیی نیشانی ئەدات گۆڕان لە پلەی گەرمی $10.0\ g$ لە سەهۆڵ لەسەرەتای گەرم کردنەوەکە پلەی گەرمی یەکەی $25^{o}C$ – لە دۆخی بەفردایە پلەی گەرمییەکەی بوو بە $125^{o}C$ لە دۆخی هەڵمی ئاودا و لە ژێری پەستانی هەوای ئاسایی دا.

لە $0^{o}C$ دابارەکە جیاواز دەبێت چونکە هەرچەندە گەرمی دەدرێتێ بەڵام پلەی گەرمی یەکەی ناگۆڕێت لە جیاتی ئەوە دۆخەکەی دەگۆڕێت لە ڕەقەوە دەست بەشلبوونەوە دەکات و دەبێتە ئاو لە پلەی $0^{o}C$ (بەشی **B**)، وە پلەی گەرمی تێکەڵەکە (سەهۆڵ و ئاوەکە) لە $0^{o}C$ دا جێگیر دەبێت هەتا هەمووی دەبێتە ئاو. دوای ئەوە پلەی گەرمی ئاوەکە لە $0^{o}C$ زیاد دەکات تا دەگاتە $100^{o}C$ (بەشی $C$ )، پاشان جارێکی تر پلەی گەرمی یەکە لە $100^{o}C$ دا جێگیر دەبێت تا هەموو ئاوەکە بە تەواوی دەبێتە هەڵم.

**خشتە 4-3 ئەو گۆڕانانەی لە پلەی گەرمی 10.0 g سەهۆڵ ڕوودەدات کاتێك گەرمدەکرێت**

| بەشی چەماوەکە | جۆری گۆڕانەکە | بڕی گەرمی ئاڵوگۆڕ کراو | مەودای پلەی گەرمی |
|---|---|---|---|
| A | پلەی گەرمی بەرز دەبێتەوە | 522 J | $0^{o}C \leftarrow 25^{o}C$ |
| B | سەهۆڵەکە شلدەبێتەوە بۆ ئاو | $3.33 \times 10^3$ J | $0^{o}C$ |
| C | پلەی گەرمی ئاوەکە بەرز دەبێتەوە | $4.19 \times 10^3$ J | $100^{o}C \leftarrow 0^{o}C$ |
| D | ئاوەکە دەکوڵێت و دەبێتە هەڵم | $2.26 \times 10^4$ J | $100^{o}C$ |
| E | پلەی گەرمی هەڵمی ئاوەکە بەرز دەبێتەوە | 502 J | $125^{o}C \leftarrow 100^{o}C$ |

(بەشی **D** لە چەماوەکە). کاتێك هەموو ئاوەکە بەهۆی کوڵانەوە دەبێت بە هەڵم پلەی گەرمی جارێکی تر دەست بە بەرزبونەوە دەکات (بەشی **E** ). ئەو هەڵمەی پلەی گەرمییەکەی لە پلەی گەرمی کوڵانی ئاو زیاتر بێ پێی دەوترێت هەڵمی گەرم کراو. کاتێك ماددەکان شل دەبنەوە یان توشی بەستن دەبن، دەکوڵێن یان چڕ دەبنەوە، ئەو ئاڵوگۆڕکردنە لە گەرمی دەبێتە هۆی گۆڕینی وزەی ناوەکی ماددەکە بێ ئەوەی پلەی گەرمی ماددەکە بگۆڕێت،ئەم جۆرە گۆڕانانەی مادده پێیان دەگوترێت **دۆخ گۆڕان** phase changes . گۆڕانی دۆخەکانی مادده پێویستی بە پێناسەیەکی نوێ هەیە بۆ گەرمی.

**دۆخ گۆڕان**

ئەو گۆڕانە فیزیایانەی دۆخی مادده یە لە (ڕەق، شل، گاز) ەوە بۆ دۆخیکی تر لە ژێر پەستانێکی جێگیرداو بە نەگۆڕانی پلەی گەرمی.

**گەرمی**: وزەی ئاڵوگۆڕکراوە لە نێوان دوو تەنەدا کە پلەی گەرمی جیاوازیان هەبێت یان کە هەمان پلە گەرمیان هەبێت و بەمەرجێك گۆڕان لە دۆخی یەکێکیاندا ڕوویدات.

## دۆخ گۆڕان و وزەی شاراوەی نێوان تەنۆلکەکان

بۆ ئەوەی ڕەوشتی ماددەکان بزانرێت لە کاتی دۆخ گۆڕاندا، دەبێت چۆنیەتی ئاڵوگۆڕکردنی وزە لە کاتی بەریەکەوتندا بەبیر خۆت بهێنیەوە. ماتە وزە وزەی تەنێکە بە هۆی شوێنەکەیەوە لە چاو شوێنی تەنێکی دیاریکراودا. ئەو پێنووسەی لەسەر مێزەکەت خەریکە دەکەوێت یان پارچە لاستیکێکی ڕاکێشراو دوونموونەی ماتە وزەن، ماتەوزەش لە نێوان تەنۆلکەکانی مادده ڕەقەکان و شلەکاندا هەیە بە هۆی هێزی ڕاکێشانی نێوانیانەوە پەیدا دەبێت. و ماتە وزەیان پێ دیاری دەکرێت هەروەها ماتەوزە بەهێزی کارەبایی نێوان بارگەکانی گەردو گەردیلەکانەوە بەستراوە.

دوری نێوان گەردو گەردیلەکان لە باری هاوسەنگیدا دەبێتە هۆی پەیدا بوونی بارێك کە ماتەوزە تیایدا لە کەمترین نرخ دا دەبێت، ماتەوزە زیاد دەبێت بە زیاد بوونی دوری نێوان گەردیلەکان کاتێك لە باری هاوسەنگیدابێت ئەم بارەی کە باس کرا لە باری سپرینگێکی ڕاکێشراو دەچێت. بە گشتی وا سەیر دەکرێت ئەو کۆمەڵە گەردو گەردیلانە و پەیوەندی نێوانیان وەك چەند بارستاییەکی بەستراو بێت بەملاو ئەولای سپرینگەکەوە ئەگەر دووری نێوان تەنۆلکەکان زۆر گەورە بوو لەوانەیە پەیوەندیان بپچڕێت، ئەو ئیشەی کە پێویستە بۆ زیاد کردنی ماتەوزە و تێکشاندنی بەندەکان لەو بەرکەوتنانەوە پەیدادەبێت کە لەگەڵ گەرد یان گەردیلە وزە بەرزەکان ڕوودەدات، وەك لە **وێنەی 4-8** دا دیارە هەروەك چۆن بەندەکان لەوانەیە تێکبشکێن ئاواش بەندی نوێ دروست دەبێت کاتێك تەنۆلکەکان یان گەردەکان لەیەکتر نزیك دەخرێنەوە. بۆ ئەوەش پێویستە تەنۆلکەکان لە ماتەوزەی بەرزەوە (ناوەندە دوریە گەورەکان) بگوازرێنەوە بۆ ماتەوزەی نزم (ناوەندە دوریە بچوکەکان) ئەو نزم بوونەوەش لە ماتەوزەدا دەبێتە هۆی زیادبوونی جووڵە وزەی تەنۆلکەکانی دراوسێی.




**وێنەی 4-8**

ئەو وزەیەی کە دەدرێت بە ماددەکان لەوانەیە ببێتە هۆی (أ) زیادبوونی جووڵە وزەی لەرینەوەی تەنۆلکەکانی مادەکە یان (ب) تێکشاندنی بەندی نێوان تەنۆلکەکان.

## وزەی پێویست بۆ شلبوونەوەی ماددەکان و دووبارە خۆڕێك خستنەوەی گەردەکان

گۆڕانی ماتە وزەی تەنۆلکەکانی مادەیەك دۆخ گۆڕانی لێوە پەیدا دەبێت. کاتێك ئاڵوگۆڕکردنی وزە لەگەڵ تەنێکدا ڕوودەدات دەبێتە هۆی گۆڕینی دۆخەکەی و تەنۆلکەکانیش کرداری خۆڕێك خستنەوە بۆ جێگەکانیان دەکەن بە پێی گۆڕانی وزەکەیان بە بێ ئەوەی تێکرای جووڵە وزەی گەردیلەکانی بگۆڕێت.
کاتێك سەهۆڵ شل دەبێتەوە وزەی وەرگیراو بەشی تێکشکاندنی ئەو بەندە لاوازانەی کە گەردیلەکانی ئاوەکە لە شێوەی بلورێکی ڕێکدا کۆدەکاتەوە دەکات، بەندی تازە پێك دێت بەڵام جیاواز لە گەردەکانی ئاوە شلەکە کە جێگە بلوریەکە جێ دەهێڵێت بەجۆرێك جارێکی تر بەشێك لە وزە وەرگیراوەکە دەداتەوە. جیاوازی نێوان ماتە وزەی بەندە تێکشکاوەکان و بەندە تازە پێکهاتوەکان، دەکاتە بەرەنجامی ئەو وزەیەی کە دراوە بەسەهۆڵەکە وەك لە **وێنەی 4-9** دا دیارە. لەبەر ئەوە ئەو وزەیەی بۆ خۆڕێك خستنەوەی گەردەکان بەکاردەهێنرێت نابێتە هۆی زیادبوونی جوڵەوزەکەیان بەوەش هیچ گۆڕانێك لە پلەی گەرمی تێکەڵەکەدا (سەهۆڵ و ئاو) ڕوونادات.




**وێنەی 4-9**
ماتە گەرمی شلبوونەوە دەکاتە جیاوازی نێوان وزەی پێویست بۆ شکاندنی بەندەکانی دۆخی ڕەقی و وزەی بەرهەمهاتوو لە کاتی بەستنەوەی بەندەکانی شلەکەدا.

گەرمی دراو بەهەرمادەیەك لەکاتی شلبوونەوەدا دەکاتە جیاوازی نێوان هەردوو ماتە وزەی گشتی گەردەکانی لە هەردوو دۆخی ڕەقی و شلیدا، ئەو وزەیە بۆ یەکەیەکی بارستایی پێی دەوترێت ماتە **گەرمی شلبوونەوە** heat of fusion .

**گەرمی پێویست بۆ کوڵانی ئاوو دوورکەوتنەوەی گەردەکان**

لە دۆخی شلی ئاودا دوری نێوان گەردەکان کەمترە وەك لە دۆخی ڕەقی (سەهۆڵ) وە هێزی نێوان گەردیلەکانی ئاو زیاترە لە هێزی نێوان گەردیلەکانی هەڵمی ئاو کە لەیەکتر دوورن بۆیە هەموو ئەو گەرمیەی کە ئاو لە 100°C دا وەریدەگرێت بەکار دەهێنرێت بۆ زاڵبوون بەسەر هێزی ڕاکێشانی نێوان گەردەکانی ئاوەکەدا، وە بەهیچ شێوەیەك نابێتە هۆی زیادکردنی جووڵە وزەی گەردەکانی. ئەو وزەیەی کە دەدرێت بە مادەیەك بۆ کوڵاندنی دەکاتە جیاوازی نێوان ماتە وزەی کێشکردنی گەردیلەکانی لە هەردوو باری شل و گازیدا، بڕوانە **وێنەی 4-10** ئەو وزەیەی یەکەی بارستایی پێی دەگوترێت **گەرمی کوڵاندن** heat of vaporization لەبەر ئەوەی کە گەردیلەکانی گاز زۆر لەیەکتر دورن بۆیە بەندەکانی نێوانیان لاوازە، ئەو وزەیەش کەلێیانەوە پەیدا دەبێت کەمە بۆیە ئەو وزەیەی کە پێویستە بۆ بەهەڵمکردنی بارستاییەکی دیاریکراو لە ماددەیەك زیاترە لەو وزەیەی کە بۆ شلکردنەوەی هەمان بارستایی لە مادەکە بەکاردێت. کەواتە وزەی بەهەڵمکردن زۆر زیاترە لەگەرمی شلکردنەوە. هەردوو وزەکەش یەك ناویان هەیە ئەویش **ماتە گەرمی** یە latent heat .

**گەرمی شلبوونەوە**

وزەی ئاڵوگۆڕکراوە لە یەکەی بارستاییدا بۆ گۆڕینی دۆخی مادە لە ڕەقیەوە بۆ شلی یان لە شلیەوە بۆ ڕەقی بە نەگۆڕانی پلەی گەرمی و پەستان.

**گەرمی کوڵاندن**

وزەی ئاڵوگۆڕکراوە لە یەکەی بارستاییدا بۆ گۆڕینی دۆخی مادە لە شلیەوە بۆ گازی یان لە گازەوە بۆ شلی لە ژێر پلەیەکی گەرمی و پەستانێکی جێگیردا.

**گەرمی شاراوە**

وزەی ئاڵوگۆڕکراوە لە یەکەی بارستاییدا بۆ گۆڕینی دۆخی مادەیەك.




**وێنەی 4-10**

ماتە گەرمی بە هەڵمبوون بەشی زۆری ئەو وزە پێویستەیە بۆ جیاکردنەوەی گەردەکان لە دۆخی شلیدا.

**گەرمی شاراوە Latent Heat « $L$ »**

$$Q = mL$$

**ئەو وزە گەرمیەیەیلەکاتی دۆخ گۆڕاندا ئاڵوگۆڕ دەکرێت = بارستایی × گەرمی شاراوە**

لە کاتی هەژمارکردنی کردارەکانی شلبوونەوە یان بەستندا، بۆ ماتە گەرمی شلبوونەوە هێمای $L_f$ دادەنرێت. هەروەها لە کاتی بەهەڵمبوون و چڕبوونەوەدا بۆ ماتە گەرمی بە هەڵمبوون هێمای $L_v$ دادەنرێت **خشتەی 4-4** لیستێکی ماتە گەرمی هەندێك لە ماددەکان نیشان دەدات.

**خشتە 4-4 ماتە گەرمی شلبوونەوە و بە هەڵمبوون لە ژێر پەستانی پێوانەیی هەوادا (ئاساییدا)**

| ماددەکان | پلەی گەرمی شلبوونەوە (C°) | $L_f$ (J/kg) | پلەی گەرمی کوڵان (°C) | $L_v$ (J/kg) |
|---|---|---|---|---|
| نایترۆجین | −209.97 | $2.55 \times 10^4$ | −195.81 | $2.01 \times 10^5$ |
| ئۆکسجین | −218.79 | $1.38 \times 10^4$ | −182.97 | $2.13 \times 10^5$ |
| کحولی ئەثیلی | −114 | $1.04 \times 10^5$ | 78 | $8.54 \times 10^5$ |
| ئاو | 0.00 | $3.33 \times 10^5$ | 100.00 | $2.26 \times 10^6$ |
| قورقوشم | 327.3 | $2.45 \times 10^4$ | 1745 | $8.70 \times 10^5$ |
| ئەلەمنیۆم | 660.4 | $3.97 \times 10^5$ | 2467 | $1.14 \times 10^7$ |

## نموونە 4 (ج)

### گەرمی دۆخ گۆڕان

**پرسیار**

بڕی ئەو گەرمیەی وون دەبێ چەندە لە ساردکردنەوەی **10.0 g** هەڵمی ئاوەوە لە پلەی گەرمی **133.0°C** بۆ ئەوەی بگۆڕێت بۆ ئاو لە پلەی **53.0 C°**؟

**شیکار**

**1. دەزانم**

دراو:

$$T_{\text{هەڵم}} = T_s = 133.0°C$$
$$T_{\text{ئاو}} = T_w = 53.0°C$$
$$c_{p\ \text{هەڵم}} = c_{p,s} = 2.01 \times 10^3\ J/kg•°C$$
$$c_{p\ \text{ئاو}} = c_{p,w} = 4.186 \times 10^3\ J/kg•C°$$
$$L_v = 2.26 \times 10^6\ J/kg$$
$$m = 10.0\ g = 10.0 \times 10^{-3}\ kg$$

نەزانراو:

$$Q_{\text{گشتی}} = ?$$

وێنە:




**2. پلان دادەنێم**

**هاوکێشەیەك یان زیاتر یان هەڵوێستێك هەڵدەبژێرم:** گەرمی بەبەکارهێنانی $Q = mc_p\Delta T$ هەژمێر دەکرێت ئەگەر دۆخ گۆڕان نەبێت، بەڵام لە دۆخ گۆڕاندا یان گۆڕانی هەڵم بۆ ئاو یاسای $Q = mL_v$ بەکاردەهێنیت. دڵنیابە کە $\Delta T$ لە هەموو قۆناغەکاندا موجەبە.

بۆ ساردکردنەوەی هەڵمی ئاوەکە بۆ پلەی گەرمی 100.0°C: $Q_1 = mc_{p,s}\Delta T$

بۆ گۆڕینی هەڵمی ئاوەکە بۆ ئاوی شل پلەی گەرمی یەکەی 100.0°C: $Q_2 = mL_v$

بۆ ساردکردنەوەی ئاو هەتا 53.0°C: $Q_3 = mc_{p,w}\Delta T$

**3. هەژماردەکەم**

نرخەکان لە یاساکاندا (هاوکێشەکاندا) دادەنێم $\Delta T$ دەدۆزمەوە بۆ هەردوو قۆناغی ساردکردنەوەی هەڵمی ئاو ساردکردنەوەی ئاوی شل هەریەکە لە $Q_1$ و $Q_2$ بۆ هەردوو کرداری ساردکردنەوە دەدۆزمەوە و $Q_3$ بۆ گۆڕانی دۆخ.

بۆ ساردکردنەوەی هەڵمی ئاو

$$\Delta T_s = 133.0°C - 100.0°C = 33.0°C$$

$$Q_1 = mc_{p,s}\Delta T = (10.0 \times 10^{-3}\ kg)\left(2.01 \times 10^3\ \frac{J}{kg•°C}\right)(33.0°C)$$

$$= 663\ J$$

بۆ چڕکردنەوەی هەڵم بۆ ئاو:

$$Q_2 = mL_v = (10.0 \times 10^{-3}\ \text{kg})\left(2.26 \times 10^6 \frac{\text{J}}{\text{kg}}\right)$$
$$= 2.26 \times 10^4\ \text{J}$$

بۆساردکردنەوەی ئاو:

$$\Delta T_w = 100.0°\text{C} - 53.0°\text{C} = 47.0°\text{C}$$
$$Q_3 = mc_{p,w}\Delta T = (10.0 \times 10^{-3}\ \text{kg})\left(4.186 \times 10^3 \frac{\text{J}}{\text{kg•°C}}\right)(47.0°\text{C})$$
$$= 1.97 \times 10^3\ \text{J}$$
$$Q_{\text{گشتی}} = Q_1 + Q_2 + Q_3$$
$$= 663\ \text{J} + 2.26 \times 10^4\ \text{J} + 1.97 \times 10^3\ \text{J}$$
$$= 2.52 \times 10^4\ \text{J}$$
$$\boxed{Q_{\text{گشتی}} = 2.52 \times 10^4\ \text{J}}$$

**4. هەڵدەسەنگێنم**

بەشی زۆری ئەو وزەیەی دەدرێت یان وەردەگیرێت لە تەنێك لە کاتی دۆخ گۆڕاندا لەم نموونەیەدا گەرمی بەهەڵمکردن نزیکەی % 90 گەرمی گشتی وونبووە.

**وەڵامی ئامێری ژمێرەر**

لەسەر بنچینەی ڕەنووسە واتاییەکان لە کرداری کۆکردنەوەدا دەبێت وەڵامەکە لە 25233 بۆ $2.52 \times 10^4$ نزیك بکەینەوە.

## ڕاهێنانی 4 (ج)

**گەرمی بۆ دۆخ گۆڕان**

(**تێبینی**: **خشتەی** 2-4 ، 4-4 بەکاربهێنە.)

**1.** بڕی گەرمی پێویست چەندە بۆ گۆڕینی 42 g سەهۆڵ لە 11°C– بۆ هەڵمی ئاو لە 111°C ؟

**2.** نایترۆجینی شل کە پلەی کوڵانی 77 K بەکار دەهێنرێت بۆ ساردکردنەوەی ماددەکان بۆ پلەی گەرمی نزم. ئەگەر 1.0 kg گازی نایترۆجین لە پلەی گەرمی 77 K بەتەواوەتی شلبکەینەوە. ئایا بڕی ئەو گەرمی یەی لەوەوە پەیدا دەبێت چەندە؟

**3.** بڕی گەرمی پێویست چەندە بۆ شلکردنەوەی 0.225 kg قورقوشم لە پلەی گەرمی 27.3°C .

**4.** بڕی گەرمی پێویست چەندە بۆ شلکردنەوەی 1000 قوتوی ئەلەمنیۆم بە تەواوەتی بۆ ئەوەی جارێکی تربەکاربهێنرێتەوە.وادابنێ سەرەتا پلەی گەرمی قوتوەکان 26.4°C و بارستایی هەر قوتویەك 14.0 g ؟

**5.** پارچە سەهۆڵێك بارستایی یەکەی 0.011 kg و لە پلەی گەرمی 0.0°C دایە خرایە ناو 0.450 kg لە گیراوەیەك کە پلەی گەرمییەکەی 80.0°C وادابنێ کە فراوانی گەرمی تایبەتی گیراوەکە یەکسانە بەفراوانی گەرمی تایبەتی ئاو. دوا پلەی گەرمی گیراوەکە چەندە؟ ئەگەر بزانیت هەموو سەهۆڵەکە شلبووەتەوە؟ (تێبینی گۆڕانکاری هەیە لە پلەی گەرمیدا دوای شلبوونەوەی سەهۆڵەکە).

**6.** 25 kg فافۆنی شلبووەوە لە پلەی گەرمی 660.4°C کرایە قاڵبێکەوە لە ژورێکدا کە 130 kg هەوای تێدایە لە پلەی گەرمی 25°C . دوا پلەی گەرمی هەواکە دەبێتە چەند دوای ڕەقبوونی فافۆنەکە ئەگەر بزانیت فراوانی گەرمی تایبەتی هەوا $1.0 \times 10^3$ J/kg•°C .

**7.** پارچە سەهۆڵێك بارستاییەکەی 2.5 kg لە پلەی گەرمی سفری 0.0°C سیلیزی دایە بەخێرایی 5.7 m/s لەسەر زەویەکی ئاسۆی دەخزێت، ئایا بارستایی ئەو بەشەی لە سەهۆڵەکە کە شلدەبێتەوە چەندە، ئەگەر بزانی هەموو جوڵە وزەی سەهۆڵەکە گۆڕاوە بۆ وزەی ناوەکی بۆ سەهۆڵەکە، وە بۆ شلبوونەوەی 1.0 kg لە سەهۆڵ پێویستمان بە $3.3 \times 10^5$ J هەیە.

## پێداچوونەوەی بەندی 2-4

**1.** زێر نگەرێك دەیەوێت گوستیلەیەكی دروستكراو لەزێری گەرم ساردبكاتەوە بۆ ئەوەی بە ئاسانی كاری تێدابكات وادابنێ بارستایی گوستیلەكە 47 g سەرەتا پلە گەرمی یەكەی 99°C ئەوا بارستای ئاوی پێویست كە پلە گەرمیەكەی 25°C بێت چەندە؟ بۆ ئەوەی پلەی گەرمی زێڕەكە بكاتە 38°C دوای دانانی لە ناو ئاوەكەدا.

**2.** بە بەكارهێنانی بنەماكانی ماتە گەرمی و وزەی ناوەكی لێكیبدەرەوە بۆچی پارچە تەختەی تەڕ (شێدار) ئاگر ناگرێت.

**3.** بۆچی هەڵمی ئاو لە پلەی گەرمی 100°C دا سوتێنەرترە لە ئاو لە هەمان پلەی گەرمی دا (100°C )؟

**4.** بە بەكارهێنانی چەماوەی گەرمكردن بۆ 15 g لە ماددەیەك وەك لە **وێنەی 4-11** نرخی تایبەتمەندی ئەو مادەبەكار هێنراوە بخەملێنە لەم ڕوانەوە:

أ. فراوانی گەرمی تایبەتی شلەكە.

ب. ماتە گەرمی شلبوونەوە.

جـ. فراوانی گەرمی تایبەتی تەنە رەقەكان.

د. فراوانی گەرمی تایبەتی هەڵم.

هـ. ماتەگەرمی بە هەڵمبوون.




**وێنەی 4-11**

**5.** **فیزیا لە ژیانی ڕۆژانەماندا:** بڕی ئەو وزەیە چەندە كە پێویستە بدرێتە قاپێك كە 125 دەنكە گەنمە شامی تێدایە بۆ ئەوەی بپشكوێت (بتەقێت) لە پلەی گەرمی 175°C ؟وادابنێ سەرەتا پلەی گەرمی گەنمە شامیەكان 21°C فراوانی گەرمی تایبەتییەكەشی 1650 J/kg•°C ، وەبارستایی هەر دەنكێك گەنمەشامی دەكاتە 0.105 g .

**6.** **فیزیا لە ژیانی ڕۆژانەماندا:** بە هۆی ئەو پەستانەی لەناو دەنكە گەنمەشامیدایە، ئاوەكەی ناوی لە 100°C دا نابێتە هەڵم بەڵكو پێویستی بە 175°C هەیە بۆ ئەوەی دەنكەكە بتەقێتوو ئاوەكەی ناویشی ببێتە هەڵم. بڕی گەرمی پێویست چەندە بۆ ئەوەی 95.0 g گەنمە شامی پێ ببرژێنیت و بتەقێنیت، ئەگەر بزانیت لە 14% بارستایی گەنمەشامییەكە لە ئاو پێك هاتووە؟ وادابنێ ماتە گەرمی بە هەڵمبوونی ئاو لە 175°C دەكاتە 90% ی نرخەكەی لە كاتی بەهەڵمبوونیدا لە 100°C دا وە سەرەتاپلەی گەرمی دەنكە گەنمە شامی یەكان 175°C بووە.

## بەندی 3-4

# پەیوەندی گەرمی بە ئیشەوە

*Relationship between heat and work*

### 4-3 ئامانجەکان

- ئەوە دێتە دی کە وا هەر سیستمێك دەتوانرێت وزە وەربگرێت یان وزە بدات بە شێوەی گەرمی بە جۆرێك کە ئیشی لەسەر بکرێت یان بە هۆیەوە ئیش بکرێت، ئەو ئیشەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە وزە بە شێوەی گەرمی ئاڵوگۆر بکرێت.
- بڕی ئێشی بە ڕێکراو لە هەر کردارێکی داینەمیکی گەرمی دا هەژمار دەکرێت.
- کردارە داینەمیکیە گەرمییە ئەدیاباتی و ئایزۆثرمیەکان بە نەگۆڕانی قەبارە لە یەکتر جیا دەکاتەوە.

## گەرمی و ئیش و وزەی ناوەکی

لەوەی پێشەوە فێربوویت کەوا چۆن هێنانە دەرەوەی (هەڵکیشانی) بزمار لە پارچە تەختەیەك دەبێتە هۆی بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی بزمارەکە. وێنەی 4-12 ئەو ئیشەی بۆ زاڵبون بەسەر هێزی لێکخشاندنی نێوان بزمارەکە و پارچە تەختەکەدا دەبێتە هۆی زیاد بوونی وزەی گەردیلەکانی بزمارە ئاسنەکە و تەختەکە. ئەم بەرزبوونەوەش لە جووڵەوزەی تەنۆڵکەکاندا دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی وزەی ناوەکی بزمار و تەختەکەلە و شوێنانەی کە دووڕووەکە بەریەککەوتوون. لەبەر ئەوەی دۆخی مادەکە نەگۆڕاوە، ئەوا بەزیاد بونی وزەی ناوەکی پلەی گەرمی زیاد دەکات بەوەش زیادبونی وزەی ناوەکی ڕووی بزمارەکە دەبێتە هۆی بەرز بونەوەی پلەی گەرمییەکەی و ئەوەش لە پلەی گەرمی ناوەوەی بزمارەکە زیاتر دەبێت لەئەنجامدا وزە لە سەر ڕووی بزمارەکە دەچێت بۆ ناو بزمارەکە، کاتێك دەگاتە هەموو خاڵە جیاجیاکانی ناو بزمارەکە هاوسەنگی گەرمی ڕوودەدات. بینیمان کەوا ئیشی بەرێکراو بۆ دەرهێنانی بزمارەکە دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی وزەی ناوەکی بزمارەکە. وبڕێك لەو وزەیە بە شێوەی گەرمی دەچێت بۆ تەختەکە بەوەش دوا پلەی گەرمی بزمار و تەختەکە لە سەرەتا پلەگەرمییەکەیان زیاتر دەبێت. بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی بزمار و تەختەکە بەڵگەی بە ڕێکردنی ئیشە لەسەریان. ئەم وەسفەش پێناسەیەکی زۆر ووردی وزەی دەوێت، لەم بارەدا ووزە میکانیکیەکەی کە دراوە بە بزمار و تەختەکە پارێزراو نابێت، چونکە یاسای پاراستنی وزە گۆڕانەکانی وزەی ناوەکی و وزەی ئاڵوگۆرکراو کە لەبەندی 4-1 و 4-2 بینیمان فەرامۆش دەکات. بۆیە هەندێك جار گشتاندنی یاسای پاراستنی وزە بە شێوەیەك کە وزەی ناوەکی و گەرمیش بگرێتەوە سود بەخش دەبێت.



**وێنەی 4-12**
ئیشی بەڕێکراو وزەی ناوەکی بزمارەکە زیاد دەکات و وزەکەش لە روی بزمارەکەوە بە شێوەی گەرمی دەگوێزرێتەوە.

### بەکارهێنانی گەرمی بۆ ئیش کردن

ئیش دەتوانێت وزە بدات بە مادەیەکی دیاری کراو کە بە هۆیەوە وزە ناوەکیەکەی زیاد بکات، هەروەها دەتوانرێت وزەی ناوەکیش کەم بکرێتەوە کاتێك هەندێك وزەی بە شێوەی گەرمی لێ وەربگرێت. هەروەها لەوانەیە بە پێچەوانەشەوە ڕوویدات، وزە دەتوانرێت بە شێوەی گەرمی بۆ ماددەیەك بگوێزرێتەوە یان بە شێوەی ئیش لێوەی دەگوێزرێتەوە.

وادابنێ پفدانێك (میزەڵانێك) بە دەمی کەموڵەیەکی شوشەوە بەسترا کە ئاوی تێدابوو کەموڵەکەش گەرم کرا تا ئاوەکەی ناوی کوڵا بەوەش ئەو وزەیەی لە گڕی ئاگرە کەوە بۆ کەموڵەکە چووە دەبێتە هۆی زیادبوونی وزەی ناوەکی ئاوەکە. کاتێك پلەی گەرمی ئاوەکە دەگاتە پلەی کوڵان ئاوەکە دەبێتە هەڵم، و لەو پلە گەرمیەشدا قەبارەی هەڵمەکە زیاد دەکات، کشانی هەڵمەکە دەبێتە هۆی دروست بوونی هێزێك کە پاڵ

بە پـڤـدانـەکـەوە دەنێت بـە پێچـەوانـەی پـەسـتـانـی هـەواوە، وەك لـە وێنەی **13-4** دیارە هەڵمەکە ئیش لەسەر پڤدانەکە دەکات بەوەش وزەناوەکیەکەی کەم دەکاتەوە هەروەك چاوەڕوان دەکرا بە پێ ی یاسای پاراستنی وزەوە.

## گواستنەوەی گەرمی و ئیش بە شێوەی وزە لە سیستمێکەوە بۆ دەور و بەری و بە پێچەوانەشەوە:

بە پێی تێڕوانینی مایکرۆسکۆبی ئیش و گەرمی لە یەك دەچن و هیچ کامیشیان لە تایبەتمەندیەکانی ماددەنین بەڵکو جۆرێکن لە جۆرەکانی وزە و بۆ ماددەیەك دەچن و لێشیەوە دەردەچن. بەوەش وزەی ناوەکی ماددەکە دەگۆڕێت ئەم گۆڕانەش بەشێوەی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی یان دۆخ گۆڕان دەردەکەوێت. هەتا ئێستا وا هەڵسوکەوت لەگەڵ وزەی ناوەکی مادەیەك یان کۆمەڵە ماددەیەکدا کراوە کە بڕێکی سەربەخۆیە و دەکرێت وزەی لێ وەربگرێت یان بۆی زیاد بکرێت، ئەو ماددەیە یان کۆمەڵە ماددەیە پێی دەگوترێت (نیزام) **سیستم** system و هەموو بەشەکانی سیستمەکە لە نێوان خۆیاندا لە باری هاوسەنگی گەرمیدا دەبن لە پێش ڕوودانی ئاڵوگۆڕی وزەکەو لە دوای ڕودانیشیدا.

یەکێك لە نموونەکانی سیستم ئەو کەمۆڵە و ئاو و پڤدان و هەڵمەکەی پێشوو بوو کە بە هۆی ئاگرەکەوە گەرم کرا، لەگەڵ گواستنەوەی وزە گەرمیەکەدا وزەی ناوەکی سیستمەکە بەرز دەبێتەوە . کاتێکیش هەڵمەکە دەکشێت کە بەشێکە لە سیستمەکە وزەی ناوەکی سیستمەکە کەمدەکات بەهۆی کشان وبەرێکردنی ئیشێك لەسەر پڤدانەکە. بەشێك لەو وزەیەی کە گواستراویەوە بۆ سیستمەکە بە شێوەی گەرمی لە سیستمەکە وە دەرچوو بەشێوەی ئیشێك پڤدانەکە لەسەر هەوای دەوروبەر بەرێیکرد.

لەگەڵ ئەوەش دا کە لە زۆر کاتدا سیستم جیاکراوەیە بەڵام زۆر جاریش لەگەڵ دەوروبەرەکەی دا کارلێك دەکات. لەم نموونەی سەرەوەدا، ئاڵوگۆڕی گەرمی لە نێوان سیستم و ئاگرەکەدا ڕویداوە و سیستمەکەش ئیشی لەسەر دەوروبەرەکەی خۆی کردوە چونکە پڤدانەکە پاڵی بە هەوای دەرەوە ناوە بەرەو دەرەوە هەروەها بڕێك لە وزەی گەرمیش لە سیستمەکەوە چووە بۆ هەواکەی دەوروبەر بە هۆی جیاوازی پلەی گەرمی نێوان کەمۆڵەکەو دەوروبەری. ئەو ناوەندەی کە دەوری سیستمەکەی داوە و کارلێکی لە گەڵدا دەکات پێی دەگوترێت **دەوروبەرە ناوەند** environment .

## پەیوەندی ئیشی بەڕێکراو بەهەریەکەلەپەستان وگۆڕانی قەبارەوە

ئیش بەوە پێناسە دەکرێت، کە دەکاتە سەرئەنجامی لێکدانی هێزی کاریگەر و ئەو لادانەی تەنەکە دەیبڕێت بە ئاراستەی هێزەکەوە، ئیشی داینەمیکی گەرمیش بەوە پێناسە دەکرێت کە سەرئەنجامی لێکدانی پەستانی گازە کەو ئەو گۆڕانەیەکە لە قەبارەکەی دا ڕوودەدات. دەتوانین ئەم پێناسەیە بەدەست بهێنین کاتێك لە پێناسەکەی پێشووەوە دەست پێ بکەین و پێناسەی پەستانیش (ئەنجامی دابەشکردنی هێزی ستوونی بەسەر ڕووبەردا) وە هەروەها گۆڕان لە قەبارە دا (سەرەنجامی لێکدانی ڕووبەر و لادانە).

**پێناسەی ئیش بە گوێرەی گۆڕانی قەبارە.**

$$W = Fd$$

**ئیش = هێز × لادان**

$$W = Fd\left(\frac{A}{A}\right) = \left(\frac{F}{A}\right)(Ad) = P\Delta V$$

**ئیش = پەستان × گۆڕان لە قەبارە**



**شێوەی 13-4**
وزەی ئاڵوگۆڕکردن بە شێوەی گەرمی ئاوەکە دەگۆڕێت بۆ هەڵم. وزەی هەڵمیش ئیشێك دەکات دژی ئەو هێزانەی کە لە دەرەوە کاردەکەنەسەر پڤدانەکە.

**سیستمی داینەمیکی گەرمی**

ماددەیەکە یان کۆمەڵە ماددەیەکە بە بڕێکی سەربەخۆ دادەنرێت دەکرێت وزەی بدرێتێ یان لێی وەربگرێت.

**دەوروبەرە ناوەند**

هەموو شتەکانی دەرەوەی سیستمێکە کە دەتوانن کار لە سیستمەکە بکەن یان سیستمەکە کاریان لێبکات.

کاتێك پەستان نەگۆڕ بێت، دەتوانین ئیش بەم شێوەیە بنوسین $P\Delta V$ لە جیاتی $\Delta(VP)$ . ئەگەر گازەکە بکشێت وەك لە **وێنەی 14-4** دا دیارە $\Delta V$ پۆزەتیف دەبێت چونکە گازەکە ئیشێك لەسەر پەستێنەرەکە دەکات وەکاتێکیش گازەکە دەپەستێوڕێت $\Delta V$ نێگەتیڤ دەبێت واتە پەستێنەرەکە ئیش لەسەر گازەکە دەکات. وە ئەگەر قەبارە بە نەگۆڕی بمێنێتەوە ئەوا لادان نابێت بەوەش هیچ ئیشێك ناکرێت نەلە سەر سیستمەکە و نەسیستمەکەش دەیکات. ئیش بە هۆی گۆڕانی قەبارەوە نەبێت بە ڕێناکرێت هەر چەندە پەستانەکەشی لە کردارێکی دیاریکراودا بگۆڕێت. زیاد کردنی پەستان بە نەگۆڕانی قەبارە وەك ئەوە وایە کە بە هێزێك کاربکرێتە سەر تەنێك و نەبێتە هۆی لادانی تەنەکە ئەوا لە هەردووبارەکەدا ئیش بە ڕێناکرێت.




**شێوەی 14-4**
ئیشی بەرێکراو لەسەر گازەکە یان بە هۆی گازەکەوە، دەکاتە سەرەنجامی لێکدانی گۆڕانی قەبارە و پەستانی گازەکە
(قەبارە = ڕووبەر $A$ کەرەتی لادانی $d$ ).

## نموونە 4 (د)

### ئیشی بەرێکراو لەسەر گاز یان بەهۆیەوە

**پرسیار**

**ڕووبەری بنکەی لولەکی بزوێنەرێك (پستن) $0.010\ m^2$ ئەو ئیشەی کە گازەکە لەناو لوولەکەدا دەیکات چەندە؟ ئەگەر بزانیت گازەکە پەستانێکی نەگۆڕ بخاتە سەر پەستێنەرەکە برەکەی $7.5 \times 10^5$ Pa ئەوەش بووە هۆی جولاندنی بەبڕی $0.040$ m ؟**

**شیکار**

**1. دەزانم**

دراو:

$d = 0.040$ m $\qquad A = 0.010\ m^2$

$P = 7.5 \times 10^5 \text{ Pa} = 7.5 \times 10^5 \text{ N/m}^2$

نەزانراو:

$W = ?\qquad \Delta V = ?$

**بیرۆکەی بەسوود:** لەبەرئەوەی ($W$) پۆزەتیڤە بۆیە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئیشەکە لەلایەن گازەکەوە کراوە نەك لەسەری کرابێت.

**2. پلان دادەنێم**

هاوکێشەی گۆڕانی قەبارە کە دەکاتە لێکدانی ڕوبەرو لادان وپێناسەی ئیش بەگوێرەی گۆڕانی قەبارە بەکاربهێنە.

$$\Delta V = Ad$$
$$W = P\Delta V$$

**3. هەژماردەکەم**

$$\Delta V = (0.010\ m^2)(0.040\ m) = 4.0 \times 10^{-4}\ m^3$$

$$W = (7.5 \times 10^5\ N/m^2)(4.0 \times 10^{-4}\ m^3) = 3.0 \times 10^2\ J$$

ئیشی بەرێکراو بەهۆی گازەوە = $3.0 \times 10^2$ J

## ڕاهێنانی 4 (د)

**ئیشی بەرێکراو لەسەر گاز یان بە هۆیەوە**

1. پەستانی گازێك لە دەفرێكدا $1.6 \times 10^5$ Pa و قەبارەکەی $4.0\ m^3$ ئیشی بەرێکراو بە هۆی گازەکە وە چەندە لەم بارانەدا.
   أ. ئەگەر قەبارەکەی ببێتە دوو ئەوەندەی یەکەم جاری لە ژێر پەستانی نەگۆڕدا.
   ب. ئەگەر قەبارەکەی ببێتە چارەکی یەکەم جاری لە ژێر پەستانی نەگۆڕدا.
2. برێك گازکرایە ناو لوولەکێکەوە کە پەستێنەرێکی پێوەیە و پەستانەکەی لە برێکدا جێگیرکرا کە 599.5 kPa کاتێك پاڵ بە پەستێنەرەکەوە نرابۆناوەوە، بە وەش قەبارەی گازەکە لە $5.317 \times 10^{-4}\ m^3$ کەم بووە بۆ $2.523 \times 10^{-4}\ m^3$ ئایا ئیشی بە ڕێکراو چەندە؟ ئایا ئەو ئیشە لەسەر گازەکە کراوە یان گازە کە کردویەتی؟ وەڵامەکەت ڕوون بکەرەوە.
3. ئەگەر پڤدانێك گازی هیلیۆمی تێبکرێت لە ژێر پەستانێکی نەگۆڕدا کە بڕەکەی $4.3 \times 10^5$ Pa وە قەبارەی پڤدانەکە لە $1.8 \times 10^{-4}\ m^3$ بۆ $9.5 \times 10^{-4}\ m^3$ زیادی کرد، ئایا بڕی ئەو ئیشە چەندە کە گازی هیلیۆمەکە لەسەر پڤدانەکە دەیکات؟
4. لە لوولەکی بزوێنەرێکی هەڵمیدا، هەڵم لە ژێر پەستانێکی نەگۆڕدا دەگوازرێتەوە بەشێوەیەك ئیشك لەسەر پەستێنەرەکەی دەکات بڕەکەی 0.84 J پەستانی هەڵمەکە بدۆزەرەوە وەئەگەر بزانیت تیرەی پەستێنەرەکە 1.6 cm ، دووریەك دەبڕێت بڕەکەی 2.1 cm لە هەر قۆناغێکدا.

# کردارە داینامیکیەکانی گەرمی

لەم بەندەدا سێ بڕی جیاواز لە یەکتر بەیەکەوە بەستراون ئەوانیش، وزەی ناوەکی $U$ و گەرمی $Q$ وئیش $W$ . بەڵام دەرکەوتنی هەموویان بە یەکەوە لە هەرکردارێکی داینەمیکی گەرمیدا مەرج نیە. لە هەندێك کرداردا ئیش بەرێدەکرێت و وزەی ناوەکیش دەگۆڕێت بە بێ ئەوەی ئاڵوگۆڕی گەرمی هەبێت، وە لە هەندێ باری تردا وزەی ناوەکی دەگۆڕێت بە هۆی ئاڵوگۆرکردنی گەرمیەوە بە بێ ئەوەی هیچ ئیشێك بکرێت، بەڵام ئەو کردارانەی کە تەنها ئاڵوگۆڕکردنی گەرمیان تێدایە، یان تەنها بە ڕێکردنی ئیشیان تێدایە، دەگمەنن.. لە زوربەی بارەکاندا ئاڵوگۆڕی وزە لە نێوان سیستم و دەوروبەرەکەیدا بە شێوەی گەرمی و ئیش دەبێت، دەتوانرێت وەسفی کردارە ڕاستەقینەکان بکرێت وەك نزیککردنەوە بۆیەکێك لە کردارە نموونەییەکان.

**کردارلە کاتی نەگۆڕانی قەبارەدا**

کردارێکی داینەمیکی گەرمییە کاتێك قەبارە نەگۆڕێت، بەهیچ شێوەیەك ئاڵو گۆڕکردنی ئیش لەگەڵ سیستمەکەدا ڕوونادات.

## ئیش بە ڕێنەکردن لەو کردارانەدا کە قەبارە تیایدا نەگۆڕە:

وادابنێ ئۆتۆمبێلێك لەپارکێکدا لە ڕۆژێکی گەرم دا وەستا دەرگاو جامەکانی داخرا و بوو، وزەی ناوەکی سیستمەکە (ناو ئۆتۆمبێلەکە) زیاد دەکات چونکە وزە بە شێوەی گەرمی لە هەوا گەرمەکەی دەوروبەریەوە بۆی دەچێت. پەیکەرە پۆلایەکەی ئوتومبێلەکە و شووشە توند و تۆڵەکانی پارێزگاری نەگۆڕانی قەبارەکەی دەکەن، بەوەش هیچ ئیشێك لەسەر سیستمەکە بەرێناکرێت چونکە هەموو ئەو گۆڕانانەی لە وزەی ناوەکی سیستمەکەدا ڕوویداوە تەنها بە هۆی ئاڵوگۆڕکردنی گەرمیەوەبووە.

بەشێوەیەکی گشتی، کاتێك پلەی گەرمی گازێك دەگۆڕێت بە بێ ئەوەی قەبارەکەی بگۆڕێت هیچ ئیشێك لەسەر گازەکە ناکرێت، وە گازەکەش هیچ ئیشێك ناکات، هەرکردارێکی لەم شێوەیە پێی دەوترێت **کردار لەکاتی نەگۆڕانی قەبارە** Isovolumetric process

وەك نموونەیەکی تر بۆ ئەوکردارانەی کە بەنەگۆڕانی قەبارە ڕوودەدەن باسی ئەوە دەکەین کە لە ناو گەرمۆکە پێوی تەقاندنەوەدا. ڕوودەدات وەك **وێنەی 4-15** ئەم دەزگایە لە دەفرێکی ئەستور پێك دێت کە برێکی کەم ماددەی تێدایەکە بەکارلێك کردن دەسوتێت، ئەو وزەیەی لە کارلێکەکەوە وەدەست دەکەوێت دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی پەستان و پلەی گەرمی گازە بەرهەم هاتووەکان.




**وێنەی 4-15**
قەبارەی گەرمۆكە پێوی تەقاندنەوە بەنزیكی نەگۆڕە و ئاڵوگۆڕی ووزە بە شێوەی گەرمی تێدا ڕوودەدات.

لە بەر ئەوەی دیواری دەفرەكە ئەستورە و هیچ گۆڕانكی بەرچاو لە قەبارەی گازەكەدا ڕوونادات. بۆیە ئاڵوگۆڕكردنی وزە لەگەڵ دەفرەكەدا تەنها بەشێوەی گەرمی دەبێت. هەروەك لە گەرمۆكە پێوی ئاساییدا هەبوو بەندی (4-2 ) زیادبوونی پلەی گەرمی ئەو ئاوەی دەوری گەرمۆكەپێوی تەقاندنەوەی داوە زانیاریمان دەداتێ بۆ هەژماركردنی ئەو وزە گشتییەی لەكارلێكەكەوە بەرهەم دێت

## بەسترانی وزەی ناوەكی بە پلەی گەرمییەوە

**كرداری ئایزۆثرمی**

كردارێكی داینەمیكی گەرمییەكە لە پلەیەكی گەرمی نەگۆڕدا ڕوو دەدات. لە كاتی ڕوودانیدا وزەی ناوەكی سیستەمەكە بەنەگۆڕی دەمێنێتەوە.

لەوانەیە وا بزانیت كە پڤدانێكی فووتێكراو سیستەمێكی وەستاوە، بەڵام هەمیشە توشی چەندەها كاریگەری داینەمیكی گەرمی دەبێتەوە ئەو گۆڕانانە بهێنە پێش چاوت كەبەسەر پڤدانەكەدا دێت لە كاتی گەردە لوولێكدا، پێش گەیشتنی گەردە لوولەكە بە چەند سەعاتێك پەستانی هەوا لەسەر خۆ دادەبەزێت بەرێكی نزیكەی بەبڕی 2000 Pa ،ئەگەر لە ناو خانویەكدا بیت كە پلەی گەرمیەكەی نەگۆڕبێت ئەوا هەر گۆڕانێك لە پلەی گەرمی دەرەوەی خانووەكە ڕوودەدات، نابێتە هۆی گۆڕانی پلەی گەرمی ناوخانوەكە بەڵام لە بەر ئەوەی خانووەكە بەتەواوەتی جیاكراوەنیە لە ڕووی گەرمییەوە بۆیە هەر گۆڕانێك لە پەستانی دەرەوە ڕوویدات دەبێتە هۆی گۆڕانی پەستانی ناوەوە. كاتێك پەستانی هەوای ناو خانووەكە بە هێواشی دادەبەزێت قەبارەی پڤدانەكە بە هێواشی گەورە دەبێت كە دەبێتە هۆی بەرێكردنی ئیشێك لەسەر هەوای دەرەوەی پڤدانەكە لە هەمان كاتدا وزەش بە شێوەی گەرمی بۆ پڤدانەكە دەچێت. بەرەنجامی هەردوو كردارەكەش ئەوە دەبێت كەپلەی گەرمی هەوای ناو پڤدانەكە یەكسان دەبێت بە پلەی گەرمی هەواكەی دەرەوە. بەوەش وزەی ناوەكی هەوای ناو پڤدانەكە ناگۆڕێت، چونكە ئەو وزەیەیی كە لە پڤدانەكەدا وون بووە بە هۆی كردنی ئیشەوە ئەو وزەیە جێگەی دەگرێتەوە كە بە شێوەی گەرمی بۆ پڤدانەكە هاتووە. بڕوانە وێنەی **4-16** .

ئەم ڕێگەیە لەوانەیە ڕێگەیەكی باش بێت بۆ كرداری ئایزۆثرمی (بەنەگۆڕانی پلەی گەرمی) لە هەموو كردارێكی ئایزۆثرمیدا Isothermal process پلەی گەرمی بە نەگۆڕی دەمێنێتەوە هیچ گۆڕانێك بەسەر وزەی ناوەكیدا نایەت كاتێك ئاڵوگۆڕكردنی وزە لەگەڵ سیستەمەكەدا ڕوودەدات بە شێوەی گەرمی یان ئیش. لەوانەیە بەلاتەوە سەیربێت كە چۆن ئاڵوگۆڕی گەرمی لە نێوان هەوای ناوەوە و دەرەوەی پڤدانەكەدا ڕوویدات هەرچەندە هەردووكیان لە هەمان پلەی گەرمیدابن. چونكە ئێمە وامان بیستووە هەر كاتێك جیاوازی لە پلەی گەرمیدا نەبێت ئاڵوگۆڕكردنی گەرمی ڕونادات بەڵام ئەگەر كرداری ئایزۆثرمیك بە كۆمەڵێكی زۆر كرداری یەك لەدواییەك دابنێین ئەوا گۆڕانێكی كەم ڕودەدات وێنەی **4-17** دا.




**وێنەی 4-16**
دەتوانین بەنزیكەیی كرداری ئایزۆثیرمی جێبەجێ بكەین (لە پلەیەكی گەرمی نەگۆڕدا) ئەگەر وزە لە سیستەمێك وەربگرێت بە شێوەی ئیش و جێگەكەشی بەهەمان بڕ لە گەرمی پڕ بكرێتەوە.




**وێنەی 4-17**
لە کردارێکی ئایزۆثرۆمیدا بۆ پڤدانەکە ( أ ) کاتێك کەمێك فوودەکرێتە پڤدانەکەوە و قەبارەکەی زیاد دەکات برێکی کەم لەوزە دەداتە دەوروبەرەکەی (ب) هەوای ناو پڤدانەکە وزە بە شێوەی گەرمی هەڵدەمژێت (جـ) بە خێرایی هاوسەنگی گەرمی ڕوودەدات.

کاتێك گازی ناو پڤدانەکە دەکشێت وزە ناوەکییەکەی و پلەی گەرمییەکەی کەمێك نزم دەبێتەوە وەتەنها بەو نزم بونەوەش وزە بە شێوەی گەرمی لە هەوای دەوروبەرەوە بۆ ناو پڤدانەکە دەچێت. ئەنجامی ئەوەش وزەی ناوەکی و پلەی گەرمی ناو پڤدانەکە بۆ نرخە بنچینەییەکەی بەرز دەبێتەوە لە بەر ئەوەی بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەکە زۆربە خێرایی ڕوودەدەن لە چاو کرداری ئاڵوگۆڕکردنی ئیش و وزەدا بۆیە لەڕووی کردارییەوە وزەی ناوەکی هەوای ناو پڤدانەکە نەگۆڕ دەبێت.

## کرداری ئادیاباتێکی و ئاڵوگۆڕنەکردنی گەرمی

کاتێك بوتڵێکی پڕ لە گاز بەکاردەهێنرێت بۆ فوو تێکردنی پڤدانێك، فووتێکردنەکە زۆر بە خێرایی ڕوودەدات، بە پێچەوانەی ئەو فووتێکردنە هیواشەی لە کردارە ئایزۆثرمیەکەی پێشوەوە ڕویدا. لەکاتی فووتێکردنی خێرادا وزەی ناوەکی بە نەگۆڕی نامێنێتەوە چونکە پەستانی گازی ناو بوتڵەکە نزمدەبێتەوە لە گەڵیشیدا پلەی گەرمی و وزە ناوەکییەکەشی کەم دەکات.

ئەگەر بوتڵ و پڤدانەکە جیاکراوەبن ئەوا ئاڵوگۆڕکردنی گەرمی لەگەڵ گازە کشاوەکەدا ڕوونادات، چونکە کردارەکە زۆربە خێرایی ڕوودەدات بواری ئەوە نادات وزە ئاڵوگۆڕ بکرێت، وە هەر کاتێکیش وزە لەگەڵ نیزامەکەدا بەشێوەی گەرمی ئاڵوگۆڕ نەکرا ئەوا بەکردارەکە دەگوترێت **کرداری ئادیاباتی** adiabatic process بۆیە دەبێت نزم بونەوەی وزەی ناوەکی یەکسان بێت بەو وزە ئاڵوگۆڕکراوەی بە شێوەی ئیش لەگەڵ گازەکەدا ڕوودەدات. گازەکە ئیش لەسەر دیواری ناوەوەی پڤدانەکە دەکات بەوەش دژی ئەو پەستانە دەوەستێت کە هەواکەی دەرەوە دەیخاتە سەر پڤدانەکە، بەوەش پڤدانەکە هەڵدەئاوسێت **وێنەی 4-18** تێبینی بکە کە خێرا هەڵئاوسانی پڤدانەکە یەکێکە لە کردارە ئەدیاباتیە نزیك کراوەکان برێك وزە بە شێوەی گەرمی ئالو گۆڕکراوە چونکە پڤدان و بوتڵەکە بەتەواوەتی جیاکراوە نەبوون، نزمبوونەوەی وزەی ناوەکی و پلەی گەرمی گازە بە خێرایی کشاوەکە هاوکات دەبێت لە گەڵ نزمبوونەوەی خێرای پلەی گەرمی ڕووی دەرەوەی بوتڵەکە لەکاتی لێچونی.

### ئایا دەزانیت؟

نەگۆڕانی وزەی ناوەکی لە کردارێکی ئایزۆثرمیدا تەنها بۆ ئەو سیستمانە ڕاستە کە دۆخ گۆڕانیان تێدا ڕوونادات، لەکاتی دۆخ گۆڕاندا وەك گۆڕانی ئاو بۆ هەڵم پلەی گەرمی بە نە گۆڕی دەمێنێتەوە هەر چەندە وزە ناوەکیەکە زیاد دەکات.

**کرداری ئادیاباتیکی**

کردارێکی داینەمیکی گەرمییە کە تیایدا ئاڵوگۆڕکردنی وزە لە نێوان سیستم و دەوروبەرەکەیدا تەنها بە شێوەی ئیش ڕوودەدات. نەك بە شێوەی گەرمی.

گازە پەستێنراوەکەدا. لەگەڵ کۆتایی هاتنی کشانی ئادیاباتیکی دا پلەی گەرمی گازەکە بە هێواشی بەرز دەبێتەوە لەوکاتەدا وزەی گەرمیش لە هەوای دەرەوەوە دەچێت بۆ ناو بوتڵەکە، هەریەکەلەم کشان (شاشبوون) و پەستاوتنە ئەدیاباتیکیەی گاز لە زۆربەی بەجێهێنانەکاندا بەکاردەهێنرێت وەك ساردکەرەوەکان، بزوێنەرەناوك سوتەکان، وەك لە بەندی دووەم دا دەبینرێت، پەستاوتن و کشانێکی خێرای گازەکانی دەوێت ئەگەر وا دابنێیت کردارە بەرهەمە هاتوەکان ئەدیاباتیکن ئەتوانین پێشبینی ڕێگەکانی کارکردنی ئامێرەکان بکەین.




**وێنەی 4-18**
لەگەڵ کشانی خێرایی گازی ناو بوتڵەکەدا وزەی ناوەکی نزمدەبێتەوە ئەم وزەیەش بە شێوەی ئیشی بەڕێکراو دەچێت بۆ هەوای دەرەوەی بوتڵەکە.

## پێداچوونەوەی بەندی 3-4

**1.** لە چ بارێك لەمانەی خوارەوەدا وزە بە شێوەی گەرمی دەگوێزرێتەوە بۆ سیستمەکە بۆ ئەوەی بتوانێ ئیش بەرێبکات وە لە کامیشیاندا ئیش لەسەر سیستمەکە بەڕێدەکرێت. بۆ ئەوەی وزەی بە شێوەی گەرمی لێوە بگوێزرێتەوە .

أ. لێکخشاندنی دوو دار لە یەکتری بۆ کردنەوەی ئاگر

ب. تەقاندنەوەی ترەقە ئاگراویەکان (فیشەکەشێتە).

جـ. وازهێنان لە تولّە ئاسنێکی گەرم بۆ ئەوەی ساردبێتەوە.

**2.** جۆری ئەم کردارانەی خوارەوە چین ئایا ئایزۆثرۆمیە، یان نەگۆڕانی قەبارەیە، یان ئەدیاباتکیە؟

أ. فووتێکردنی تایەیەك بەخێرای.

ب. فووتێکردنی تایەیەك بە بێ ئەوەی پلەی گەرمیەکەی بگۆڕێت.

جـ. گەرمکردنی دەفرێکی پۆڵاین کە گازی تێدابێت.

**3.** تێکەڵەیەك لە هەڵمی گازولین و هەوا لە لولەکی (پستنی) بزوێنەرێکدایە کە ڕووبەری پانە برگەکەی $7.4 \times 10^{-3}$ m$^2$ . پەستێنەری لولەکەکە بە بڕی $7.2 \times 10^{-2}$ m بەرە و ناوەوە پاڵی پێوەنرا. ئەگەر ئەو پەستانەی کە خراوەتە سەر پەستێنەرەکە $9.5 \times 10^5$ Pa بێت، ئایا ئیشی بەڕێکراو لەم کردارەدا چەندە؟ ئایا ئەو ئیشە تێکەڵە گازەکە کردویەتی یان لەسەری کراوە؟

**4.** **فیزیا لەژیانی ڕۆژانەماندا** ئەو باڵۆنەی بۆ لێکۆڵینەوەی باری ئاو و هەوا (کەش) بەکاردەهێنرێت بە هێواشی دەکشێت کاتێك وزەی گەرمی لە هەوای دەرەوە بۆ دەچێت ئەگەر تێکرای پەستانی $1.5 \times 10^3$ Pa بێت و زیادبون لە قەبارەکەیدا بکاتە $5.4 \times 10^{-5}$ m$^3$. ئایا ئیشی بە ڕێکراو بە هۆی گازەکشاوەکەوە چەندە؟ و ئایا ئەوکردارە چ کردارێکی داینەمیکی گەرمی دەنوێنێت.

# پوختەی بەشی 4

## زاراوە بنەڕەتییەکان

**هاوسەنگی گەرمی**
Thermal equilibrium لا 80

**گەرمی** Heat (لا 81)

**وزەی ناوەکی** Internal energy (لا 82)

**فراوانی گەرمی تایبەتی**
Specific heat capacity (لا 87)

**پێوانی گەرمی** Calorimetry (لا 88)

**دۆخ گۆڕان** Phase change (لا 93)

**گەرمی شلبوونەوە** Heat of fusion (لا 94)

**گەرمی کوڵاندن**
Heat of vaporization (لا 94)

**ماتە گەرمی** Latent heat (لا 94)

**دەوروبەرە ناوەند**
Environment (لا 100)

**سیستمی داینەمیکی گەرمی**
thermo dynomic System (لا 100)

**کردار لەکاتی نەگۆڕانی قەبارەدا**
IsovolumetricI (لا 102)

**کرداری ئایزۆثرمی**
Isothermal process (لا 103)

**کرداری ئادیاباتیکی**
Adiabatic process (لا 104)

## بیرۆکە بنەڕەتییەکان

### بەندی 4-1 پلەی گەرمی و بڕی گەرمی

- پلەی گەرمی دەگۆڕێت بەهۆی پێدانی وزە بە ماددیەك یان بەهۆی وزە لێوەرگرتنەوە
- هاوسەنگی گەرمی بارێکە تیایدا پلەی گەرمی دووتەنی بەریەککەوتوو یەکسان دەبێت.
- گەرمی ئەو وزەیەیە کە لە تەنێکی پلە گەرمی بەرزەوە دەچێت بۆ تەنێکی تر کە پلەی گەرمییەکەی نزمترە.
- وزە پارێزراو دەبێت ئەگەر هەریەکە لە وزەی میکانیکی و وزەی ناوەکی لەبەرچاو بگرین.

### بەندی 4-2 گۆڕان لە پلەی گەرمی و گۆڕان لە دۆخدا

- پێناسەی فراوانی گەرمی تایبەتی دەکرێت کە پێوەرێکە بۆ وزەی پێویست بۆ بەرزکردنەوەی پلەی گەرمی 11kg لە ماددەیەك بویەك پلەی سلیزی بەم پەیوەندییە $\boxed{c_p = \frac{Q}{m\Delta T}}$
- ماتە گەرمی بەوە پێناسە دەکرێت کە وزەی پێویستە بۆ گۆڕینی یەکە یەکی بارستایی لەماددەیەك لەدۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر بەم پەیوەندییە. $\boxed{L = \frac{Q}{m}}$

### بەندی 4-3 پەیوەندی گەرمی بە ئیشەوە

- سیستم پێکدێت لە تەنێك یان لە چەند تەنێك کە لەگەڵ یەکتردا لە باری هاوسەنگیدا بن و بڕێکی نەگۆڕی ماددەی هەیە، بەڵام هەموو ئەوەی کە دەوری سیستمەکەی داوە ناوەندی دەوروبەر دەنوێنێت.
- دەتوانین وزە بەشێوەی ئیش یان گەرمی یان هەردووکیان بە سیستمێك بدرێت یان لێی وەربگیرێت، بەهۆی ئەو کردارەشەوە گۆڕان لە وزەی ناوەکیدا دروست دەکرێت.
- ئیشی بەرێکراو لەسەر گازێك لەژێر پەستانی نەگۆڕدا بەوە پێناسە دەکرێت کەوا دەکاتە سەرئەنجامی لێکدانی پەستانی گازوگۆڕان لەبڕی قەبارەکەیدا. $\boxed{W = P\Delta V}$

### هێمای گۆڕاوەکان

| هێندەکان | یەکەکانی | هێندەکان | یەکەکانی |
|---|---|---|---|
| $T_K$ پلەی گەرمی (کلڤن) | $K$ کلڤن | $Q$ گەرمی | J جوڵ |
| $T_C$ پلەی گەرمی (سلیزی) | C° پلەی سلیزی | $c_p$ فراوانی گەرمی تایبەتی لەژێر پەستانی جێگیردا | J/kg. °C |
| $T_F$ پلەی گەرمی (فەهرەنهایت) | F° پلەی فەهرەنتی | | |
| $\Delta U$ گۆڕان لە وزەی ناوەکی | J جوڵ | $L$ گەرمی شاراوە | J/kg. |

### هێمای شێوەکان





# پێداچوونەوەی بەشی 4

## پێدابچۆرەوە و هەڵیسەنگێنە

## پلەی گەرمی و بڕی گەرمی

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**1.** پەیوەندی چییە لە نێوان پلەی گەرمی و وزەی ناوەکی؟

**2.** تایبەتمەندیەك دەست نیشان بکە بۆ ئەوەی ئەوە دیاری بکات کە دوو تەن لە باری هاوسەنگی دان.

**3.** کام لە بارەکانی وێنەی 4-22 ئاراستەی راست و دروستی گوێزانەوەی وزە دەردەخات لەنێوان پارچە سەهۆڵێك و دیواری بەفرگرەدا لە کاتێکدا کە پلەی گەرمی هەر یەکەیان $-10^{o}C$؟ باسی بکە.




وێنەی 4-24

**4.** کوپێك ئاو لەپلەی گەرمی $8^{o}C$ دایە لەچ بارێکدا وزە زیاتر ئاڵو گۆڕ دەکرێت کاتێك پلەی گەرمی هەوا $25^{o}C$ یان $35^{o}C$ بێت.

**5.** بڕی وزەی ئاڵوگۆڕکراو لە نێوان پارچە نانێك و فرنێکدا چەندە کاتێك هەردووکیان هەمان پلەی گەرمیان هەبێت $55^{o}C$؟ باسی بکە.

### پرسیار دەربارەی چەمکەکان

**6.** کام لەم جووتانەی خوارەوە وزەی ناوەکی زیاتریان هەیە؟ ئەگەر بزانێت کە پلەی گەرمی هەر یەکە لە جووتەکان یەکسانە؟ باسی هەر بارێك بکە.

أ. چەقۆیەکی کانزایی و سینیەکی فرن کە لە باری هاوسەنگیدا بن.

ب. پارچە سەهۆڵێك بارستایەکە ( 1 kg ) لە پلەی گەرمی ( $-25^{o}C$ ) وە حەوت پارچە سەهۆڵی تر کە بارستایی هەر یەکێکیان ( 12 g ) لە پلەی گەرمی ( $-25^{o}C$ ) دایە.

**7.** وادابنێ هەر جووتێك لە جووتەکانی پرسیاری ( 6 ) هەمان وزەی ناوەکیان هەیە لەجیاتی یەکسان بوونی پلەی گەرمیان، ئایا کام تەن لەهەر جوتێکیاندا پلەیەکی گەرمی بەرزتری دەبێت؟

**8.** بۆچی خاڵی کوڵانی ئاوو خاڵی شلبوونەوەی سەهۆڵ لە پلەی گەرمی لەشی مرۆڤ باشترن بۆرێکخستنی گەرمی پێوەکان؟

**9.** ئەگەر ئاوی ناو دەفرێکی داخراوی جیاکراوەمان جوڵاند ئایا پلەی گەرمیەکەی بەرز دەبێتەوە یان نزم دەبێتەوە؟ یان وەك خۆی دەمێنێتەوە؟ وەڵامەکەت ڕوونبکەرەوە.

**10.** بە ڕەچاوکردنی وەڵامەکەت لە پرسیاری ( 9 )دا، بۆچی جوڵاندنی کوپێك قاوەی گەرم دەبێتە هۆی ساردبوونەوەی؟

**11.** دوو تەنی جیاوازت دراوەتێ، ئەو تەنەیان کە پلەی گەرمیەکەی بەرزترە بڕی گەرمیەکەی زۆرترە، هەڵەی ئەمەی سەرەوە چییە؟

**12.** جوڵە بیردۆزی گەردیلەو تەنۆلکەکان بەکاربهێنە بۆ لێکدانەوەی هۆی ئەوەی کە بۆچی هەمیشە وزە لەو تەنانەوە کە پلەی گەرمیان بەرزترە بۆ ئەو تەنانەی کە پلە گەرمیان نزمترە دەچێت؟

**13.** لەکام لەم دووبارەی خوارەوەدا وزە زیاتر ئاڵوگۆڕ دەکرێت وەڵامەکەت ڕوونبکەوەرە.

أ. کوپێك نسکافە لە پلەی گەرمی $40^{o}C$ دا لەناو بەفرگرێك دانراوە کە پلەی گەرمییەکەی $-20^{o}C$ ؟

ب. کوپێك نیسکافەی گەرم پلەی گەرمییەکەی $90^{o}C$ لە ژوورێکدایە کە پلەی گەرمیەکەی $25^{o}C$ یە.

### پرسیارەکانی ڕاهێنان

**14** بەرزترین پلەی گەرمی کە لە سەر رووی زەوی گەیشتۆتە $136^{o}F$ ئەویش لە ناوچەی عەزیزیەی لیبیا لە ساڵی 1922 تۆمارکرا، ئەو پلە گەرمیە بە هەر یەکە لە پێوەری سیلیزی و گلڤن بنوسە.

**15** پلەی گەرمی شل بوونەوەی زێڕ $1947^{o}F$ ، ئەو پلەیە بە پێوەری سیلیزی و گلڤن بنووسە.

**16.** هێزێك برەكەی N 315 ئاسۆییانە خرایە سەر سندۆقێكی تەختەو لادانی ( m 35.0 ) ی لەسەر زەویەكی ئاسۆیی پێبڕی بەخێراییەكی نەگۆڕ. بەهۆی بەرێكردنی ئیشەوە وزە ناوەكیەكەی بەبڕی 14% نرخە سەرەتاییەكەی زیاد دەكات ئایا وزەی ناوەكی سندوقەكە چەندە؟ سەیری نموونەی ( 4 ) (أ) بكە.

**17** بزمارێك بارستایەكەی 0.75 kg بە یەكێك لە پارچەكانی هێڵی شەمەندەفەرێكدا كوترا بە سەرەتا خێرایی 3.0 m/s

أ. ئەگەر بزمارەكەو پارچەكە لە ( % 85 )ی جووڵە وزەی سەرەتایی بزمارەكە هەڵبمژن ئایا زیادبوون لە بڕی وزەی ناوەكی بزمارەكەو پارچەكەدا چەندە؟

ب. چی بەسەر وزە پاشماوەكەدادێت (سەیری نموونەی 4 (أ) بكە.

## گۆڕان لە پلەی گەرمی و گۆڕان لەدۆخدا

### پرسیارەكانی پێداچوونەوە

**18.** ئەو داتایانە چین كە پێویستمان پێیان دەبێت بۆ دیاری كردنی فراوانی گەرمی تایبەتی ماددەیەكی نەناسراو، بەبەكارهێنانی پێوانی گەرمی؟

**19.** ئەو رێسایە چییە كە رێگە دەدات بە بەكارهێنانی پێوانی گەرمی بۆ دیاری كردنی فراوانی گەرمی تایبەتی ماددەیەك؟ باسی بكە.

**20.** بۆچی كە سەهۆڵ شلدەبێتەوە پلەی گەرمییەكەی بەرز نابێتەوە، هەرچەندە وزەی گەرمیشی دەدرێتێ؟

### پرسیار دەربارەی چەمكەكان

**21.** بۆچی بەهەڵمبوونی ئاودەبێتە هۆی ساردبوونەوەی هەوای سەر ڕووی ئاوەكە؟

**22.** فراوانی گەرمی تایبەی كحولی ئەثیلی دەكاتە نیوەی فراوانی گەرمی تایبەتی ئاو، ئەگەر دووبڕی یەكسان لە وزە بە هەریەكە لە دوو بڕی یەكسان لە كحول و ئاو بدرێت لە دوو دەفری جیاواز و لە هەمان پلەی گەرمی دا. ئایا پلەی گەرمی كامیان بەرزتر دەبێت؟

**23.** پێش داهێنانی بەفرگرە، زۆربەی خەڵك سەوزە و میوەیان لە حەشارگەی ژێر زەوی دا هەڵدەگرت. بۆچی ئەو حەشار گرانە باشتربوون وەك لەوەی لەبەرهەوادا بە جێبهێڵرێت؟

**24.** لە وەرزی زستاندا، مرۆڤەكانی پرسیاری 23 بەرمیلێكی پڕ لە ئاوی دەم كراوە لە تەنیشت خواردنەكانەوە لە حەشارگەكەدا دادەنێن هۆی دانانەكەی چی یە؟ كاریگەری ئەم رێگەیە چییە؟

**25.** لە دەمە ساردەكانی ساڵ دا باخەوانەكانی دار پرتەقاڵ ئاو ڕشێنی دارەكانیان بەشەو دەكەن. ئایا ئەوە یارمەتی چی دەدات؟

**26.** چەماوەی گەرم كردن بۆ ماددەیەكی دیاریكراو كە بارستایی یەكەی 23 g بەكاربهێنە بۆ خەمڵاندنی ئەم تایبەتمەندیانەی خوارەوەی ماددەكە، بڕوانە وێنەی **4-25** .

أ. فراوانی گەرمی تایبەتی شلەكە.

ب. ماتە گەرمی شل بوونەوە.

ج. فراوانی گەرمی تایبەتی تەنە ڕەقەكە.

د. فراوانی گەرمی تایبەتی هەڵمەكە.

هـ. ماتە گەرمی بە هەڵمبوون.




وێنەی **4-25** .

### پرسیارەكانی ڕاهێنان

**27.** گوستیلەیەكی زیو بارستەیەكەی $2.55 \times 10^{-2}$ kg فراوانی گەرمی تایبەتییەكەی ($c_p$ = 234 J/kg•°C) هەتا پلەی گەرمی 84.0°C گەرم كرا، ئینجا فرێدرایە ناو گەرمۆكە پێویكەوە كە $5.00 \times 10^{-2}$ Kg ئاوی تێدا بو لە پلەی گەرمی 24.0°C و گەرمۆكە پێوەكەش بە تەواوەتی جیانەكرابووەوە بۆیە بڕێك وزە كە 0.140 kj بو بە شێوەی گەرمی دزەی كردە بۆشاییەكەی دەوروبەر پێش ئەوەی تێكەڵەكە بگاتە دوا پلەی گەرمی، دوا پلەی گەرمی چەندە؟ ئەو گەرمیە فەرامۆش بكە كە گەرمۆكە پێوەكە وەریگرتووە (بڕوانە نموونەی 4 (ب) )

**28.** کاتێك شۆفێرێك برێك دەگرێت، ئەولێکخشاندنەی لە نێوان فلنجەکان و بەنسەکاندا ڕوودەدات برێك لە جووڵە وزە دەگۆڕێت بۆ وزەی ناوەکی. ئەگەر ئەو ئوتومبێلەی بەهۆی برێك گرتنەکەوە دەوەستێت بارستاییەکەی $1500\ kg$ و خێراییەکەشی $32\ m/s$ بێت ئایا پلەی گەرمی هەر یەکە لە چوار فلنجەکە چەند بەرز دەبێتەوە کاتێك بارستایی هەر یەکێکیان $3.5\ kg$ بێت؟ فلنجەکان لە ئاسن دروستکراون $(c_p = 448\ J/kg{\cdot}C^o)$ وادابنێ کە وزەکەی بەیەکسانی بەشێوەی وزەی ناوەکی بەسەر هەر چوار پێچکەکەدا دابەشبووە؟ سەیری نموونەی 4 (ب) بکە.

**29.** سندوقێکی ساردی پارێز cool box لە گەشتیکدا وەك ساردکەرەوە بەکاردەهێنرێت،. قاڵبێك سەهۆڵی تێدایە لە پلەی گەرمی $0^oC$ ئەگەر $2.25 \times 10^{-1}\ kg$ لەو سەهۆڵە شلببێتەوە ئایا بڕی ئەو گەرمیەی لە ڕێگەی دیواری سندوقەکەوە چووەتە ناو سندوقەکەوە چەندە؟ سەیری نموونەی 4 (ج) .

**30.** یەکێك لە دەریاچە گەورەکانی کەنەدا نزیکەی $1.20 \times 10^{16}\ kg$ ئاوی تێدایە ئەگەر پلەی گەرمی دەریاچەکە $12.0^oC$ بێت، بڕی ئەو گەرمیە چەندە کە پێویستە لە دەریاچەکە وەربگیرێت بۆ ئەوەی بە تەواوەتی بیبەستێت لە $0^oC$ دا سەیری نموونەی 4 (ج) بکە.

## گەرمی و ئیش و وزەی ناوەکی

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**31.** پێناسەی سیستمی داینەمیکی گەرمی و دەوروبەرە ناوەند بکە.

**32.** ئەو دوو ڕێگەیە کامانەن کە بە هۆیەوە دەتوانرێت وزەی ناوەکی سیستمێك بەرزبکرێتەوە؟

**33.** کام لەم دەستەواژانەی خوارەوە یەکەکانیان هاوتای یەکەی ئیشە.

أ. $mg$      د. $Fd$

ب. $\frac{1}{2}mv^2$      هـ. $P\Delta V$

ج. $mgh$      و. $V\Delta T$

**34.** کام لەم هێندە داینەمیکیە گەرمیانە ( $\Delta U$ ، $Q$ ، $W$ ) نرخەکەی دەکاتە سفر؟

أ. کرداری ئایزۆثرمی Isothermal process

ب. کرداری ئادیاباتیکی Adiabatic process

ج کردارێك کە قەبارە تێیدا نەگۆڕێت Isovolumetricl

### پرسیار دەربارەی چەمکەکان

**35.** ئایا دەکرێت وزە بدرێت بە ماددەیەك یان لێی وەربگیرێت بە بێ ئەوەی پلەی گەرمیەکەی یان دۆخەکەی بگۆڕێت ئەوە باس بکە.

**36.** کاتێك گازی نموونەی بە شێوەیەکی ئادیاباتکی دەکشێت، ئیشێك لەسەر دەوروبەرە ناوەندەکەی دەکات هەموو ئەو ئاڵوگۆڕکردنانەی لە وزەدا ڕوودەدات باس بکە؟

**37.** لە هەریەکە لەم دوبارەی خوارەوەدا چ ئاڵوگۆڕێکی وزە (بەشێوەی گەرمی یان ئیش) وە گۆڕانی وزەی ناوەکی ڕوودەدات باسی بکە.

أ. لێکخشاندنی هەردوو لەپی دەستت لەسەر یەکتر.

ب. لە کاتی کونکردنی پارچە کانزایەکدا ئاوبکەرە کونەکەوە دەستبەجێ هەڵمی لێ بەرز دەبێتەوە.

**38.** بۆیە پرژێنێك لە پلەی گەرمی ژووردایە و بۆ ماوەی $30\ s$ بەکار هێنرا، بەوەش پلەی گەرمییەکەی دابەزی. ئەو کردارە داینەمیکیە گەرمییەی کە بەسەر ئەوبڕەکەمەی گازی دەرچوو لە بۆیە پرژێنەکەوە دێت چییە کاتێك لە ناوچەیەکی پەستان بەرزی ناو قوتوەکەوە دێتە دەرەوە بۆ هەواکەی دەوروبەری؟

**39.** بۆیە پرژێنەکەی پرسیاری 38 بۆماوەی سەعاتێك دانرا تا پلەی گەرمیەکەی وەکو پلەی گەرمی ژوری لێ هاتەوە، کام لە کردارە داینەمیکیە گەرمیەکان لە کاتی بەکار نەهێنانی بۆیە پرژێنەکەدا ڕووی داوە؟

### پرسیارەکانی ڕاهێنان

**40.** بڕی ئەو ئیشەی کراوە چەندە بۆ ئەوەی قەبارەی چوپێك لە $35.25 \times 10^{-3}\ m^3$ وە بکرێت بە $39.47 \times 10^{-3}\ m^3$ لە ژێر پەستانی کەش دا، کە بەبڕی $2.55 \times 10^5\ Pa$ زیاترە لە پەستانی هەوای ئاسایی ئایا ئیش لەسەر گازەکە کراوە یان بە هۆیەوە ئیش کراوە (سەیری نموونەی 4 (د) ) بکە.

**41.** گازی هیلیۆم لە باڵۆنێکی یاریکردندا ئیشێك لەسەر دەوروبەرەکەی دەکات کاتێك دەکشێت لە ژێرپەستانی $2.52 \times 10^5\ Pa$ دا. قەبارەی سەرەتای باڵۆنەکە $1.10 \times 10^{-4}\ m^3$ وەدوا قەبارەکەی $1.50 \times 10^{-3}\ m^3$ یە، ئەم داتایانە بەکاربهێنە بۆ هەژمارکردنی ئەو ئیشەی بە هۆی گازەکەوە کراوە سەیری نموونەی 4 (د) بکە.

## پرسیارەکانی پێداچوونەوە گشتی

**42.** پێناسەی پلەی گەرمی سفری پەتی لە پێوەری رانکین بەپێ ی یاسای TR = 0ºR بەڵام یەکەی پێوانی هەمان یەکەی پێوانی فهرنهایتی یە.
أ. پەیوەندییەك دابنێ لە نێوان پێوەری رانکین و فهرنهایت.
ب. پەیوەندییەك دابنێ لە نێوان پێوەری رانکین و گلڤن.

**43.** بەردێك بارستاییەکەی 3.0 kg لە لوتکەی کەندەڵانێکدا جێگیربوە وادابنێ بەردەکە کەوتە ناو ئاوێکەوە کە لە خوارکەندە ڵانەکەدایە. و هەموو جووڵە وزەکەی دایە ئاوەکە. ئایا بەرزی کەندە ڵانەکە چەندە ئەگەر پلەی گەرمی 1.0 kg ئاو بە بڕی 0.10ºC بەرزبێتەوە.

**44.** ئەم دوو پلە گەرمی یەی خوارەوە بگۆڕە بوو هەریەکە لە پێوەری فەهرەنهایت و گلڤن.
أ. پلەی گەرمی کوڵانی هایدرۆجینیشل (−252.87ºC).
ب. پلەی گەرمی ژور کە دەکاتە 20.5ºC .

**45.** بیسەلمێنە پلەی گەرمی 40ºC- لە هەریەکە لە پێوەری سلیزی و فەهرەنهایەتیدا هەمان نرخیان هەیە.

**46.** گەرمکەرێکی ئاو بە وزەی خۆرکاردەکات ئەگەر روبەری گەرمکەرەکە $6.0\ m^2$ بێت توانای تیشکی خۆریش $550\ W/m^2$ ئایا چەند کات پێویستە بۆ ئەوەی پلەی گەرمی $1.0\ m^3$ ئاو لە 21ºC بگاتە 61ºC ؟

**47.** خوێندکارێك دوو تەن دەخاتە یەك دەفری پۆڵاینەوە کە بارستاییەکەی 120 g و 150 g ئاوی لە 25ºC دا تێدایە تەنی یەکەم پارچە مسێك بوو بارستاییەکەی 253 g و لە پلەی گەرمی 85ºC وەتەنی دووەم پارچە فافۆنێك بوو لە پلەی گەرمی 5ºC ، خوێندکارەکە سەری سوڕما بینی دوا پلەی گەرمی تێکەڵەکە یەکسان بووبە پلەی گەرمی سەرەتایی ئاوەکە واتە 25ºC ئایا بارستایی پارچە ئەلەمنیۆمەکە چەندە؟

**48.** مەنجەڵێکی ئەلەمنیۆمی بارستاییەکەی 250 g و 850 g ئاوی تێدایە لە پلەی گەرمی 83ºC دا. مەنجەڵ و ئاوەکە بەڕێکی ساردکرانەوە و بە تێکرای 1.5ºC بۆ یەك خولەك. ئایا تێکڕای گواستنەوەی وزە لێیانەوە چەندە؟

**49.** قۆرییەك 180 g چای تێدایە و لە ژێر تیشکی خۆردا دانراو پلەی گەرمی یەکەی بووبە 32ºC . بۆ مەبەستی ساردکردنەوەی چایەکە پارچە سەهۆڵێکی تێکرا بارستایی یەکەی 112 g و پلەی گەرمی یەکەی 0ºC ئایا لەو ساتەدا کە پلەی گەرمی چایەکە دەبێتە 15ºC بارستایی ئەو سەهۆڵەی بە سەهۆڵی دەمێنێتەوە چەندە؟ وادابنێ فراوانی گەرمی تایبەتی چا یەکسانە بە فراوانی گەرمی تایبەتی ئاو.

## هەڵسەنگاندنی بەجێهێنان

**1.** یەكێك لە پێشكەشكەرانی بەرنامەی خواردن دروستكردن لە تەلەفزیۆندا لەو باوەڕەدایەكە دەتوانێت پەتاتە لەكاتێكی زۆر كەمدا و زۆر بە خێرایی بكوڵێ ئەگەر بێتو تۆ هەر سەلكە (دانە) پەتاتەیەك بزمارێكی پێدادا بكوتیت لەو بۆچونە بكۆڵەرەوە بزانە ئایا هیچ بنچینەیەكی زانستی هەیە؟ ئایا وا باشترنیە كە هەر سەلكە پەتاتەیەك بە ئەلەمنیۆمی تەنك دابپۆشرێت. هەموو بەهانەكان بڵێ. وەخاڵە بەهێزەكان وخاڵە لاوازەكان بنوسە.

**2.** چەماوەی كەمكردنەوەی پلەی گەرمی تەنێكی گەرم بە پێی كات پێیدەگوترێت چەماوەی ساردكردنەوە، تاقیكردنەوەیەك ئامادەبكە و جێبەجێی بكە بۆ دیاری كردنی چەماوەی ساردكردنەوەی ئاو لەو بۆریانەدا كە لە ماددەی جیاواز دروستكراون و شێوەشیان جیاوازە، چەماوەی ساردكردنەوە بۆ هەریەكیان بكێشە، كام لە هێڵكاریەكان جیاكردنەوەیەكی باش دەنوێنێت؟ ئەنجامەكان و چەماوەكانت بەكاربهێنە بۆ دروستكردنی سندوقێك كە بتوانێت خواردنەكە بەگەرمی یان بە ساردی بپارێزێت.

**3.** لەگەڵ كەسێكدا قسەبكە كە لە بواری هەوا سازدەر و بەفرگرەدا كاردەكات. دەربارەی ئەو شلگازانەی لەو ئامێرانە دا بە كاردەهێنرێت پرسیاری لێبكە. كە ئەو تایبەتمەندیانەی كە دەبێت لە شلگازی ساردكردنەوەدا هەبن كامانەن؟ باسی بەكارهێنانی فریۆن و پێكهێنەرەكانی بكە و بزانە بۆچی بەپێی بەڵێن نامە نێودوڵەتییەكان نابێت بەكاربهێنرێت؟ ئەو شلگازانەی كە ئەمڕۆ لە هەوا سازدەری ئوتۆمبێل و بەفر گرەكاندا بەكاردەهێنرێن كامانەن؟ وە ئایا هەتا چ پلەیەكی گەرمی دەتوانیت ئەم شلگازانە بەكاربهێنین؟ چاكی و خراپی بەكارهێنانی شلگازێك چی یە؟ لێكۆڵینەوەكەت بە شێوەی ڕاپۆرتێك كورتبكەرەوە.

## هەڵسەنگاندنی دۆسیە

**4.** زانیاری دەربارەی گەرمكەرەكانی وزەی خۆر كۆبكەرەوە كە لە شوێنی ژیانی خۆتدا بەكاردەهێنرێن، هەریەكەیان چۆن ئیش دەكات؟ بەراوردێك بكە لە نێوان نرخی گەرمكەرەكانی وزەی خۆر و تێچوونی ئیشپێكردنی هەریەكەیان، لەگەڵ ئەو گەرمكەرانەی كە بە غازی شل ئیش دەكەن چاكییەكان و گرفتەكانی گەرمكەری وزەی خۆر كامانەن؟ نامیللەیەكی زانیاری ئامادەبكە و دابەشی بكە بەسەر ئەو ماڵانەدا كە گرنگی بەم تەكنیكە دەدەن.

**5.** لەو ڕێگەیە بكۆڵەرەوە كە زاناكان بە هۆیەوە دەتوانن پلەی گەرمی ئەم تەنانەی خوارەوەی پێ بپێون، (خۆر، گڕی مۆم، گڕكان، بۆشایی ئاسمان، نایترۆجینی شل، مشكەكان، مێرووەكان) ئەو ئامێرانەی لە هەر بارێكدا بەكاهێنران چییە بیزانە، وە ڕوونی بكەرەوەكە چۆن بە پێ ی پلە گەرمی‌یە زانراوەكان ڕێك خراون؟ لیستێك بە ناوی ئەو ئامێرانەوە ئامادەبكە كە بۆ پێوانی پلەی گەرمی بەكاردەهێنرێن و پابەندی ووردە كاری تەواوی داوا كراوەكە بە بۆ ئەو پلە گەرمی یانە. (زانیاری یەكانت بەكاربهێنە)

# بـــــەشـــــی 5

# ڕووناکی و دانەوە

# *Light and Reflection*



سیستمی هەوایی یە (ئەنتێنا) گەورەکان کە لە نزیك سۆکۆرۆ لە ناوچەی نیو مەکسیکۆی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادایە پێك دێت لە 27 ئەنتێنا (هەوایی)، تیرەی هەریەکەیان 25 m ، ئەم ئەنتێنایانە ئەو شەپۆلە کارۆموگناتیسی یانە وەردەگرن کە درێژی شەپۆڵەکانیان لە ناوچەی شەپۆڵە ڕادیۆییەکان (لاسلکی) وشەپۆڵە مایکرۆیەکاندان (وردیلەیەکان). ساجی تەلسکۆبەکە شەپۆلە بێ تەلەکان دەداتەوە تیشکەکان چڕ دەکاتەوە ڕووەو وەرگرەی تەلسکۆبەکە کە لەسەر ڕووەکەی جێگیرکراوە ئاڕاستەی دەکات.

## ئەوەی کە پێشبینی بەدیهێنانی دەکرێت

لەم بەشەدا ئاشنا دەبی بە سیفەتەکانی ڕووناکی و شێوەکانی تری تیشکی کارۆموگناتیسی. وە هەروەها فێردەبیت ئاوێنەی گۆیی چۆن ڕووناکی دەداتەوە، وە وێنەی ڕاستەقینە و خەیاڵی تەنەکان چۆن دروست دەکات.

## گرنگییەکەی چییە

ئاوێنە لە ژیانی ڕۆژانەدا بەکاردەهێنرێت هەروەها لە لایەن زاناکانەوە بەکارهێنانی زۆرە، بۆ نموونە لە تەلسکۆبی دانەوەدا دوو ئاوێنە هەیە بۆ کۆکردنەوەو چڕکردنەوەی ڕووناکی وە دانەوەی بۆ گەردبین تەلیسکۆبەکە، ئەم تەلسکۆبە لە لایەن کەشتیەوانانی بۆشایی ئاسمانەوە تاکو ئێستاش بەکاردێت، لەگەڵ ئەوەی 300 ساڵ تێپەڕ بووە بەسەر داهێنانی دا.

## ناوەڕۆکی بەشی 5

# بەندی 1-5 تایبەتمەندییەکانی ڕووناکی

## *Characteristics of Light*

## 1-5 ئامانجەکان

• پێکهێنەرەکانی شەبەنگی کارۆموگناتیسی دیاری دەکات.

• لەرەلەر و درێژی شەپۆلی تیشکە کارۆموگناتیسیەکان هەژماردەکات.

• ئەوە دەناسێنێت کەوا ڕووناکی خێراییەکەی دیاری کراوە.

• باس لە کاریگەری دووری دەکات لەسەر درەوشانەوەی سەرچاوەیەکی ڕووناکی.

### شەپۆلی کارۆموگناتیسی

شەپۆلێکە لەدوو بواری کارەبایی و موگناتیسی لەراوەی ئەستون لەسەر یەکتر پێکهاتووە لەسەرچاوەیەکی دیاری کراوەوە بە خێرایی ڕووناکی دەردەچێت.

## شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکان

لە پاشاندا وردەکاری لەرینەوەکان و شەپۆلەکان دەخوێنین، ئێستا تەنها کورتەیەکی سیفەتەکانی شەپۆل پێشکەش دەکەین. وە بە تایبەتی ئەوانەی کە لە خوێندنی ڕووناکی و دیاردە ڕوناکیەکاندا پێوستمان پێیانە، هەر لەرینەوەیەك لە ناوەندێکی دیاریکراودا شەپۆلێك دروست دەکات کە بەو ناوەندەدا دەگوێزرێتەوە. کاتێك لە شوێنێکدا هاوار ئەکەیت ئەوا لەرینەوەکانی دەنگەکەت لە ڕێی شەپۆلە دەنگەکانەوە دەگەنە گوێی گوێگرێك. هەروەها کاتێك لە ژێی ئامێرێکی مۆزیکی دەدەیت وەك عود، ئەوا لەرینەوەکانی بە شێوەی شەپۆل لە ژێی عودەکەدا دەگوێزرێتەوە. شەپۆلەکان لەهەر ناوەندێکدا بەخێراییەکی دیاریکراو دەگوێزرێنەوە کە پەیوەندیان بە سیفەتەکانی ناوەندەکەوە هەیەو لەسەر شێوەی شەپۆلەکە بەند نییە.

هەر شەپۆلێکی گوێزراوە لەناوەندێکی دیاریکراودا جوولەیەکی بە پاتە کە لە کاتە یەکسانەکاندا خۆی دووبارە دەکاتەوە، هەرکاتێك لەوانە پێدەوترێت کاتە لەرە $T$ وە بە چرکە دەپێورێت (وێنەی 1-5 ). هەروەها لەرەلەری شەپۆل f بەوە پێناسە دەکرێت کە ژمارەی ئەو لەرە لەرانەیە کە شەپۆلەکە لەیەك چرکەدا دەیکات، وە بەوەش دەبێتە هەڵگەراوەی کاتەلەرە واتە:

$$f = \frac{1}{T}$$

لەرە لەر بە یەکەی $1/s$ یان هێرتز $Hz$ دەپێورێت.

شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکان جۆرێکن لە جۆرەکانی شەپۆل. وە ڕووناکیش بەشە بینراوەکەی ئەم شەپۆلانەن، جۆری تری تیشك هەیە کە بەچاو نابینرێت، ئەگەر هەندێك جۆری فلیمی فۆتۆگرافی بۆ پشکنینی ئەو ڕووناکیە بەکاربهێنین کە بە هۆی ئاوێزەوە شیتاڵ کراوە دەبینین فلیمەکە ناوچەیەکی فراوانتر لە ناوچەی ڕووناکی بینراو دەگرێتە خۆی وەك ژێر سوورەکان و سەرو بنەوشەییەکان. جۆرە جیاوازەکانی ئەم تیشکانە لە زۆر سیفەتدا لەیەك دەچن وەك تیشکی X وەشەپۆلە مایکرۆییەکان (وردیلەکان) و شەپۆلە ڕادیۆیەکان (بێ تەلەکان) هۆیەکەش ئەوەیە کە هەموو ئەم شەپۆلانە **شەپۆلی کارۆموگناتیسین** electromagnetic waves .

ڕووناکی بەوە وەسف دەکرێت کە شەپۆلە یان تەنۆلکەیە یان تێکەڵەی هەردووکیانە. هەرچەندە بیردۆزەکەی ئێستا هەردوو بیردۆزی تەنۆلکەیی و شەپۆلی لەیەکداوە، بەڵام شێوە شەپۆلییەکەی گونجاوترە لەگەڵ هەندێك دیاردەی ڕوناکیدا کە لەم بەندەدا بەکاری دەهێنین.




**وێنەی 1-5**

ئەو دوورییەی کە شەپۆلێك لە یەك کاتە لەرەدا دەیبڕێت پێی دەگوترێت درێژی شەپۆل $\lambda$ ، وە بە مەتر m دەپێورێت.

## لەیەکنەچوونی شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکان بەهۆی جیاوازیان لە لەرەلەرو درێژی شەپۆلیاندا.

بیردۆزی کارۆموگناتیسی کلاسیکی دەڵێت ڕووناکی لە دوو بواری لەراوە پێکهاتوە یەکێکیان کارەبایی و ئەوی تریان موگناتیسیە، ئەم دوو بوارە ئەستونن لەسەر ئاڕاستەی بڵاوبوونەوەی شەپۆلەکە وەك لە **وێنەی 2-5** دا دیارە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە شەپۆلی کارۆموگناتیسی شەپۆلی پانرەون. هەروەها هەردوو بواری کارەبایی وموگناتیسی ئەستونن لەسەر یەکتر. شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکان بەپێی لەرە لەرو درێژە شەپۆلە جیاوازەکانیان پۆلێن دەکرێن، لە ناوچەی بینراودا لەرەلەرو درێژی شەپۆلی جیاواز ڕەنگە جیاوازەکان لە یەکتر جیا دەکەنەوە، هەروەها جیاوازی لەرە لەرو درێژی شەپۆل ڕووناکی بینراو لە تیشکە کارۆموگناتیسیەکانی تر وەك (تیشکی X )جیادەکەنەوە. **خشتەی 1-5** جۆرە جیاوازەکانی شەپۆلی کارۆموگناتیسی ڕووندەکاتەوە. تێبینی ئەو مەودا فراوانەی درێژی شەپۆل و لەرە لەر بکە. هەرچەندە خشتەکە چەند ناوچەیەکی جیاواز دەردەخات لە شەبەنگدا.

خشتەی 1-5 شەبەنگی شەپۆلە کارۆموگناتیسییەکان

| ناوی شەپۆلەکان | مەوداکەی | بەکارهێنانی |
|---|---|---|
| شەپۆلی ڕادیۆیی (بێ تەل) | $\lambda > 30$ cm<br>$f < 1.0 \times 10^{9}$ Hz | شەپۆلە ڕادیۆییەکانی AM و FM وە شەپۆلەکانی تەلەڤزیۆنی. |
| شەپۆلە مایکرۆییەکان (ووردیلەکان) | $30$ cm $> \lambda > 1$ mm<br>$1.0 \times 10^{9}$ Hz $< f < 3.0 \times 10^{11}$ Hz | لە ڕادارا، لێکۆڵینەوەی گەردیلەو گەردی مادەکان، فرۆکەوانی، کەشتییەوانی، فرنی شەپۆلە مایکرۆییەکان. |
| شەپۆلی خوار سور (IR) | $1$ mm $> \lambda > 700$ nm<br>$3.0 \times 10^{11}$ Hz $< f < 4.3 \times 10^{14}$ Hz | لەشەبەنگە گەردییە لەراوەکان و وێنەگرتنی فۆتۆگرافی و چارەسەری فیزیایی (سروشتی) ماسولکەکانی لەش |
| ڕووناکی بینراو | (سور) $700$ nm $> \lambda > 400$ nm (بنەوشی)<br>$4.3 \times 10^{14}$ Hz $< f < 7.5 \times 10^{14}$ Hz | وێنەگرتنی فۆتۆگرافی، ووردبینی ڕووناکی و زانستی گەردونی بینایی. |
| تیشکی سەرو وەنەوشەیی (UV) | $400$ nm $> \lambda > 60$ nm<br>$7.5 \times 10^{14}$ Hz $< f < 5.0 \times 10^{15}$ Hz | پاکژکردنەوەی ئامێرە پزیشکیەکان، جیاکردنەوەی کانزا فلۆرییەکان. |
| تیشکی $X$ | $60$ nm $> \lambda > 10^{-4}$ nm<br>$5.0 \times 10^{15}$ Hz $< f < 3.0 \times 10^{21}$ Hz | پشکنینی پزیشکی بۆ ئێسقان و ددان وشانە گرنگەکان وە چارەسەرکردنی لووە شێرپەنجەیەکان |
| تیشکی گاما | $0.1$ nm $> \lambda > 10^{-5}$ nm<br>$3.0 \times 10^{18}$ Hz $< f < 3.0 \times 10^{22}$ Hz | لێکۆڵینەوەی کەلێنەکان لە پێکهاتەی مادده ئەستورەکان. چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی شێرپەنجە و بەرکەوتنی خواردن بەو تیشکانە. |

شەبەنگی کارۆموگناتیسی شەبەنگێکی لێك نەپچراوە، هیچ سنورێکی دیار و ئاشکرا لە نێوان جۆرێکی شەپۆلەکان و جۆرەکەی تریدا نییە. بەڵکو بەیەکداچوونێك لە نێوان مەودای جۆرە جیاوازەکانی شەپۆلدا هەیە.




**وێنەی 2-5**
شەپۆلی کارۆموگناتیسی لە دوو بواری ئەستون لەسەر یەکتر پێکهاتووە (کارەبایی وموگناتیسی).

## خێرایی شەپۆلە کارۆموگناتیسییەکان

هەموو جۆرەکانی شەپۆلی کارۆموگناتیسی بە خێراییەکی زۆر و یەکسان لە بۆشایی دا کە ئەویش خێرایی ڕووناکیە دەگوازرێنەوە. هەوڵە سەرەتاییەکانی پێوانی خێرایی ڕووناکی سەرکەوتوو نەبوون بەهۆی زۆری خێراییەکەوە. لەگەڵ پێشکەوتنی هۆکارە تەکنیکییەکاندا، بە تایبەتی لە سەدەی نۆزدەهەم وسەرەتای بیستەمدا، لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا، خێرایی ڕووناکی بە وردییەکی زۆر پێورا، ڕێژەی هەڵە تیایدا گەیشتە کەمتر لە $0.001\%$ . نرخە زانراوەکەی ئێستای خێرایی ڕووناکی $2.997\ 924\ 58 \times 10^{8}$ m/s ، وە لە هەوادا بە خێراییەکی کەمتر دەگوێزرێتەوە وەدەبێتە $2.997\ 09 \times 10^{8}$ m/s ، لەم کتێبەدا خێرایی ڕووناکی بە $3.00 \times 10^{8}$ m/s دانراوە لە هەر یەکە لە بۆشایی و هەوادا.

ئەو پەیوەندییەی لەرەلەر و درێژی شەپۆل وخێرایی بە یەکترەوە دەبەستێت بریتیە لە:

**هاوکێشە خێرایی شەپۆل**

$$c = f\,\lambda$$

**خێرایی ڕووناکی = لەرەلەر × درێژی شەپۆل**

## نموونە 5 (أ)

**پرسیارەکە**

### شەپۆلە کارۆموگناتیسییەکان

**مەودای شەپۆلی ڕادیۆی AM لە نێوان $5.4 \times 10^5$ Hz و $1.7 \times 10^6$ Hz دایە. ئایا درێژترین درێژی شەپۆل و کورتترین درێژی شەپۆل لەو مەودایەدا چەندە؟**

**شیکار**

**1. دەزانم**

دراو: $f_1 = 5.4 \times 10^5$ Hz $\quad f_2 = 1.7 \times 10^6$ Hz $\quad c = 3.00 \times 10^8$ m/s

نەزانراو: $\lambda_1 = ?$ $\quad \lambda_2 = ?$

**2. پلان دادەنیم**

هاوکێشەی خێرایی شەپۆل بۆ دۆزینەوەی هەردوو درێژی شەپۆل بەکاردەهێنم.

$$c = f\lambda \qquad \lambda = \frac{c}{f}$$

**3. هەژماردەکەم**

$$\lambda_1 = \frac{3.00 \times 10^8 \text{ m/s}}{5.4 \times 10^5 \text{ Hz}}$$ درێژترین درێژی شەپۆل

$$\boxed{\lambda_1 = 5.6 \times 10^2 \text{ m}}$$

$$\lambda_2 = \frac{3.00 \times 10^8 \text{ m/s}}{1.7 \times 10^6 \text{ Hz}}$$ کورترین درێژی شەپۆل

$$\boxed{\lambda_2 = 1.8 \times 10^2 \text{ m}}$$

**4. هەڵدەسەنگێنم**

درێژی شەپۆل پێچەوانە دەگۆڕێت لەگەڵ لەرەلەر ئەگەر خێرایی نەگۆڕێت.

**وەڵامی ئامێری ژمێرەر**

هەرچەندە وەڵامی ژمێرەر ئەمەیە 555.5555556 m و 176.470588 m، دەبێت نزیکی بکەینەوە بۆ دوو ڕەنووسی واتایی چونکە بۆ لەرە لەر تەنها دوو ڕەنووسی واتایی هەیە.

## ڕاهێنانی 5 (أ)

### شەپۆلە کارۆموگناتیسییەکان

1. سەرچاوەی تیشکی گاما تەنە گەردوونیەکانن پرتەی تیشکی گامای وزە بەرز دەردەکەن. ئەگەر لەرە لەری پرتەکان بگاتە $3.0 \times 10^{21}$ Hz ، ئایا درێژی شەپۆلی ئەو پرتانە چەندە؟
2. مەودای درێژی شەپۆل بۆ مەودای شەپۆلەکانی Fm (88 MHz - 108 MHz) چەندە؟
3. شەپۆلە ڕادیۆییە کورتەکان لە نێوان ئەم دوو لەرە لەرەدا دەنێردرێت 3.50 MHz و 29.7 MHz . مەودای درێژی شەپۆلی ئەم مەودایە چەندە؟ بۆچی؟ بەڕای تۆ ئەم بەشەی شەبەنگ بەشەپۆلە ڕادیۆییە کورتەکان ناودەبرێ؟
4. لەرەلەری ئەو شەپۆلە کارۆموگناتیسیە چەندە کە درێژی شەپۆلەکەی 1.0 km ؟
5. ئەو بەشەی شەبەنگی بینراو کە دەروشانەوەی لە هەموویان زیاترە درێژە شەپۆلەکەی نزیکەی 560 nm ، وە ڕەنگی سەوزی زەرد باو دەنوێنێت. لەرە لەری ئەم ڕووناکییە چەندە؟
6. لەرەلەری تیشکی سەرو بنەوشەیی چەندە کە وزەیەکی بەرزی هەیە و درێژی شەپۆلەکەی 125 nm ؟

## نواندنی شەپۆل بە تیشك

وا دابنێ شەپۆلێکی دەریا لە کەنار نزیك دەکەوێتەوە، سەری شەپۆلەکان کە لەسەر ئاڕاستەی گواستنەوەی شەپۆلەکە ئەستونن، لە هێڵێك لە تەنۆلکەی ئاو پێکهاتووە. بەهەمان شێوە بنی شەپۆلەکان بە هێڵێکی تری تەنۆلکە ئاوییەکان دەنوێنرێت. پاشان هێڵێکی تر سەری شەپۆلەکان دەنوێنێت. ئەم هێڵانە لە هەموو جۆرەکانی شەپۆلدا پێیاندەگوترێت بەرەی شەپۆلەکان هەموو خاڵەکانی سەر بەرەی شەپۆلە ڕووتەختەکە سەرچاوەیەکی شێوە خاڵی قەبارە فەرامۆشکراو دادەنرێت، هەندێك لەم خاڵانەی سەربەرەی شەپۆلی سەرەتایی لە **وێنەی 5-3** دا دەردەکەوێت، هەر یەکە لەم سەرچاوانە شەپۆلێکی تری بازنەیی یان گۆیی بەرهەم دەهێنێت کە پێیاندەگوترێت شەپۆلە ناوەندیەکان. تیراسا شینەکان.

له **وێنەی 3-5** دا نیوە تیرەی ئەو شەپۆلە ناوەندیانە دەنوێنێن. و لێکەوتی شەپۆلەکانیش لە ساتێکی دواتردا، شوێنی نوێی بەرەی شەپۆلی سەرەتایی دەنوێنێت. (بەرە شەپۆلێکی نوێ **وێنەی 3-5** ) ئەم نواندنەی بەرە شەپۆلە تازەکان پێیدەگوترێت دەستوری هایگنز، وەك رێزلێنانێك بۆ فیزیازان کریستیان هایکنز.




**وێنەی 3-5**

بە پێی دەستوری هایگنز دەتوانرێ بەرەی شەپۆل دابەش بکرێ بەچەند سەرچاوەیەکی شێوە خاڵەوە. لێکەوتی شەپۆلە دەرچووەکان لەو سەرچاوانەوە شوێنی تازەی بەرەی شەپۆلی نوێ دەنوێنێت.

دەستوری هایگنز بەکاردەهێنرێت بۆ زانینی سیفەتەکانی هەر شەپۆلێك کە لەگەڵ ماددەدا کارلێك دەکەن (شەپۆلە ڕوناکیەکانیش). هەروەها دەتوانین بگەینە هەمان ئەنجام ئەگەر وامان دانا کە شەپۆلەکان بە هێڵی ڕاست بڵاودەبنەوە کە ئەستونن لەسەر بەرەی شەپۆلەکان، ئەم هێڵە ڕێکانە پێیاندەگوترێت تیشکەکان، و ئەم ئاسانکردنەش لە دەربریندا پێیدەگوترێت نواندن بە تیشك.

## کەمبوونەوەی توندی ڕووناکی لەگەڵ دووجای دووری لەسەرچاوەکەوە

بێگومان تێبینی ئەوەت کردووە کە خوێندنەوەی کتێب لە نزیك گلۆپێکی 100 W یەوە ئاسانترە وەك لە نزیك گلۆپێکی 25 W ، بۆیە وا ئاسانترە لە دووریەکی کەمتر لە گلۆپەکەوە بخوێنیتەوە. بە بەراورد لەگەڵ ماوە دوورترەکان ئەم تێبینیانە ئەوە دەگەیەنێت کەوا توندی ڕووناکی لە خاڵێکدا بەند دەبێت لەسەر بڕی ئەو وزە ڕووناکییەی لە سەرچاوەکە دەردەچێت و دوری نێوان خاڵەکەو سەرچاوە ڕوناکییەکە.




**وێنەی 4-5**

تا لەسەرچاوەکە دوورتر بکەوینەوە توندی ئەو ڕووناکییەی دەکەوێتە سەریەکەی ڕووبەر کەمدەکات.

گلۆپەکان بە پێی توانا ناوەکییەکەیان کە بە وات (W) دەپێورێت و بە پێی ڕووناکی دەرچوو لێیانەوە هێما دەکرێت. تێکڕایی دەرچوونی ڕووناکی لە سەرچاوەیەکەوە پێیدەگوترێت لێشاوی ڕووناکی و بە لۆمەن (Lm) دەپێورێت. لێشاوە ڕووناکی ئەو توانا ڕوناکییە دەرەکییەیە کە بە پێی کاردانەوەی چاو بۆ ڕووناکی دەپێورێت. بیرۆکەی لێشاوە ڕووناکی یارمەتیمان دەدات لەوە تێبگەین بۆچی توندی ڕوناکییەکە لەسەر لاپەڕەی کتێبەکە کەمدەکات تا لەسەرچاوە ڕوناکییەکە دوورتر بکەوینەوە. وا دابنێ چەند گۆیەکی جیاوازی هاوچەقت هەیە سەرچاوەکە لە چەقەکەیاندا دانراوە وەك **وێنەی 4-5** سەرچاوە ڕوناکیەکە ڕووناکی بە یەکسانی بە هەموو ئاڕاستەکاندا بڵاودەکاتەوە. بەپێی یاسای پاراستنی وزە کە دەڵێت دەبێت لێشاوی ڕووناکی لەسەر هەموو گۆیەکە یەکسان بێ. سەرەنجامی دابەشکردنی لێشاوە ڕووناکی بەسەر ڕووبەری ڕووی گۆیەکەدا پێی دەگوترێت چڕی لێشاوە ڕووناکی و بە یەکەی $Lm/m^2$ دەپێورێت و لەگەڵ دووجای نیوە تیرەدا کەمدەکات، تا لەسەرچاوە ڕوناکییەکە دورتر بکەوینەوە.

## پێداچوونەوەی بەندی 1-5

**1.** ناوچەکانی شەبەنگی کارۆموگناتیسی دیاری بکە، کە لەم دەزگایانەی خوارەوەدا بەکاردەهێنرێت.

أ . فرنی مایکرۆوێڤ (شەپۆلە ووردیلەیەکان).

ب . تەلەفزیۆن.

ج . هاوێنەی کامیرا.

**2.** شەپۆلێکی کارۆموگناتیسی لەرەلەرەکەی $7.57 \times 10^{14}$ Hz . ئایا درێژی شەپۆلەکەی چەندە؟ ئایا ئەم شەپۆلە سەر بە چ ناوچەیەکی شەبەنگی کارۆموگناتیسیە؟

**3.** گالیلۆ هەوڵی دا تاقیکردنەوەیەك بکات بۆ پێوانی خێرایی ڕووناکی، بەهەژمارکردنی ئەو کاتەی کە ڕووناکی پێویستێتی بۆ ئەوەی 1.5 km بەڕۆیشتن و هاتنەوەوە ببڕێت. بۆچی گالیلۆ نەیتوانی بگاتە خێراییەکی دیاریکراو بۆ ڕووناکی؟

**4.** **بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە:** هێزی ڕووناکی خۆر لای چاودێرێکی سەر زەوی چەندە؟ ئەگەر دوری نێوان خۆر زەوی چوارهێندەی دوری ئێستای بێت؟ وەڵامەکەت بەبەراوردکرن بەهێزی ڕووناکی ئێستای ڕووی زەوی بنووسە.

بەندی 2-5

# ئاوێنە ڕووتەختەکان
## *Flat Mirrors*

**5 - 2 ئامانجەکان**

- جیاوازی لە نێوان ڕووناکی دانەوەی ڕێك و ناڕێك دەکات.
- یاسای ڕووناکی دانەوە لە ئاوێنەی ڕووتەختدا جێبەجێ دەکات.
- وەسفی ئەو وێنانە دەکات کە لە ئاوێنەی ڕووتەختەوە دەست دەکەون.
- هێڵکاری وێنەی دروست بوو لە ئاوێنە گۆشە لە نێوانەکان و ئاوێنە تەریبەکان ڕوون دەکاتەوە.
- وەسفی پەیوەندی نێوان جووڵەی وێنەو جووڵەی تەن لە پێش ئاوێنەی ڕووتەختدا دەکات

**دانەوە**

گۆڕانێکە لە ئاراستەی بڵاوبونەوەی شەپۆلی کارۆموگناتیسی دا بە هۆی ڕوویەکەوە، وای لێ دەکات کە بە ئاراستەی بەرامبەری بجووڵێت.

## ڕووناکی دانەوە

وا دابنێ دوای لێبونەوەت لەسەر تاشین تۆ دەتەوێت پشتی سەری خۆت ببینیت ئەم کارە لەوە دەچێت ئەستەم بێت، بەڵام دەتوانیت ئەوە جێبەجێ بکەیت بە بەکارهێنانی دوو ئاوێنەی ڕووتەختی بەرامبەر یەکتر، بۆ ئەوەی ڕووناکی لە پشتی سەرتەوە بگاتە چاوت. کرداری دووبارە ئاڕاستەکردنەوەی ڕێڕەوی ڕووناکی بەندە لەسەر سیفەتێکی بنچینەیی بۆ کارلێکردنی ڕووناکی لەگەڵ ماددەدا.

بڵاوبوونەوەی ڕووناکی لەهەر ناوەندێکی ماددی چوونیەکدا، هەوا بێ یان ئاو یان بۆشایی بە هێڵی ڕاست بڵاودەبێتەوە بەڵام کاتێك بەر بەربەستێکی تر دەکەوێت ئاڕاستەی ڕێڕەوەکەی دەگۆڕێت. ئەگەر ماددەکە ڕوون نەبێت وەك ڕووی تاریکی سافکراوی مێزێك ئەوا ڕووناکیەکە ناتوانێت لە چەند درێژە شەپۆلێك زیاتر بەناویدا بڕوات. بەشێکی ڕووناکیەکە هەڵدەمژێت و بەشەکەی تریش لە ڕووەکەوە لا دەدات. ئەو گۆڕانە لە ئاڕاستەی بڵاوبوونەوەی ڕووناکیەکەدا پێی دەگوترێت **ڕووناکی دانەوە** reflection . هەموو تەنێك بەشێك لەو ڕووناکیە دەمژێت کە دەکەوێتە سەری بەشێکیشی دەداتەوە. ئاوێنەی باش دەوروبەری لە 90 % ئەو ڕووناکیە دەداتەوە کە دەکەوێتە سەری، بەڵام هیچ ڕوویەك نییە لە 100 % ڕووناکی بداتەوە. تێبینی بکە وێنەکانی ئەو کەسەی کە لە **وێنەی5 - 5**دایە یەك لەدواییەك توندی ڕووناکیەکەیان کەم دەکاتەوە.



**وێنەی 5 - 5**

ئاوێنە بەنزیکی هەموو ئەو تیشکانە دەداتەوە کە دەکەونە سەری بۆیە کرداری دروست بوونی چەند وێنەیەك بۆ یەك تەن لە نێوان دوو ئاوێنەدا ئاسان دەکات.

### پێکهاتنی ڕووەکان و ڕووناکی دانەوە

سافی ڕووە ڕووناکی دەرەوەکان کاردەکاتە سەر چۆنیەتی ڕووناکی دانەوە لێیانەوە. ڕووناکی لە ڕووە زبرەکانی وەك کاغەز وجل وبەرگ و تەختەی ساف نەکراوەوە، بە ئاڕاستەی جیاواز وجۆراوجۆر دەدرێتەوە وەك **وێنەی5 - 6** (أ) دا هاتووە، بەم جۆرە ڕووناکی دانەوەیە دەگوترێت ڕووناکی دانەوەی ناڕێك کە لە بەندی 7-1 دا باس دەکرێت. ڕووناکی لە ڕووە سافکراوەکانەوە وەك ڕووی ئاوێنەکان و ڕووی حەوزە ئاوەکان بەیەك ئاڕاستە دەدرێتەوە وەك لە **وێنەی 5 - 6** (ب) دا دیارە، بەم جۆرە ڕووناکی دانەوەیە دەگوترێت ڕووناکی دانەوەی ڕێك. ئەو ڕووەی چاڵ و چۆڵی لە ڕووەکەیدا زۆر کەمبێت لە چاو درێژی شەپۆلی ئەو ڕووناکیەدا کە دەکەوێتە سەری پێی دەگوترێت ڕووی ساف، لە خوێندنی خۆماندا تەنها باس لە ڕووناکی دانەوەی ڕێك دەکەین.




**وێنەی 5 - 6**

لە ڕووناکی دانەوەی ناڕێکدا تیشکەکان بە ئاڕاستەی جیاواز دەدرێنەوە (أ)، بەڵام لە ڕووناکی دانەوەی ڕێکدا تیشکەکان بەیەك ئاڕاستە دەدرێنەوە (ب).



(أ)




(ب)

**وێنەی 5-7**

(أ) چۆنیەکی ڕووناکی دراوە دەردەخات لە میانەی یاسای دانەوەوە کە دەقەکەی دەڵێت هەردوو گۆشەی لێدان و دانەوە یەکسانن (ب)

## یەکسانی گۆشەی لێدان و گۆشەی دانەوە

**گۆشەی لێدان**

گۆشەی نێوان تیشکی لێدەر و ئەستونی سەر ڕووە ڕووناکی دەرەوەکەیە لە خاڵی لێداندا.

**گۆشەی دانەوە**

گۆشەی نێوان تیشکی دراوە و ئەستونی سەر ڕووە ڕووناکی دەرەوەکەیە لە خاڵی لێداندا.

لەوانەیە تێبینی یەکسانبوونی هەردوو گۆشەی لێدان و دانەوەت کردبێت کاتێك تیشکی ڕووناکی دەکەوێتە سەر ڕوویەکی ساف وەك ئاوێنە یان ڕووی سافکراوی مێزێك، بە گۆشەیەك کە نزیك بێت لە ڕووەکەوە ئەوا تیشکە دراوەکانیش هەر لە ڕووەکەوە نزیك دەبن. کاتێکیش تیشکە لێدەرەکان لە ڕووەکەوە دووردەبن، تیشکە دراوەکانیش لە ڕووەکەوە دوور دەبن، **وێنەی 5 - 7** (أ) یەکێك لە بارەکانی چوونیەکی ڕووندەکاتەوە لە نێوان تیشکی لێدەرو دراوەدا.

ئەگەر ئەستونێك لەسەر ڕووە ڕووناکی دەرەوەکە لە خاڵی کەوتنی تیشکەکەدا بکێشین، دەتوانین **گۆشەی لێدان** angle of incidence و **گۆشەی دانەوە** angle of reflection بەگوێرەی ئەو ئەستونەوە پێناسە بکەین. پێوانە وردەکانی گۆشەی لێدان $\theta$ و گۆشەی دانەوە $\theta'$ بە تەواوەتی یەکسان دەبن. ئەم دوو گۆشەیە بەردەوام یەکسان دەبن وەك وێنەی 5-7 (ب)

$$\theta = \theta'$$

گۆشەی لێدان = گۆشەی دانەوە

گۆشەی نێوان تیشکی لێدەرو ڕووی ئاوێنەکە دەکاتە $90^\circ - \theta$ ، بەڵام گۆشەی نێوان تیشکی دراوە و ڕووی ئاوێنەکە دەکاتە $90^\circ - \theta'$ .

# ئاوێنە ڕووتەختەکان

سادەترین ئاوێنە، ئاوێنەی ڕووتەختە. ئەگەر تەنێك وەك قەڵەمێکی دار لەبەردەم ئاوێنەیەکدا دابنرێت و تیشك لێیەوە بدرێتەوە ئەوا ئەو تیشکانەی لە قەڵەمەکەوە دەردەچن دەکەونە سەر ئاوێنەکەو لێیەوە دەدرێنەوە، تیشکە دراوەکان بۆ چاودێرێك لە پێش ئاوێنەکەدا وا دەردەکەون کە لە شوێنێکی دوای ئاوێنەکەوە هاتبن. ئەو کاتە دەڵێین وێنەی تەنەکە لەو شوێنەی پشت ئاوێنەکەدا دروست دەبێت کە تیشکەکانی لێوە هاتوون. هەروەها تێبینی ئەوە دەکەین کە دووری تەنەکە لە ئاوێنەکەوە $p$ یەکسانە بە دووری وێنەکە لە ئاوێنەکەوە $q$ . هەروەها قەبارەی تەن و وێنەکەش یەکسانن.

ئەو وێنەیەی بەهۆی ئەو تیشکانەوە دروست دەبن کە لەوە دەچێت لە دوای ئاوێنەکەوە هاتبن، و لەڕاستیدا وانین پێی دەگوترێت **وێنەی خەیاڵی** virtual image . **لەوێنەی 5-8**(أ) دەردەکەوێت ئاوێنەی ڕووتەخت هەمیشە وێنەی خەیاڵی دروست دەکات،

لەوە دەچێت کە لە پشت ئاوێنەکەوە بێت، بۆیە هەرگیز ناتوانین وێنەی خەیاڵی لەسەر ڕوویەکی فیزیایی (شاشەیەك) ببینین.

**وێنەی خەیاڵی**

وێنەیەکە لە خاڵێکدا دروست دەبێت لەوە دەچێت کە تیشکەکان لێوەی دەرچووبن بەڵام لە ڕاستیدا وا نییە.

## دیاریکردنی شوێنی وێنە بە هۆی هێڵکاری تیشکەوە

هێڵکاری تیشکەکان، وەك **وێنەی 5-8** (ب) دا دیارە، هێڵکاری ئەندازەیی سادەن بەکاردەهێنرێن بۆ دیاریکردنی شوێنی وێنەیەك کە لە ئاوێنەیەکدا دروست دەبێت. وا دابنێ تۆ هێڵکاری قەڵەمێك دەکێشیت کە لەبەردەم ئاوێنەیەکی ڕووتەختدا دانراوە، لە سەرەتادا شوێنی ئاوێنەکە و شوێنی قەڵەمەکە لێوەی دیاریبکە. هێڵکارییەکە بکێشە بە شێوەیەك کە هەریەکە لە دوری تەنەکە لە ئاوێنەکەوە $p$ وە دوری وێنەکە لە ئاوێنەکەوە $q$ لەگەڵ قەبارەی هەریەکەیان گونجاوبێت. بۆ ئاسانکاری تەنها خاڵی سەری قەڵەمەکە باس دەکرێت.

بۆ دیاریکردنی وێنەی سەری قەڵەمەکە، دوو تیشك لەسەری قەڵەمەکەوە بکێشە کە بکەونە سەر ئاوێنەکە، با تیشکی یەکەم بە ئەستونی بکەوێتە سەر ئاوێنەکە، واتە گۆشەی نێوان ئەم تیشکەو ئەستونەکە $0^o$ بێت، ئەوا گۆشەی دانەوەشی هەر $0^o$ دەبێت. ئەوەش وا دەکات تیشکەکە بە هەمان ڕێڕەوی خۆی بدرێتەوە لە **وێنەی 5-8**(ب) دا هێمای ژمارە 1 بۆ ئەم تیشکە دادەنرێت وە بە تیراسا لە هەردوو ئاراستەوە دیاری دەکرێت چونکە تیشکی لێدەر لەسەر ڕێڕەوی خۆی دەدرێتەوە.

تیشکێکی تر لە سەری قەڵەمەکەوە بۆ ئاوێنەکە، بکێشە با ئەم تیشکە گۆشەیەك لە نێوان تیشکەکەو ئەستونە کێشراوەکەدا دروست بکات لە خاڵی لێداندا. لە وێنەی **5-8** (ب) هێمای ژمارە 2 بۆ ئەم تیشکە دادەنرێت. پاشان تیشکی دراوە لە ئاراستەی بەرامبەری ئاوێنەکەوە بکێشە، با گۆشەی دانەوە $\theta'$ یەکسان بێت بە گۆشەی لێدان $\theta$.

دوای ئەوە درێژکراوەی هەردوو تیشکە دراوەکە بەرەو دواوە بکێشە بەرەو خاڵێك کە وا دەردەکەوێت لەو خاڵەی پشتی ئاوێنەکەوە دەرچووبن، بە هێڵی پچر پچر ئەو هێڵانەی کەوا دەردەکەون لە خاڵەکەوە هاتبن وێنەکە بکێشە، بۆ ئەوەی لە تیشکە ڕاستەقینەکان (هێڵە ڕەشەکان)ی پێش ئاوێنەکە لە یەکتر جیابکەینەوە. خاڵی یەکتر برینی دوو هێڵە پچرپچرەکە وێنەی سەری قەڵەمەکە دەنوێنێ.

بەدووبارەکردنەوەی ئەم کردارە بۆ هەر برگەیەکی تری قەڵەمەکە دەتوانیت بە تەواوەتی وێنەی خەیاڵی قەڵەمەکە بکێشیت. تێبینی بکە وێنەی قەڵەمەکە لە پشت ئاوێنەکەوە وا دەردەکەوێت لە هەمان ئەو دورییە دا بێت کە قەڵەمەکە لەبەردەم ئاوێنەکەوە تێدایە $(p = q)$ . هەروەها بەرزی قەڵەمەکە $h$ یەکسانە بە بەرزی وێنەکە $h'$ .



(ب)


(أ)

**وێنەی 5-8**
شوێنی وێنە خەیاڵیەکەو بەرزییەکەی کە بە هۆی ئاوێنەی ڕووتەختەوە پەیدا دەبێت (أ) دەتوانرێت بە هۆی هێڵکاری تیشکەوە بنوێنرێت (ب).

ئـەم ڕێگـەی هـێڵـکـاری تیشکانـە بـۆ هـەر تـەنێك لـە بـەردەم ئـاوێنـەی ڕووتـەختدا بەکاردەهێنرێت. بە هەڵبژاردنی خاڵێك لە خاڵەکانی تەنەکە (وا باوە کە بەرزترین خاڵ بێت). دەتوانین بەدوای ڕێڕەوی دوو تیشکە لێدەرەکەدا بڕۆین بۆ دیاریکردنی شوێنی وێنەی ئەو خاڵە، دەتوانیت هێڵکاری بەشەکەی تری وێنەکە بکێشیت، دوای دیاریکردنی وێنەی خاڵەکە و دووری نێوان وێنە و ئاوێنەکە.

وێنە پێکهاتووەکە بە هۆی ئاوێنەی ڕووتەختەوە پێچەوانەیە بۆ چاودێرێك کە لە بەردەم ئاوێنەکەدا وەستابێت، دەتوانیت بە ئاسانی تێبینی ئەوە بکەیت ئەگەر دەقی نووسراوێك لە بەردەم ئاوێنەکەدا دانێیت وەك لە وێنەی **5-9** دادیارە. وێنەی هەرپیتێك لە پیتەکانی پێچەوانە دەبێت لە ئاوێنەکەدا. وەهەروەها دەشتوانیت ئەوە پێناسەبکەیت کەوا هەردوو گۆشەی نێوان ئاوێنەو هەریەکە لە تەن و وێنەکە یەکسانن.




**وێنەی 5-9**

دەری دەخات کە بەشی لای ڕاستی تەنەکە بەرامبەر بەشی لای چەپی وێنەکەیەتی.

## ئاوێنە گۆشە لە نێوانەکان

کاتێ دوو ئاوێنەی ڕووتەخت ستوون لەسەر یەك دابنرێت ئەوا جگە لەو دوو وێنە خەیاڵییەی کە دوو ئاوێنەکە دروستی دەکەن وێنەیەکی خەیاڵی تریش دروست دەبێت. ئەو ڕوناکییەی کە دووجار دەدرێتەوە ئەوا وێنەی سێیەم دروست دەکات وەك وێنەی **5-10** دیارە. شوێنی سێ وێنەکان بیرکارییانە دەکەونە سەر هەرسێ گۆشەی لاکێشەیەك کە چەقەکەی خاڵی یەکتربڕینی دوو ئاوێنەکەیە.




**وێنەی 5-10**

سێ وێنە بۆ ئەو تەنە دروست دەبێت کە لە پێش دوو ئاوێنە ستوون لەسەر یەکەکەوە دانراوە.

چالاکییەکی کرداری

**خێرا**

### دوو ئاوێنەی ڕووتەختی گۆشە لەنێوان

### کەرەستەکان

- ✓ دوو ئاوێنەی ڕووتەخت
- ✓ هەڵگری ئاوێنە
- ✓ گۆشە پێوێك

### ڕێنماییەکانی سەلامەتی

کاتی بەکارهێنانی ئاوێنەی شووشە، هەمیشە ئاگاداربە لە شکانی لەبەر ئەوەی زیان بەخشە.

لەسەر مێزێکی ئاسۆیی دوو ئاوێنە لەسەر دوو ڕاگر چەسپ بکە کە گۆشەی نێوانیان $45^{\circ}$ بێت. لە خاڵێکی نێوان دوو ئاوێنەکە سەیری وێنەکەی بکە لە پشت هەر ئاوێنەیەك هەوڵ بدە ژمارەی وێنەکان دیاری بکەی کە خۆت ئەیبینی. ئایا ژمارەی وێنەکان زیاترە یان کەمترە لەوەی ئاوێنە ستوونەکان؟ ئەمە ڕوون بکەرەوە.

## ئاوێنە تەریبەکان

تەنەکە دەکەوێتە نێوان دوو ئاوێنەی ڕووتەختی هاوڕێك وەك لە **وێنە 11-5**






**وێنەی 11-5**

چاو سەیری یەکێك لەو وێنانەی لە ئاوێنەی دووهەمدا پەیدا بووە دەکات.

بۆ تەنی O وێنەی زۆر پەیدا دەبێت بە گوێرەی هەر ئاوێنەیەك

$I_1$ وێنەی O بە گوێرەی $M_1$

$I_2$ وێنەی تەنی O بە گوێرەی $M_2$

$I_{1,2}$ وێنەی تەنی O بە گوێرەی $M_1$ ئینجا $M_2$

$I_{2,1}$ وێنەی تەنی O بەگوێرەی $M_2$ ئینجا $M_1$

$I_{2,1,2}$ وێنەی تەنی O بەگوێرەی $M_2$ ئینجا $M_1$ ئینجا $M_2$

وێنەکە لەسەر هێڵێك دەبێ کە بە تەنی O دا تێپەڕ دەبێ و ستوون دەبێ لەگەڵ هەردوو ئاوێنەی $M_1$ و $M_2$ . ئاوێنەی $M_2$ وێنەیەکی خەیاڵی $I_2$ پیشان دەدات بۆ تەنی $I_1$ . ولەدوای دوو دانەوە ڕووناکی لە $M_1$ و $M_2$ وە وێنەیەکی تازە دروست ئەبێ $I_{2,1,2}$ بۆ تەنی $I_2$ .

ئینجا چاو دەتوانێت زنجیرەیەك لە وێنە خەیاڵییەکان بۆ یەك تەن ببنێت لە پشت ئاوێنەکەوە. چاودێر دەتوانێت ئەم ڕووداوە لە سەرتاشخانە یان شوێنی فرۆشتنی جل و بەرگدا تێبینی بکات.

# پەیوەندی نێوان جووڵەی وێنە و جووڵەی تەن لەپێش ئاوێنەی ڕووتەختدا

چاودێرێك لە پێش ئاوێنەیەکی ڕووتەختدا وەستاوە و وێنەکەی خۆی لەناو ئاوێنەکەدا دەبینێ. کاتێك چاودێرەکە لە ئاوێنەکە نزیك دەبێتەوە ئەوا وێنەکەش لە ئاوێنەکە نزیك دەبێتەوە. و ئەگەر لە ئاوێنەکەوە دوور کەوتەوە وێنەکەش دوور دەکەوێتەوە. ئەم جارە لە ئاوێنەکە نزیك دەبێتەوە تاکو دەگاتە ئاوێنەکە دەبینێ وێنەکەی لەناو ئاوێنەکەوە گەیشتە خۆی. کاتێك چاودێرەکە هەڵدەستێت بە چەند پێوانەیەك بۆ دووری و کات بۆی دەردەکەوێت کاتێك 1 m نزیك دەبێتەوە لە ئاوێنەکە لە ماوەی 1 s وێنەکەش 1 m نزیك دەبێتەوە لە ئاوێنەکە لە هەمان کاتدا، ئەمەش مانای وا دەبەخشێ کە وێنەکە 2 m لە چاودێرەکە نزیك بۆتەوە لە ماوەی 1 s ، بۆیە خێرایی جووڵەکەی بە گوێرەی ئاوێنەکە 1 m/s ، خێرایی وێنەکە بە گوێرەی چاودێرەکە 2 m/s

## پێداچوونەوەی بەندی 5-2

**1.** کام لەمانەی خوارەوە دانەوەکەی نارێکە و کامیان ڕێکە؟

أ . دانەوە لە ڕووی دەریاچەیەکەوە.

ب . دانەوەی ڕووناکی لە ڕووی کیسێکی پلاستیکییەوە بۆ هەڵگرتنی پاشەڕۆکان.

ج . دانەوەی ڕووناکی لە ڕووی هاوێنەی چاویلکەیەکەوە.

د . دانەوەی ڕووناکی لە ڕووی مافورێکەوە؟

**2.** وا دابنێ تۆ ئاوێنەیەکی ڕووتەختت هەڵگرتووەو لە چەقی کاتژمێرێکی گەورەدا وەستاوی کە لەسەر زەوی کێشراوە. هاورێکەت لە نیشانەی کاتژمێر 12 دا وەستاوە و ڕوناکییەك بە ئاڕاستەی تۆ دەنێرێت، دەتەوێت ئەم ڕووناکیە بەرەو هاوڕێیەکی ترت بنێریت کە لە شوێنی کاتژمێر 5 دا وەستاوە. ئایا هەریەکە لە گۆشەی لێدان وگۆشەی دانەوە دەبێت چەند بێت؟

**3.** لە هەندێك لە کۆگاکانی بازاڕدا پەنجەرەکانی لەلای خوارەوە بەرەو ناوەوە لارن، ئەوەش بۆ مەبەستی کەمکردنەوەی توندی ڕۆشنایی ئەو ڕووناکیەیە کە لە تەلارەکانی ئەوبەر جادەکەوە دێن وکاریگەری خراپی هەیە لەسەر بینینی ئەو کەسانەی دێنە کۆگاکەوە بۆ ئەو کاڵایانەی لە نزیك لای خوارەوەی پەنجەرەکانەوە دانراون. هێڵکاری ئەو تیشکە دراوانە لە پەنجەرە لارە ڕووناکی دەرەوەکەوە بکێشە بۆ ڕوونکردنەوەی ڕێگەی کارکردنەکە.

**4.** **لێکدانەوەی هێڵکارییە ڕوونکراوەییەکان (هێڵکاری زانیارییەکان):** ئەو وێنە فۆتۆگرافیەی شێوەی 5-5 وێنەکانی بەرهەمهاتوو لە چەندەها دانەوەی نێوان دوو ئاوێنەی بەرانبەر یەکترەوە پیشاندەدات، چی دەرەنجام دەکەیت ئەگەر یەکێك لە ئاوێنەکان لاربێت بە گوێرەی ئەویتریانەوە؟ وەڵامەکەت ڕوون بکەرەوە.

**5.** **بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە:** ئەگەر ئاوێنەیەکی ڕووتەختی گەورە لە ژورێکدا دابنرێت ئایا ژوورەکە چەند لە قەبارە ڕاستەقینەکەی خۆی گەورەترە؟ وەڵامەکەت ڕوونبکەرەوە.

**6.** **بیرکردنەوەی ڕەخنە گرانە:** بۆچی ئاوێنەی ڕووتەخت لای ڕاست وچەپی ئەو کەسەی لەبەردەمیدا وەستاوە ئاوەژو دەکاتەوە؟ بەڵام لای سەرەوەو خوارەوەی ئاوەژو ناکاتەوە؟

# بەندی 3-5

# ئاوێنە گۆییەکان

*Spherical Mirrors*

## 3-5 ئامانجەکان

- دووری و دووره تیشکۆ دەدۆزێتەوە بە بەکارهێنانی هاوکێشەی ئاوێنە گۆییە رووچاڵ و قۆقزەکان.
- هێڵکاری ڕێڕەوی تیشکەکان دەکێشرێت بۆ دیاریکردنی شوێنی گەورەکردنی وێنە پەیدابووەکە لە ئاوێنەی رووچاڵ وقۆقزدا.
- وێنەی خەیاڵی و وێنەی ڕاستەقینە لە یەکتر جیادەکاتەوە.
- وەسفی کاریگەری ئاوێنە شێوە برگە هاوتاکان دەکات بۆ چارەسەرکردنی لێڵ گۆیی

## ئاوێنە گۆییە ڕووچاڵەکان

ئەو ئاوێنە گۆییە بچووکانەن کە بەکاردێن بۆ ڕازاندنەوە. لە سەرەتادا وا دەردەکەوێت کە ئاوێنەی ڕووتەختە. بەڵام ئەو وێنانەی کە دروست دەبێت جیاوازە لەگەڵ ئەو وێنانەی کە لە ئاوێنەی ڕوتەختدا دروست دەبێت لە **وێنەی5-12**(أ)، وێنەی ئەو تەنەی نزیکە لە ئاوێنەکە گەورەکراوە. بەڵام لە **وێنەی 5-12** (ب)، وێنەی ئەو تەنەی کە دوورە لە ئاوێنەکەوە هەڵگەڕاوەو بچوکراوەیە. ئەو وێنانە تایبەتن بە ئاوێنەی گۆیی، **وێنەی 5-12** ( أ) وێنەیەکی خەیاڵییە Virtual image وەك ئەو وێنەیەی لە ئاوێنەی ڕووتەختدا دروست دەبێ، بەڵام **وێنەی5-12**(ب)، وێنەیەکی ڕاستەقینەیە لە ئاوێنەی ڕووچاڵدا دروست بووە.

### بەکارهێنانی ئاوێنەی ڕووچاڵ بۆ دەستکەوتنی وێنەی ڕاستەقینە

ئاوێنەی گۆیی وەك لە ناوەکەی دا دیارە بەشێکە لە ڕوویەکی گۆیی ڕووناکی دەرەوە، ئەو ئاوێنە گۆییەی کە ڕووی ناوەوەی ڕووناکی دەداتەوە (ڕووی ناوەوەی گۆیەکە) پێیان دەڵێن ئاوێنەی **گۆیی ڕووچاڵ** concave spherical mirror . ئاوێنەی ڕووچاڵ بەکاردێت بۆ دەست کەوتنی وێنەی گەورەکراوی تەنەکان وەك لە ئاوێنەکانی ڕازاندنەوەدا.

یەك لەو هۆکارانەی کە شوێنی تەن ویلەی گەورەکردنی لە ئاوێنەی ڕووچاڵ دیاری دەکات، بریتیە لە نیوە تیرەی ئاوێنەکە $R$ . نیوە تیرەی ئەو گۆیەیە کە بەشێکی بچووکی ئاوێنەکە پێك دەهێنێت، ئەو دوورییە دەنوێنێت کە لە نێوان ئاوێنەکە وچەقی کوڕیەکەیدایە $C$ .

#### ئاوێنەی گۆیی ڕووچاڵ

ئاوێنەیەکە ڕووە ڕووناکی دەرەوەکەی بەشێکە لە ڕووی ناوەوەی گۆیەك.







**وێنەی 5-12**
ئاوێنەی گۆیی رووچاڵ بەکاردێت بۆ دەست کەوتنی وێنەیەکی گەورەتر لە تەنەکە وەك لە وێنەی (أ) دا دیارە، یان وێنەیەکی بچووکتر لە تەنەکە وەك لە وێنەی (ب).




(أ)



(ب)

**وێنەی 5-13**

(أ) ئەو تیشکانەی لەتەنەکەوە (سەرچاوەی ڕووناکی) دەردەچن لە پێش ئاوێنەکەدا کۆدەبنەوە بۆ دروست کردنی وێنەی ڕاستەقینە. (ب) لەم پێك هاتنە تاقیگەییەدا، وێنەی ڕاستەقینەی تەلی گلۆپەکە لەسەر ڕووی پارچە شووشەیەك کە لە بەردەم ئاوێنەکەدایە پەیدادەبێت.

وا دابنێ گلۆپێکی ڕووناکی بە شێوەیەکی شاوولی لە دووری $p$ لە ئاوێنەیەکی ڕووچاڵەوە دانرا وەك **وێنەی 5-13**(أ) دا دیارە، بنکەی گلۆپەکە لەسەر تەوەرەی بنچینەیی ئاوێنەکە دادەنرێت کە بە چەقی ئاوێنەکە $O$ و چەقە کورییەکەیدا $C$ تێپەڕ دەبێت. تیشکی ڕووناکی لەسەرچاوە ڕووناکیەکەوە دەردەچێت و لە ڕووی ئاوێنەکەوە دەدرێتەوە و لە دووری $q$ لەبەردەم ئاوێنەکەدا کۆدەبێتەوە. لە ڕاستیدا ئەو تیشکانەی لە ڕووی ئاوێنەکەوە دەدرێنەوە بەرەو ژێرەوەی تەوەرەی بنچینەیی تێپەڕدەبن، بۆ ئەوەی وێنەکە لەوێدا دروست بکەن، بۆیە لەم بارەدا وێنەکە لە بەردەم ئاوێنەکەدا دروست دەبێت.

ئەگەر پارچە کاغەزێك لەبەردەم ئاوێنەکەدا دابنێی لەو شوێنەی کە وێنەکەی تیادا دروست دەبێت، وێنەیەکی ڕوونی سەرچاوە ڕوناکیەکە لەسەر پارچە کاغەزەکە دەبینی لەم بارەدا **وێنەکە ڕاستەقینەیە** real image . وە ئەگەر پارچە کاغەزەکە بۆ یەکێك لە لایەکان بجوولێنی تیشکەکە پەرت دەبێت و وێنەکە بە ڕوونی دەرناکەوێت. وە بە پێچەوانەی وێنەی خەیاڵی کە لە پشت ئاوێنەکەوە دەردەکەوێت و ناخرێتە سەر شاشە، دەتوانین وێنەی ڕاستەقینە لەسەر شاشەیەکی پیشاندان ببینین. لە **وێنەی 5-13** (ب) ، وێنەیەکی ڕاستەقینەی تەلی گلۆپێکی ڕووناکی لەسەر ڕوویەکی شوشەیی دانراو لەپێش ئاوێنەکەدا نیشاندەدات. سەرچاوە ڕووناکیەکە خۆی لە وێنەکەدا دەرناکەوێت، کە دەکەوێتە لای چەپی ڕووە شوشەییەکە.

**وێنەی ڕاستەقینە**

ئەو وێنەیەیە کە لە ئەنجامی کۆبوونەوەی تیشکە دراوەکان لە ڕووی ئاوێنەکەوە پەیدادەبێت.

## وێنەی ئاوێنە گۆییەکان و لێڵ گۆیی

کاتێك هێڵکاری تیشکەکان دەکێشین، دەبینین هەندێ لەو تیشکانە بەتەواوەتی لە خاڵێکی دیاری کراودا یەکتری نابڕن. ئەم دیاردەیە بۆ ئەو تیشکانە زۆر ئاشکرایە کە دوورن لە تەوەرەی بنچینەیی وە بۆ ئەو ئاوێنانەی کە نیوە تیرەی کوڕی بچووکیان هەیە. ئەم دیاردەیە پێی دەڵێن **لێڵ گۆیی**، کە ڕوودەدات بۆ تیشکە بینراوە ڕاستەقینەکان و ئاوێنە گۆیە ڕاستەقینەکان.

لە لاپەرەکانی تردا لەم بەندەدا هاوکێشەی ئاوێنە و هێڵکاری تیشکەکان دەخوێنین کە ئەم دوو چەمکە جێبەجێ دەبن تەنها بۆ ئەو تیشکانەی کە لە تەوەرەی بنچینەیی نزیکن، بەڵام نزیکردنەوەیەکی گرنگی بارەکانی تر پێشکەش دەکەن. وا دادەنێین کە هەموو تیشکە بەکارهاتووەکان لە هێڵکاریەکانمان و هەژمارکردنەکانمان پەیوەست بە ئاوێنە گۆییەکان نزیکن لە تەوەرەی بنچینەیی، لەگەڵ ئەوەی کە لە و هێڵکاریانەی لەم بەشەدا هاتوون وا بەدیار ناکەوێت.

## بەکارهێنانی هاوکێشەی ئاوێنە بۆ دیاریکردنی جێگەی وێنەیەك

بە تەماشاکردنی **وێنە 5-14** (أ)، دەتوانی تێبینی پەیوەندی نێوان دووری تەن لە ئاوێنە و دووری وێنەکەی ونیوەتیرەی کورییەکەی بکەین. ئەگەر شوێنی تەن و نیوە تیرەی کوڕی ئاوێنە زانراو بن، دەتوانین پێشبینی شوێنی وێنەکە بکەین. وە بە هەمان شێوە دەتوانرێ نیوەتیرەی کوڕیەکەشی دیاریبکرێت، ئەگەر شوێنی تەن و وێنەکەی لە ئاوێنەکەوە زانراو بن. ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە پەیوەندی نێوان دووری تەنەکە لە ئاوێنەکەوە $p$ ودووری وێنەکەی لێیەوە $q$ وە نیوە تیرەی کورییەکەی $R$ دیاری دەکات، و پێی دەڵێن هاوکێشەی ئاوێنە.

$$\frac{1}{p}+\frac{1}{q}=\frac{2}{R}$$

ئەگەر لە دووریەکی زۆر لە ئاوێنەکەوە گڵۆپێك دانرا ئەوا دووری تەن $p$ لە ئاوێنەکەوە زۆر زیاتر دەبێت بە پێوانەکردن بە $R$، وە $\frac{1}{p}$ نزیك دەبێتەوە لە سفر. لەو بارەدا $q$ زۆر نزیك دەبێتەوە لە $\frac{R}{2}$، وێنەی پەیدابوو دەکەوێتە ناوەڕاستی چەقی کوڕی وجەمسەری ئاوێنەکە. وە ئەو خاڵەش کە وێنەکەی تێدا پەیدابوو لەم بارە تایبەتەدا پێی دەگوترێت تیشکۆ و **وێنەی 5-14**(أ) و (ب) وە هێمای کەپیتاڵ $F$ ی بۆ دادەنرێت، لەبەر ئەوەی تیشکی ڕووناکی دەدرێتەوە، کەواتە گەر سەرچاوە ڕووناکیەکە لە تیشکۆدا دابنرێت ئەوا تیشکە دراوەکان بەیەکتر تەریب دەبن و وێنە دروست نابێ.

ئەو تیشکانەی کە بە تەریبی لە تەنێکی زۆر دوورەوە دێن، کاتێك لە ڕووی ئاوێنەکەوە دەدرێنەوە وێنە لە تیشکۆدا $F$ دا پەیدا دەکەن، دووریەکەی لە ئاوێنەکەوە دەبێتە دوورە تیشکۆی ئاوێنەکەو هێمای $f$ ی بچووکی بۆ دادەنرێت، دوورە تیشکۆی ئاوێنەیەکی گۆیی دەکاتە چواریەکی تیرەی کوڕی ئاوێنەکە. دەتوانین هاوکێشەی ئاوێنەکە لەم بارەدا بە هۆی دوورە تیشکۆوە $f$ بنووسینەوە.

**هاوکێشەی ئاوێنە**

$$\frac{1}{p}+\frac{1}{q}=\frac{1}{f}$$

$$\frac{1}{\text{دووری تەن}}+\frac{1}{\text{دووری وێنە}}=\frac{1}{\text{دوورە تیشکۆ}}$$

**چالاکییەکی کرداری خێرا**

**ئاوێنەی ڕووچاڵ**

**کەرەستەکان**

- ✓ کەوچکێکی زیوی یان ستیل.
- ✓ پێنووسێکی کورت.

تێبینی دانەوەی تیشکەکانی پێنووسەکە بکە کە لە لایەن ڕووی ناوەوەی کەوچکە ستیلەکەوە دەدرێتەوە. کەوچکەکە بە هێواشی بەرەو پێنووسەکە بجوولێنە، تێبینی ئەو گۆڕانە بکە لە دانەوەی تیشکی پێنووسەکەدا ڕوودەدات. ئەم هەنگاوانە دووبارە بکەرەوە بە بەکارهێنانی ڕووەکەی تری کەوچکەکە وەك ئاوێنە.



(أ)




(ب)

**وێنەی 5-14**

تیشکە ڕووناکییە تەریبەکان دوای ئەوەی لە ئاوێنەکەوە دەدرێنەوە و لە خاڵێکدا کۆدەبنەوە (أ)، ئەوەش دەتوانرێت بە هێڵکاری (ب) بنوێنرێت کە تیایدا وا دانراوە تیشکەکان لە تەنێکی زۆر دوورەوە هاتوون $(p\approx\infty)$ .

پێویستە پشت بە ڕێسایەکی ڕوون وئاشکرا ببەستین بۆ نیشانەکانی هەرسێ گۆڕاوەکە کە لە هاوکێشەی ئاوێنەدا هاتوون. ئەو ناوچەیەی کە تیشکە دراوەکان دەگرێتە خۆی بۆ دروستکردنی وێنەی ڕاستەقینە پێی دەڵێن ناوچەی پێش ئاوێنە. بەڵام ناوچەی دووەم کە تیشکی ڕاستەقینەی تێدانیە وە وێنەی خەیاڵی دروست دەکات، ناوچەی پشت ئاوێنەکەیە.

**دووری نێوان تەنەکان و وێنەکان لەلایەك و وە ئاوێنەکە لەلایەکی ترەوە بە پۆزەتیڤ دادەنرێت ئەگەر تەن و وێنەکە لەبەردەم ئاوێنەکەدا بن وە بە نێگەتیڤ دادەنرێت ئەگەر لە پشت ئاوێنەکەوەبن. لەبەر ئەوەی ڕووە ڕووناکی دەرەوەکەی ئاوێنەی ڕووچاڵ لە پێشەوەیە بۆیە هەمیشە دوورە تیشکۆکەی پۆزەتیڤ دەبێت. وە درێژی تەنەکەو وێنەکە پۆزەتیڤ دەبن ئەگەر کەوتنە سەروی تەوەرەی بنچینەیی وە نێگەتیڤ دەبن ئەگەر کەوتنە ژێر تەوەرەی بنچینەیی.**

## پەیوەندی گەورەکردن بە درێژی تەن و درێژی وێنەکە

جیا لە ئاوێنەی ڕووتەخت، وێنەی پەیدابوو لە ئاوێنەی گۆییدا قەبارەکەی یەکسان نییە بە قەبارەی تەنەکە، بە پێوانی گەورەیی یان بچووکی وێنەکە بە گوێرەی قەبارە بنەڕەتیەکەی تەنەکە دەگوترێت گەورەکردن.

ئەگەر تۆ شوێنی وێنەکەت زانی بە بەراورد لەگەڵ شوێنی تەنەکە، دەتوانیت گەورەکردنی وێنەکە دیاری بکەیت. گەورەکردن $M$ پێناسە دەکرێت بە ڕێژەی نێوان درێژی وێنەکە بۆ درێژی ڕاستەقینەی تەنەکە. وە $M$ نێگەتیڤ دەبێت، بەپێی دووری وێنەکە لە ئاوێنەکەوە بۆ دووری تەنەکە لە ئاوێنەکەوە. ئەگەر درێژی وێنەکە بچووکتر بوو لە درێژی تەنەکە ئەوا گەورەکردن بچووکترە لەیەك، ئەگەر درێژی وێنەکە گەورەتربوو ئەوا گەورەکردن لەیەك زیاترە. گەورەکردن هێندێکە یەکەی پێوانەیی نیە چونکە ڕێژەیە لە نێوان دوو درێژی دا.

**پەیوەندی گەورەکردن**

$$M = \frac{h'}{h} = -\frac{q}{p}$$

$$\text{گەورەکردن} = \frac{\text{درێژی وێنەکە}}{\text{درێژی تەنەکە}} = \frac{\text{دووری نێوان وێنە و ئاوێنەکە}}{\text{دووری نێوان تەنەکەو ئاوێنەکە}}$$

لەو وێنانەی لەبەردەم ئاوێنەدا دروست دەبن گەورەکردن نێگەتیڤە وە وێنەکە هەڵگەڕاوەیە بە گوێرەی تەنەکەوە. بەڵام بۆ وێنەی دروست بوو لە پشت ئاوێنەکەوە گەورەکردن پۆزەتیڤە وە وێنەکە هەڵنەگەراوەیە بە گوێرەی تەنەکەوە، خشتەی 5-2 نیشانەکانی گەورەکردن ڕوون دەکاتەوە.

**خشتەی 5-2 نیشانەکانی گەورەکردن**

| ئاڕاستەی وێنە بەگوێرەی تەنەکەوە | نیشانەی $M$ | جۆری وێنەکە |
|---|---|---|
| هەڵنەگەڕاوە | + | خەیاڵیە |
| هەڵگەڕاوە | − | ڕاستەقینەیە |

## بەکارهێنانی هێڵکاری تیشکەکان بۆ ئاوێنە گۆیەڕووچاڵەکان

هێڵکاری تیشکەکان بەکاردێت بۆ دڵنیابوون لەو نرخانەی کە لە هاوکێشەی ئاوێنە و هاوکێشەی گەورەکردن دەستمان دەکەوێت. هێڵکاری تیشکەکان کە بەکارهێنران بۆ دیاری کردنی وێنەی تەنێك لە بەردەم ئاوێنەیەکی ڕووتەختدا دەتوانرێت بۆ دیاری کردنی وێنە لە ئاوێنەی ڕووچاڵدا بەکاربهێنرێت، کاتێك هێڵکارییەکی تیشك بۆ ئاوێنەی ڕووچاڵ دەکێشیت هەمان ئەو هەنگاوانە بەکاربێنە کە بۆ ئاوێنەی ڕووتەخت بەکارت هێنا، بەڵام پێویستە دوورییەکان و هەردوو شوێنی چەقی کوڕی $C$ وتیشکۆ $F$ لەسەر تەوەرەی بنچینەیی دیاری بکەیت. وەك لەباری ئاوێنەی ڕووتەختدا، وێنەی هێڵکارییەکە بەپێی پێوەرێکی گونجاو بکێشە، ئەگەر دووری تەنەکە لە ئاوێنەکەوە 50 cm بێت، دەتوانین لەسەر وێنەکە دووریەکە بە 5 cm دابنێین.

لە ئاوێنەی گۆیی دا، سێ تیشکی سەرەکی بەکاردێت بۆ دیاریکردنی خاڵی وێنەکە، شوێنی یەکتربڕینی هەردوو تیشك لە تیشکدراوەکان لەگەڵ یەکتریدا شوێنی وێنەکە دیاری دەکات. وە پێویستە تیشکی دراوەی سێیەم بە هەمان خاڵی یەکتر بڕیندا تێپەڕببێت، وە دەتوانرێت بۆ دڵنیا بوون لە ڕاستی هێڵکاریەکە بەکاربهێنرێت، **خشتەی 5-3** هەرسێ تیشکەکە وەسف دەکات.

**خشتەی 5-3 بنەماکانی هێلکاری تیشکە سەرەکییەکان**

| تیشك | ئەو هێڵەی لە تەنەکەوە بۆ ئاوێنەکە کێشراوە | ئەو هێڵەی لە وێنەکەوە بۆ ئاوێنەکە کێشراوە لە دوای دانەوەی |
|---|---|---|
| 1 | هاوڕێك بە تەوەرەی بنچینەیی | بە تیشکۆی $F$ دا تێپەڕ دەبێت |
| 2 | بە تیشکۆی $F$ دا تێپەڕدەبێ | تەریب بە تەوەری بنچینەیی دەدرێتەوە |
| 3 | بەچەقی کوڕی $C$ دا تێپەڕدەبێ | بەسەر خۆیدادەگەڕێتەوە بە $C$ دا تێپەڕ دەبێت. |

دەبێ دووری وێنەی پەیدا بوو لە ئاوێنەکەوە بەپێی هێڵکارییەکە هەمان بڕی $q$ بێت کە بە هاوکێشەی ئاوێنە دەدۆزرێتەوە. وە لەوانەشە هەمان بڕیان نەبێت وجیاوازبن چونکە ناووردییەك لە وێنەکێشانی هێڵکاریەکەدا هەیە بە هۆی بچووکی پێوەرەکەوە، وە لەو بارەدا کەتیشکەکان لە دوورییەکی زۆر لە تەوەرەی بنچینەییەوە دێن، هێڵکاری تیشکەکان بەکاردێن تەنها بۆ دەست کەوتنی نرخی نزیککراوە. کە ئەمەش ناتوانرێت بە بڕی ژمارەیی وورد دابنرێت.

## وێنەی ڕاستەقینەو وێنەی خەیاڵی پەیدابوو لەئاوێنەی گۆیی (ڕووچاڵ)دا

لەکاتی جوڵاندنی تەنێك بەرەو ئاوێنەیەکی ڕووچاڵ، سیفەتەکانی وێنەکەی دەگۆڕێت، وەك لە **خشتەی 5-4** دا دیارە، ئەگەر تەنەکە زۆر دووربێت لە ئاوێنەکەوە ئەوا تیشکی دەرچوو لە تەنەکەو دراوە لە ئاوێنەکەوە لە خاڵێکی زۆر نزیك لە تیشکۆ $F$ دا یەکتر دەبڕن، بۆ ئەوەی وێنەی تەنەکە لەم شوێنەدا پێکبهێنن. بۆ ئەو تەنانەی کە دەکەونە دورییەکی زیاتر لە نیوەتیرەی کوڕی ئاوێنە $R$ (واتە دورتر لە چەقی کوڕی $C$ )، وێنەیەکی ڕاستەقینەی هەڵگەڕاوەی بچوك کراوەی لە نێوان $C$ و $F$ دا بۆ پەیدا دەبێت. تەنەکە لە $C$ دابێ وێنەکەش لە $C$ دایەو ڕاستەقینەیەو گەورەییەکەی هێندەی گەورەی تەنەکەیە وە هەڵگەڕاوەیە، بەڵام ئەگەر تەنەکە لە نێوان $C$ و $F$ دابنرێت، وێنەیەکی ڕاستەقینەی هەڵگەڕاوەی گەورەکراوی بۆ پەیدا دەبێت کە دەکەوێتە پشت $C$ . بەڵام ئەگەر تەنەکە لەسەر تیشکۆ $F$ دابنرێت، ئەوا وێنە دروست نابێت، وە ئەگەر تەنەکە لە نێوان ئاوێنە و تیشکۆکەدا بێت وێنەیەکی خەیاڵی هەڵنەگەڕاوەی گەورەکراو پەیدا دەبێت، و دەکەوێتە پشت ئاوێنەکەوە.

## هێڵکاری تیشکەکان

**.1**




**دۆخ:** تەن لە دووری بێ کۆتادایە.

**وێنە:** ڕاستەقینەیە لە $F$ دایە.

**.2**




**دۆخ:** تەنەکە لە $C$ دوورترە.

**وێنە:** ڕاستەقینەیە و لە نێوان $C$ و $F$ یە وە هەڵگەڕاوەیە، گەورەکردنەکەی لەیەك بچووکترە.

**.3**




**دۆخ:** تەن لە $C$ دایە.

**وێنە:** ڕاستەقینەیە لە $C$ دا وەهەڵگەڕاوەیە وە گەورە کردنەکەی یەکسانە بە یەك.

**.4**




**دۆخ:** تەن لە نێوان $C$ و $F$ دایە.

**وێنە:** ڕاستەقینەیە وە دوورترە لە $C$ وە هەڵگەڕاوەیە وە گەورەکردنی لەیەك زیاترە.

**.5**




**دۆخ:** تەن لە $F$ دایە.

**وێنە:** لە بێ کۆتایە (وێنە دروست نابێت)

**.6**




**دۆخ:** تەنەکە لە نێوان $F$ و ئاوێنە دایە.

**وێنە:** خەیاڵییە، هەڵنەگەڕاوەیە لە پشت ئاوێنەکەوە. گەورە کردنەکەی لەیەك زیاترە.

## نموونە 5 (ب)

### وێنەکانی ئاوێنەی گۆیی (ڕووچاڵ)

**پرسیار**

دورە تیشکۆی ئاوێنەیەکی ڕووچاڵ دەکاتە **10.0 cm** ، دووری شوێنی وێنەی قەڵەمێك کە بە هەڵنەگەڕاوەیی دانراوە لە دووری **30.0 cm** لە ئاوێنەکەوە دیاریکە. گەورەکردنی وێنەکە بدۆزەرەوە؟

**شیکار**

**1. دەزانم**

نیشانەی دوورە تیشکۆ و بڕەکەی دیاری دەکەم لەگەڵ درێژی تەنەکەدا:

دراو: $f = +10.0 \text{ cm}$ $\quad p = +30.0 \text{ cm}$

ئاوێنەکە ڕووچاڵە، کەواتە $f$ پۆزەتیڤە تەنەکە لە بەردەم ئاوێنەکەدایە بۆیە $p$ پۆزەتیڤ.

نەزانراو: $M = ?\ ,\ q = ?$

**2. پلان دادەنێم**

– هێڵکاری تیشکەکان دەکێشم بە بەکارهێنانی بنەماکانی خشتەی 5-3 :




– هاوکێشەی ئاوێنە بەکاردەهێنم بۆ بەستنەوەی دووری تەن و وێنەکەی لە ئاوێنەکەوە لەگەڵ دوورە تیشکۆدا.

$$\frac{1}{p} + \frac{1}{q} = \frac{1}{f}$$

– هاوکێشەی گەورەکردن بەپێی دووری تەن و وێنەکەی لە ئاوێنەکەوە، بەکاردەهێنم:

$$M = \frac{-q}{p}$$

– هاوکێشەکە ڕێك دەخەمەوە بۆ جیاکردنەوەی دوری وێنەکە لە ئاوێنەکەوە و پاشان هەژماردەکەم:

هەڵگەڕاوەی دووری تەن لە ئاوێنەکەوە لە هەڵگەڕاوەی دوورە تیشکۆ دەردەکەم بۆ دۆزینەوەی دوورییە نەزانراوەکەی وێنەکە.

$$\frac{1}{q} = \frac{1}{f} - \frac{1}{p}$$

**3. هەژماردەکەم**

**بە لەجیاتی** دانانی نرخەکانی $f$ و $p$ لە هەردوو هاوکێشەی ئاوێنەو گەورەکردن دا دووری وێنە و گەورەکردنەکەی دەدۆزمەوە.

$$\frac{1}{q}=\frac{1}{10.0\ \text{cm}}-\frac{1}{30.0\ \text{cm}}=\frac{0.100}{1\ \text{cm}}-\frac{0.033}{1\ \text{cm}}=\frac{0.067}{1\ \text{cm}}$$

$$\boxed{q = 15\ \text{cm}}$$

$$\boxed{M=\frac{-q}{p}=-\frac{15\ \text{cm}}{30\ \text{cm}}=-0.5}$$

**4.هەڵی دەسەنگێنم**

وەڵامەکەم هەڵدەسەنگێنم بەپێی شوێنی وێنەکەو درێژیەکەی.

وێنەکە لە نێوان خاڵی تیشکۆ (10.0 cm) وچەقی کوڕی ئاوێنەکەدا (20.0 cm) دەردەکەوێت ئەوەش ڕاستی هێڵکاری تیشك دەردەخات. وێنەکە بچووکترە لە تەنەکە، وە هەڵگەڕاوەییە $(-1 < M < 0)$ ، هەروەها ڕاستی هێڵکاری تیشك دەردەخات. کەواتە وێنەکە ڕاستەقینەیە.

## ڕاهێنانی 5 (ب)

### وێنەکانی ئاوێنەی گۆیی ڕووچاڵ

1. دووری وێنەکە و گەورەکردنی ئاوێنەکە لە نموونەکەی پێشودا چەندە؟ ئەگەر دوری تەنەکە لە ئاوێنەکەوە 10.0 cm و 5.00 cm بێت، ئایا وێنەکە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە لەهەر بارێکیاندا؟ ئایا وێنەکان هەڵگەڕاوەن یان هەڵنەگەڕاوەن؟ وێنەی هێڵکاری تیشك بکێشە بۆ هەر بارێك، بۆ دڵنیابون لە ڕاستی وەڵامەکەت.

2. ئاوێنەیەکی ڕووچاڵی سەرتاشخانەیەك دووره تیشکۆکەی 33 cm . دووری وێنەی شووشە بۆنێك چەندە کە لەبەردەم ئاوێنەکەدا دانراوە لە دووری 93 cm ؟ گەورەکردنی وێنەکە چەندە؟ ئایا وێنەکە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە؟ هەڵگەڕاوەیە یا هەڵنەگەڕاوەیە؟ هێڵکاری تیشك بکێشە بۆ دیاری کردنی شوێنی وێنەکە، وە بڕی گەورەکردنەکەی بە بەراورد بە تەنەکە؟

3. پیاوێك لەبەردەم ئاوێنەیەکی ڕووچاڵدا وەستاو لە دووری 25.0 cm ، وێنەیەکی هەڵنەگەڕاوەی لە دووری 50.0 cm بۆ پەیدابوو لە پشت ئاوێنەکەوە، نیوە تیرەی کوڕی ئاوێنەکە چەندە؟ گەورەکردنی وێنەکە چەندە؟ ئایا وێنەکە خەیاڵیە یان ڕاستەقینەیە؟

4. قەڵەمێك لە دووری 11.0 cm لەبەردەم ئاوێنەیەکی ڕووچاڵدا دانرا، و وێنەیەکی ڕاستەقینەی بۆ دروست بوو لە دووری 13.2 cm لە ئاوێنەکەوە، دووره تیشکۆی ئاوێنەکە چەندە؟ گەورەکردنی وێنەکە چەندە؟ ئەگەر قەڵەمەکە لە دووری 27.0 cm لە ئاوێنەکەوە دابنرێت، شوێنی وێنەکە لە کوێدا دەبێ؟ گەورەکردنی وێنە تازەکە چەندە؟ وێنە تازەکە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە؟ وێنەی هێڵکاری تیشکك بکێشە بۆ پاسادانی ڕاستی وەڵامەکەت.

# ئاوێنە گۆییە قۆقزەكان

ئۆتۆمبیلە تازەكان ئاوێنەیان لە لا تەنیشتەوە بۆ دادەنرێت بۆ ئەوەی دواوەی پێ ببینرێت، ئەم ئاوێنانە لە ئاوێنەی ڕووتەخت جیاوازن كە وێنەكانیان گەورەكراونین وە لەناوەڕاستەوە كەمێك قۆقزن بەرەو دەرەوە. ئەو وێنەیەی كە لەم ئاوێنانەوە پەیدادەبێت لە ئاوێنەكەوە نزیكترە وە لە تەنەكە بچوكترە، ئەم جۆرە ئاوێنانە پێیان دەگوترێت ئاوێنەی گۆیی قۆقز convex spherical mirror .

**ئاوێنەی گۆیی قۆقز**

بەشێكە لە ڕووی گۆیەك كە ڕووی دەرەوەی ڕووناكی دەداتەوە.

ئاوێنەی گۆیی قۆقز بەشێكە لە ڕووی گۆیەك كە دیوی ناوەوەی بە زیو ڕوكەشكراوە ڕووە ڕووناكی دەرەوەكەی بریتییە لە ڕووە قۆقزەكەی دەرەوە. ئەم جۆرە ئاوێنانە پێیان دەگوترێت ئاوێن پەرت چونكە تیشكەكان پەرت دەبنەوە لە دوای دانەوەیان لە ڕووی ئاوێنەكەوە، وە وا دەردەكەون كە لە خاڵێكی پشت ئاوێنەكەوە هاتوون، بۆیە وێنەی دروست بوو هەمووكات خەیاڵیە وە دووری وێنەكە لە ئاوێنەكەوە نێگەتیڤە وە لەبەر ئەوەی ڕووی تیشكدەرەوەی ئاوێنەكە دەكەوێتە لای بەرامبەر نیوەتیرەی كوڕی بۆیە دووری تیشكۆی ئاوێنەی گۆیی قۆقز نێگەتیڤە ، خشتەی **5-5** نیشانە ناسراوەكان بۆ هەموو جۆرەكانی ئاوێنە كورت دەكاتەوە.

ڕێگای وێنەكێشانی هێڵكاری تیشك لە ئاوێنەی قۆقزدا كەمێك جیاوازە لە باری ئاوێنەی ڕووچاڵدا. هەردوو خاڵی تیشكۆ و چەقی كوڕی دەكەونە پشت ڕووی ئاوێنەكە. وە درێژكراوەی تیشكە دراوەكان لە پشت ئاوێنەكەوە كە بە شێوەی هێڵی پچڕپچڕ دەنوێنرێت وەك لە وێنەی **15-5** (أ)، لەبەر ئەوەی بەڕاستی هیچ تیشكێك لەو ناوچەیەدا نیە، وێنەی دروست بوو وێنەیەكی خەیاڵی هەڵنەگەڕاوەیە كە لە ئەنجامی یەكتربڕینی سێ تیشكە دراوەكە لەو ناوچەیەدا پەیدادەبێت وە گەورەكردنی ئاوێنەی قۆقز لە یەك كەمترە وەك لە وێنەی **15-5** (ب)دا دیارە. وە گەورەكردن لە ئاوێنەی گۆیی قۆقز بۆ ئەو تەنانەی كە دەكەونە بوارە فراوانەكەی بینینەوە وێنەیەكی قەبارە بچووكراوە دروست دەكات، و بوارێكی فراوانتری بینین دەداتە چاودێرێكی جێگر. ئاوێنەی قۆقز زۆرجار لە كۆگا گەورەكان دادەنرێت بۆ یارمەتیدانی فەرمانبەرەكان كە چاودێری هاتوچۆكردنی خەڵك دەكەن هەروەها ئاوێنەی قۆقز لە ڕێڕەوە یەكتربڕەكان دادەنرێت تاوەكو ئەو خەڵكانەی كە لە ئاڕاستەیەكی ترەوە دێن پێش ئەوەی بگەنە یەكتر بڕەكە ببینرێن.

هەروەها ئاوێنەكانی لاتەنیشتی ئۆتۆمبیل نموونەیەكی تری ئاوێنەی قۆقزن وە زۆربەی جار ئەم دەستەواژەیان لەسەر دەنوسرێت (تەنەكان لە شوێنە ڕاستەقینەكەی خۆیان نزیكتر دەردەكەون) ئەگەر ئەم ئاگاداركردنەوەیە نەنووسرێت، شوفێر وا دەزانێت سەیری ئاوێنەی ڕووتەخت دەكات كە قەبارەی وێنەكە ناگۆڕێت. بۆیە لەوانەیە شۆفێرەكە هەڵبخەڵەتێت و وابزانێ كە دوورییەكەی لە بارهەڵگرێكی دیاری كراوەوە زیاترە لە دووریە ڕاستەقینەكەی چونكە وێنەی بارهەڵگرەكە بچووكتر دەبینێت بە بەراورد بە بارهەڵگرەكە خۆی.






(ب)

**وێنەی 15-5**

تیشكەكان پەرت دەبنەوە پاش دانەوەیان لە ئاوێنە قۆقزەكەوە ( أ )، وێنەیەكی بچووكراوەی خەیاڵی هەڵنەگەڕاوە. پەیدادەبێت (ب).

## خشتەی 5-5 هێما بەکارهێنراوەکان لە ئاوێنەدا

| هێما | دۆخەکە | نیشانە |
|---|---|---|
| $p$ | تەنەکە لەبەردەم ئاوێنەکە دایە (تەنی ڕاستەقینە) | + |
| $q$ | وێنەکە لەبەردەم ئاوێنەکە دایە (وێنەی ڕاستەقینە) | + |
| $q$ | وێنەکە لە پشت ئاوێنەکە دایە (وێنەی خەیاڵی) | − |
| $R,f$ | چەقی کوڕی لە پێش ئاوێنەکە دایە (ئاوێنەی گۆیی ڕووچاڵ) | + |
| $R,f$ | چەقی کوڕی لە پشت ئاوێنەکە دایە (ئاوێنەی گۆیی قۆقز) | − |
| $R,f$ | ئاوێنەی ڕووتەخت | $\infty$ |
| $h'$ | وێنەکە لەسەرو تەوەرەی بنچینەیی دایە | + |
| $h'$ | وێنەکە لەژێر تەوەرەی بنچینەیی دایە | − |

$p > 0$

$q > 0$

$q < 0$

$R > 0$, $f > 0$

$R < 0$, $f < 0$

$R,f \rightarrow \infty$

$h, h' > 0$

$h > 0, h' < 0$

### ئایا دەزانیت؟

هەندێك جار ئەو وێنەیەی لە ئاوێنەیەكدا پەیدا دەبێت دەبێتە تەن بۆ ئاوێنەیەكی تر. لەم بارەدا تەنەكە خەیاڵی دەبێت، و دووریەكەی لە ئاوێنەكەوە نێگەتیڤ دەبێ لەخشتەی 5-5 لە باری تەنە خەیاڵیەكاندا ($p < 0$) چونكە بەدەگمەن ڕوودەدات.

## نموونە 5 (ج)

### ئاوێنە گۆییە قۆقزەکان

**پرسیار**

قەڵەمێك لە پێش ئاوێنەیەکی قۆقزدا دانرا، دووره تیشکۆکەی **8.00 cm** وێنەیەکی هەڵنەگەڕاوە پەیدابوو کە درێژییەکەی **2.50 cm** بوو لە دووری **4.44 cm** لە پشت ئاوێنەکەوە. شوێنی تەنەکە و گەورەکردنی وێنەکەو درێژی قەڵەمەکە چەندە؟

**شیکار**

**1. دەزانم**

دراو: $f = -8.00 \text{ cm}$ $q = -4.44 \text{ cm}$ $h' = 2.50 \text{ cm}$

لەبەر ئەوەی ئاوێنەکە قۆقزە، دووره تیشکۆکەی نێگەتیڤە.

وێنەکە لە پشت ئاوێنەکەوەیە، بۆیە $q$ نێگەتیڤە.

نەزانراو: $p = ?$ $h = ?$ $M = ?$

هێڵکاری: وێنەی هێڵکاری تیشکەکان دەکێشم




**2. پلان دادەنێم**

هاوکێشەی ئاوێنە بەکاردێنم

$$\frac{1}{p} + \frac{1}{q} = \frac{1}{f}$$

هاوکێشەی گەورەکردن بەکاردێنم

$$M = \frac{h'}{h} = \frac{-q}{p}$$

هاوکێشەکە ڕێك دەخەم بۆ دەرهێنانی نەزانراوەکە:

$$h = \frac{p}{q}h' \quad \text{و} \quad \frac{1}{p} = \frac{1}{f} - \frac{1}{q}$$

**3. هەژماردەکەم**

بە لە جیاتی دانانی نرخەکان لە هاوکێشەکەدا شیکاری دەکەم.

$$\frac{1}{p} = \frac{1}{-8.00 \text{ cm}} - \frac{1}{-4.44 \text{ cm}}$$

$$\frac{1}{p} = \frac{-0.125}{1 \text{ cm}} - \frac{-0.225}{1 \text{ cm}} = \frac{0.100}{1 \text{ cm}}$$

$$\boxed{p = 10.0 \text{ cm}}$$

نرخەکانی هەریەکە لە $p$ و $q$ لەجیاتیدا دادەنێم بۆ دۆزینەوەی گەورەکردنی وێنەکە.

$$M = -\frac{q}{p} = -\frac{-4.44 \text{ cm}}{10.0 \text{ cm}} = \boxed{0.444}$$

نرخەکانی $p$ و $q$ و $h'$ لە جیاتی دادەنێم بۆ دۆزینەوەی درێژی تەن.

$$h = -\frac{q}{p}h' = \frac{10.0 \text{ cm}}{-4.44 \text{ cm}}(2.5 \text{ cm}) = \boxed{5.63 \text{ cm}}$$

## ڕاهێنانی 5 (ج)

### ئاوێنە گۆییە قۆقزەکان

**1.** وێنەی قەڵەمێك لە دووری 23.0 cm لە پشت ئاوێنەیەکی قۆقزەوە دەردەکەوێت درێژی وێنەکە 1.70 cm بوو. ئەگەر دوورە تیشکۆی ئاوێنەکە 46.0 cm بێت، ئایا دووری قەڵەمەکە لە ئاوێنەکەوە چەندە؟ وە گەورەکردنی وێنەکە چەندە؟ ئایا وێنەکە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە؟ هەڵگەڕاوەیە یان هەڵنەگەڕاوەیە؟ هەروەها درێژی قەڵەمەکە چەندە؟

**2.** ئاوێنەیەکی قۆقز دوورە تیشکۆکەی 0.25 m وێنەیەك درێژیەکەی 0.080 m بۆ ئۆتۆمبیلێك لە دووری 0.24 m لە پشت ئاوێنەکەوە پەیدابوو گەورەکردنی وێنەکە چەندە؟ ئۆتۆمبیلەکە دەکەوێتە کوێ (دووری ئۆتۆمبیلەکە لە ئاوێنەکەوە)؟ درێژییەکەی چەندە؟ ئایا وێنەکە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە؟ هەڵگەڕاوەیە یان هەڵنەگەڕاوەیە؟

**3.** ئاوێنەیەکی قۆقز دوورە تیشکۆکەی 33 cm وێنەیەك بۆ قاپێکی ساردەمەنی لە دووری 19 cm لە پشت ئاوێنەکەوە دروست دەکات، ئەگەر درێژی وێنەکە 7.0 cm بێت، ئایا قاپەکە دەکەوێتە کوێ (دووری قاپەکە لە ئاوێنەکەوە)؟ وە درێژییەکەی چەندە؟ گەورەکردنی وێنەکە چەندە؟ ئایا وێنەکە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵییە؟ هەڵگەڕاوەیە یان هەڵنەگەڕاوەیە؟ وێنەی هێڵکاری تیشکەکان بکێشە بۆ پاسادانی ئەنجامەکەت.

**4.** ئاوێنەیەکی قۆقز نیوە تیرەی کورییەکەی 0.550 m لە ڕێڕەوێکی فرۆشگایەکدا هەڵواسراوە، دووری وێنەی پیاوێك بدۆزەرەوە کە لە ژێر ئاوێنەکە ڕاکشاوە لە دووری 3.1 m لە ئاوێنەکەوە، گەورەکردنی وێنەکە بدۆزەوە؟ ئایا وێنەکە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە؟ هەڵگەڕاوەیە یان هەڵنەگەڕاوەیە؟

**5.** تیرەی پارچە شووشەیەکی گۆیی 6.00 cm ، ئەگەر تەنێك لە دووری 10.5 cm لێوەی دانرا. ئایا وێنەکە لە کوێدا دروست دەبێت وگەورەکردنەکەی چەندە؟ ئایا ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە؟ هەڵگەڕاوەیە یان هەڵنەگەڕاوەیە؟

**6.** مۆمێك لە دووری 49 cm لەبەرامبەر ئاوێنەیەکی گۆیی قۆقزدا دانرا کە دوورە تیشکۆکەی 35 cm ، وێنەکە دەکەوێتە کوێ؟ گەورەکردنەکەی چەندە؟ ئایا ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە؟ هەڵگەڕاوەیە یان هەڵنەگەڕاوەیە؟ وێنەی هێڵکاری تیشکەکان بکێشە بۆ پاسادانی ئەنجامەکەت.

# ئاوێنە شێوە بڕگە هاوتاکان

لە پێشەوە تێبینی ئەوەمان کردووە کەوا هەندێك لە تیشکە دراوەکان لە هێڵکاری تیشکەکاندا لە خاڵی وێنەکەدا یەکتری نابڕن. ئەمەش بە تایبەتی بۆ ئەو تیشکانە ڕوودەدات کە لە ڕووی ئاوێنەکەوە دەدرێنەوە و لە تەوەرەی بنچینەیی دوور دەکەونەوە. وە هەروەها ئەوە بۆ تیشکە ڕووناکیە ڕاستەقینەکان و ئاوێنە گۆییە ڕاستەقینەکان ڕوودەدات.

بەڵام ئەگەر تیشکەکان لە تەنێکی نزیك لە تەوەرەی بنچینەییەوە بدرێنەوە. ئەوا هەموویان لە خاڵی وێنەکەدا یەکتری دەبڕن. ئەو تیشکانەی کە دوور لە تەوەرەی بنچینەیی دەدرێنەوە لە خاڵی جیاجیا وجووت نەبوودا لەسەر تەوەرەی بنچینەیی کۆ دەبنەوە. وەك **وێنەی 5-16** . ئەوەش وێنەیەکی شێواو دروست دەکات وئەم شێواویەش پێی دەگوترێت لێڵ گۆیی ولە هەموو ئاوێنە گۆییەکاندا هەیە.




**وێنەی 5-16**

لێڵ گۆیی ڕوودەدات کاتیك ئەو تیشکە تەریبە دوورانە لەتەوەری بنچینەییەوە، دوورتر لە تیشکۆی ئاوێنەکە دەدرێنەوە.

## ئاوێنە شێوە بڕگە هاوتاکان وچارەسەرکردنی لێڵ گۆیی

یەکێك لە ڕێگە ساکارەکانی کەم کردنەوەی کاریگەری لێڵ گۆیی لەوەدا خۆ دەبینێتەوە کە ئاوێنەی تیرە بچوك بەکار بهێنرێت. بە شێوەیەك تیشکەکان دوور نەبن لە تەوەرەی بنچینەیی ئاوێنەکە. ئەگەر ئاوێنەکە لە بنەڕەتدا گەورە بێت، ئەوا داپۆشینی ڕووی دەرەوەی چوارچێوەکەی وجیاکردنەوەی دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی بەشە دراوەکەی ڕووناکی وە هەمان کاریگەری دروست دەکات (واتە کەمکردنەوەی لێڵ گۆیی). زۆربەی ئاوێنە ڕووچاڵەکان وەك ئەو ئاوێنانەی کە لە تەلسکۆبە گەردوونییەکاندا بەکاردەهێنرێت، گەورەن و بۆ کۆکردنەوەی بڕێکی زۆر لە ڕووناکی بەکاردێن، نابێت ڕووبەری ڕووە بەکار هێنراوەکەی کەم بکرێتەوە لە پێناوی کەم کردنەوەی لێڵ گۆیی. یەکێك لە ڕێگەکانی تر بۆ چارەسەرکردنی لێڵ گۆیی بەکارهێنانی ئەو ئاوێنانەن کە بەشێك نین لە ڕووی گۆیەك و لە هەمان کاتدا ئەتوانن ڕووناکیەکە لە خاڵێکدا کۆبکەنەوە وەك لە ئاوێنە ڕووچاڵە بچووکەکاندا ئەوەش بە بەکارهێنانی ئاوێنە بڕگە هاوتاکان دەبێت.

ئاوێنە بڕگە هاوتاکان بەشێکن لە ڕووە قوپاوە شێوە بڕگە هاوتاکان (لەسێ دوریدا) ڕووی ناوەوەی ڕووناکی دەرەوەیەو هەموو ڕووناکیە دراوەکە لە خاڵی تیشکۆدا کۆ دەکاتەوە. بەبێ ئەوەی گۆی بداتە دورییەکەی لە تەوەرەی بنچینەییەوە، بۆیە وێنەیەکی ڕاستەقینە وبێ لێڵگۆییمان دەست دەکەوێت وەك لە وێنەی **5-17** دا دیارە. هەروەها ئەو تیشکانەی لە تەنێکەوە دێن کە لە تیشکۆکەی دا بێت تەریب بە تەوەرەی بنچینەیی دەدرێنەوە. لەنموونەی ڕووە ڕووناکی دەرەوە شێوە بڕگە هاوتا نموونەیەکان (لایتی دەست و گڵۆپەکانی پێشەوەی ئۆتۆمبیل)ن.




**وێنەی 5-17**

هەموو تیشکە تەریبەکان دوای دانەوەیان لە تیشکۆی ئاوێنەی شێوە بڕگە هاوتاکەدا کۆدەبنەوە، چەمانەوەی وێنەکە زۆر زیاترە لە چەمانەوەی لە ئاوێنەی شێوە بڕگە هاوتا ڕاستەقینەکە.

## بەکارهێنانی ئاوێنە شێوە بڕگە هاوتاکان لە تەلسکۆبە ڕووناکی دەرەوەکاندا

تەلسکۆب یارمەتی بینینی تەنە دوورەکان دەدات، لەوانەیە بینایەك بێت کە چەند کیلۆ مەترێك دووربێت، یان گەلە ئەستێرەیەك بێت کە ملیۆنەها ساڵی ڕووناکی لە زەوییەوە دووربێت. هەموو تەلسکۆبەکان ڕووناکی بینراو بەکارناهێنن، لەبەر ئەوەی هەموو تیشکە کارۆموگناتیسییەکان پەیڕەوی هەمان یاسای دانەوە دەکەن بۆیە دەتوانرێت ڕووی شێوە بڕگە هاوتای وا دروست بکرێت کە توانای کۆکردنەوەی تیشکە کارۆموگناتیسییە درێژی شەپۆل جیاوازەکان و دانەوەیانی هەبێت، تەلسکۆبی بێتەل لە ڕوویەکی ڕووناکی دەرەوەی بڕگە هاوتای گەورە پێکدێت کە شەپۆلە ڕادیۆییە بێتەلەکان دەداتەوە و ئەو شەپۆلانەش وەردەگرێت کە لە تەنە دوورەکانی بۆشایی ئاسمانەوە هاتوون.

هەندێك جۆری تەلسکۆب ڕووناکی بینراو بەکاردەهێنن، یەکێك لەم تەلسکۆبانە پێی دەگوترێت (تەلسکۆبی شکێنەرەوە) کەوا کۆمەڵێك هاوێنە بەکاردەهێنن بۆ دروستکردنی وێنە، جۆرێکی تریان ئاوێنەی گۆیی و هاوێنەی بچووك بەکار دەهێنێت بۆ دروستکردنی وێنە وپێیدەگوترێت (تەلسکۆبی ڕووناکی دەرەوە).

تـەلـیسکـۆبـە ڕووناکـی دەرەوەکـان ئـاوێنـەی شێوە بـڕگـە هـاوتـا بـەکـاردەهێنن (پـێیـدەگـوترێت ئـاوێنتـەن)، لـە پێنـاو کۆ کـردنـەوەی ڕونـاکیـدا. یـەکێك لـە تـەلسکۆبـە ڕووناکی دەرەوەکان کە پێی دەڵێن ڕووناکی دەرەوەی گاسیگراین لە **وێنەی 5-18** دا، تیشکەکان بە تەریبی دەچنە ناو لولەکی تەلیسکۆبەکەوە و لە ڕووی ئاوێنتەنێکی شێوە بڕگە هاوتاوە دەدرێنەوە کە لە بنکەی تەلسکۆبەکەدا هەیە. تیشکەکە بە ئاڕاستەی تیشکۆی ئاوێنتەنەکەوە دەدرێتەوە $F$ ، کەوا دادەنرێت وێنەیەکی ڕاستەقینەی لەوێدا بۆ دروست ببێت، بەڵام ئاوێنەیەکی گۆیی بچوك کە لە ڕێڕەوی تیشکەکەدا دانراوە جارێکی تر بە ئاڕاستەی چەقە ئاوێنتەنەکە دەیداتەوە. ئەوسا بەناو کونێکی بچوکدا تێپەڕ دەبێت کە لەچەقی ئاوێنتەنەکەدایە وتیشکەکان لە خاڵی A دا کۆدەبنەوە و هاوێنچاوێك لە نزیك خاڵی A ەوە وێنەکە گەورە دەکات.

لەوانەیە بپرسیت ئایا دەتوانین کونێکی بچوك بکەینە ئاوێنتەنێکەوە بەبێ ئەوەی کار لە دوا وێنە بکات کە تەلسکۆبەکە دروستی دەکات، هەر پارچەیەك لە پارچەکانی ئاوێنەکە ئەو ڕووناکییە دەداتەوە کە لە تەنە دوورەکانەوە دێت بۆیە هەمیشە وێنەیەکی تەواو بۆ تەنەکە دروست دەبێت. بوونی کونێکی بچوك تەنها بڕی ڕووناکی دراوە کەم دەکاتەوە و لێرەشدا بڕی ڕووناکی دراوە بەو کونە بچوکە کاری تێناکرێت، چونکە توانای کۆکردنەوەی ڕووناکی ئاوێنتەنەکە بەڕوبەری ئاوێنەکەوە بەندنییە. کونێکی بچوك کە تیرەکەی 1 m بێت لە ئاوێنەیەکدا کە تیرەکەی 4 m بێت، $\frac{1}{16}$ ی ڕوبەرە بنچینەییەکەی ڕەش دەکاتەوە، یان % 6.23 .




**وێنەی 5-18**
ئاوێنتەنی شێوە بڕگە هاوتا ئەو تیشکانە کۆ دەکاتەوە کە بەرەو ڕووی ڕووناکی دەرەوەی گاسیگراین دێن.

## پێداچوونەوەی بەندی 5-3

**1.** گۆیەکی پۆلایی سافکراو نیوەتیرەکەی 1.5 cm وێنەیەك دروست دەکات بۆ تەنێك لە دووری 1.1 cm لە ڕووی ئاوێنەیەکەوە. وێنەکە دەکەوێتە کویێ و گەورەکردنی بدۆزەرەوە ئایا وێنەکە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە؟ هەڵگەڕاوە یان هەڵنەگەڕاوەیە؟ وێنەی هێڵکاری تیشکەکان بکێشە بۆ پاسادانی ئەنجامەکەت.

**2.** ئاوێنەیەکی گۆیی لە ئامێری نیشاندانی سینەمادا بەکاردێت بۆ دروستکردنی وێنەیەکی هەڵگەڕاوە درێژیەکەی 95 جار زیاترە لە وێنەی فلیمە سەرەکیەکە، لەسەر شاشە وێنەیەك دروست دەبێت کە 13 m دوورە لە ئاوێنەکەوە. ئایا جۆری ئاوێنە بەکارهاتووەکە چییە؟ وە دووری نێوان وێنەکەو فلیمە سەرەکیەکە چەندە؟

**3.** کام لەم وێنانەی خوارەوە ڕاستەقینەن وە کامیان خەیاڵین؟

أ . وێنەی تەلارێکی دووری درەوشاوە کە خراوەتە سەر پارچە کارتۆنێکی سپی بە هۆی تەلەسکۆبێکی ڕووناکی دەرەوەوە؟

ب . وێنەی ئۆتۆمبیلێك، لە ئاوێنەیەکی ڕووتەختدا کە بۆ بینینی دواوە بەکاردێت؟

ج . وێنەی ڕێڕەوی فرۆشگایەك لە ئاوێنەیەکی قۆقزی چاودێری کردندا؟

# پوختەی بەشی 5

## بیرۆکە بنەڕەتییەکان

### بەندی 5-1 تایبەتمەندییەکانی ڕووناکی

- ڕووناکی شەپۆلی کارۆموگناتیسەکە پێکدێت لە دوو بواری کارەبایی و موگناتیسی کە دەلەرنەوە بە درێژە شەپۆلی جیاجیا.
- سەرەنجامی لێکدانی لەرەلەری شەپۆلێکی کارۆموگناتیسی و درێژی شەپۆلەکەی یەکسانە بە خێرایی بڵاوبوونەوەی ڕووناکیەکە. $c = f\lambda$
- توندی رۆشنایی پێچەوانە دەگۆڕێت لەگەڵ‌دووجای دووری سەرچاوە ڕووناکیەکەدا.

### بەندی 5-2 ئاوێنە ڕووتەختەکان

- ڕووناکی پەیڕەوی یاسای دانەوە دەکات کە دەقەکەی دەڵێت گۆشەی لێدان یەکسانە بە گۆشەی دانەوە.
- ئاوێنەی ڕووتەخت وێنەیەکی خەیاڵی بۆتەن دەدات کە دووری تەنەکە لە ئاوێنەکەوە یەکسانە بەدووری وێنەکە لە ئاوێنەکەوە.
- لە ئاوێنەی گۆشە لە نێوانەکاندا ژمارەی وێنەکان دەگۆڕێت بە گۆڕانی گۆشەی نێوانیان.
- کاتێك چاودێرێك نزیك یان دوور دەکەوێتەوە لە پێش ئاوێنەیەکی ڕووتەخت ئەوا وێنەکەی بە هەمان دووری نزیك یان دوور دەکەوێتەوە لە پشت ئاوێنەکەوە.

### بەندی 5-3 ئاوێنە گۆییەکان

- هاوکێشەی ئاوێنەکان دووری تەن لە ئاوێنەکەوە، وە دووری وێنەکە لە ئاوێنەکەوە بە دووری تیشکۆوە دەبەستێتەوە.
- هاوکێشەی گەورەکردن درێژی وێنەکە بە درێژی تەنەکەوە دەبەستێتەوە، یان دووری وێنەکە لە ئاوێنەکەوە بە دووری تەنەکە لە ئاوێنەکەوە دەبەستێتەوە.

## زاراوە بنەڕەتییەکان

**شەپۆلی کارۆموگناتیسی**
(114 لا) Electromagnetic wave

**دانەوە** (118 لا) Reflection

**گۆشەی لێدان**
(119 لا) Angle of incidence

**گۆشەی دانەوە**
(119 لا) Angle of reflection

**وێنەی خەیاڵی**
(120 لا) Virtual image

**ئاوێنەی گۆیی ڕووچاڵ**
(124 لا) Concave spherical mirror

**وێنەی ڕاستەقینە**
(125 لا) Real image

**ئاوێنەی گۆیی قۆقز**
(132 لا) Convex spehrical mirror

### هێمای گۆڕاوەکان

| بڕەکان | هێمای بڕەکان | یەکەکان | |
|---|---|---|---|
| دوری تەن لە ئاوێنەکە | $p$ | مەتر | m |
| دوری وێنە لە ئاوێنەکە | $q$ | مەتر | m |
| نیوەتیرەی کوڕی | $R$ | مەتر | m |
| دووری تیشکۆ | $f$ | مەتر | m |
| گەورەکردن | $M$ | بێ یەکەیە | |



# پێداچوونەوەی بەشی 5

## پێدا بچۆرەرە و هەڵیسەنگێنە

## تایبەتمەندیەکانی ڕووناکی

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**1.** کام لە ناوچەکانی شەبەنگی کارۆموگناتیسی.

أ. کەمترین لەرەلەریان هەیە؟

ب. کورترین درێژی شەپۆلیان هەیە؟

**2.** کام لەم شەپولە کارۆموگناتیسیانەی خوارەوە بەرزترین لەرەلەریان هەیە؟

أ. شەپۆلە ڕادیۆیە بێ تەلەکان.

ب. تیشکە سەرو وەنەوشەییەکان.

ج. ڕووناکی شین.

د. تیشکە ژێر سوورەکان.

**3.** بۆچی زۆربەی کات دەتوانرێت ڕووناکی بەکاربهێنرێت بۆ پێوانە کردنی دووریەکان بە ووردی؟

**4.** لەم وێنەی خوارەوەدا دەستوری هایگنز بەکاربهێنە بۆ ئەوەی ڕوونیکەیتەوە کە بەرەی شەپۆل لە خاڵی A دا هەمان شێوەی بەرەی شەپۆلە لە خاڵی B دا. چۆن ئەو بەرە شەپۆلە دەنوێنیت بە پێی هێڵکاری تیشك بەنزیکراوەیی؟




**5.** پەیوەندی چیە لە نێوان توندی ڕۆشنایی ڕاستەقینەی سەرچاوەیەکی ڕووناکی و وە ئەو توندی ڕۆشناییەی کە تۆ لە شوێنێکی دیاری کراودا دەیبینی؟

### پرسیار دەربارەی چەمکەکان

**6.** وا دابنێ کە کۆمەڵگایەکی زیرەك هەیە بە توانایە لە ناردن و وەرگرتنی شەپۆلە بێ تەلەکاندا وە لەسەر هەسارەیەك دەژی کە دەسوڕێتەوە بە دەوری ئەستێرەی برۆکیوندا کە 95 ساڵە ڕووناکی لە زەوییەوە دوورە. ئەگەر نیشانەیەك بە ئاراستەی ئەستیرەی برۆکیون نێردرابێت لە ساڵی 1999 دا، ئایا پاش چەند ساڵ پێشبینی گەیشتنەوەی وەڵامەکەت دەکەیت بۆ زەوی. (تێبینی ساڵە ڕووناکی بریتییە لەو دوورییەی کە ڕووناکی دەیبڕێت لەیەك ساڵدا).

**7.** خێرایی ڕۆشتنی تیشکی x لە بۆشاییدا چەندە؟

**8.** بۆچی کەشتیوانەکانی بۆشایی ئاسمان کاتی چاودێریکردنیان بۆ گالاکسیەکان «گەلە ئەستێرەکان» باسی کاتی ڕابردوو دەکەن؟

**9.** ئایا مەرجە ئەو ئەستێرانەی کە درەوشاوە ترن لە شەودا ڕووناکی زیاتر بنێرن لەو ئەستێرانەی کە درەوشانەوەیان کەمترە؟ وەڵامەکەت ڕوونبکەوە؟

### پرسیارەکانی ڕاهێنان

**بۆشیکارکردنی پرسیارەکان 10-13 بڕوانە نموونەی 5 (أ) ل 116**

**10.** چاوی هەنگ و مێرووەکان زۆر هەستیارن بۆ تیشکی سەروووەنەوشەیی لەشەبەنگ دا بە تایبەتی ئەو ڕوناکیانەی کە لەرەلەرەکەیان دەکەوێتە نێوان $1.0 \times 10^{15}$ Hz وە $7.5 \times 10^{14}$ Hz . ئایا درێژی شەپۆلی ئەو دوو لەرە لەرە چەندە؟

**11.** لەرەلەری توندترین ڕووناکی هاتوو لەئەستێرەیەکەوە دەگاتە $3 \times 10^{14}$ Hz . ئایا درێژە شەپۆلی ئەم ڕووناکیە چەندە؟

**12.** درێژی شەپۆلی شەپۆلێکی ڕادیۆی FM چەندە ئەگەر خوێندەوەی ڕادیۆکە 99.5 MHz بێت؟

**13.** ئایا درێژە شەپۆلی نیشانەیەکی ڕادار کە لەرە لەرەکەی 33 GHz بێت چەندە؟

## ئاوێنە ڕووتەختەکان

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**14.** ئایا هەریەك لەم تەنانەی خوارەوە ڕووناکی دانەوەکەیان ڕێکە یان نارێکە؟

أ. گەراجی ئۆتۆمبیل کە لە چیمەنتۆ دروست کرابێت.

ب. گۆمێکی ئاوی وەستاو.

ج. سینیەکی ڕووکەش کراو بەزیوو.

د. پەڕەیەك کاغەز.

هـ. ستوونی جیوە لە گەرمیپێوێکدا.

**15.** ئەگەر لە دوورگەیەکی چۆڵ دا وون بوویت. چۆن ئاوێنەیەك بەکاردەهێنیت بۆ ئاراستەکردنی ڕووناکی خۆر بەرەو فرۆکەیەکی بەدوادا گەڕان؟

**16.** تایبەتمەندییەکانی ئەو وێنەیەی کە ئاوێنەیەکی ڕووتەخت دەیدات بۆ مۆمێك کە لە پشتی دابنرێت چین؟

**17.** ئایا ڕووناکی دانەوە لەڕووی ئاوێنەی ڕووتەختدا ڕوودەدات لە ئەنجامی گواستنەوەی ڕووناکی لە ناوەندێکەوە بۆ ناوەندێکی تر؟ ئەمە ڕوونبکەوە.

**18.** ئایا گۆڕان لە گۆشەی نێوان دوو ئاوێنەی ڕووتەختدا دەبێتە هۆی گۆڕان لە ژمارەی ئەو وێنانەی کە سەرچاوەیەکی ڕووناکی لەنێوانیاندا پەیدایدەکات؟ ئەمە ڕوونبکەرەوە.

**19.** ئەگەر لە دووری 2 m لە ئاوێنەیەکی ڕووتەختەوە وەستا بیت، ئایا لە کوێی پشتی ئاوێنەکەدا وێنەیەکت بۆ دروست دەبێت؟ گەورەکردنی وێنەکە چەندە؟

### پرسیار دەربارەی چەمکەکان

**20.** شێوەی گورزە ڕووناکی دراوە لە ئاوێنەیەکی ڕووتەختەوە چۆن دەبێت، ئەگەر گورزە ڕووناکی لێدەر:

أ. تەریب بێت؟ هەریەك لە تەن و وێنەکە دەکەونە کوێ؟

ب. پەرتەگورزە بێت؟ جۆری هەریەکە لە تەن و وێنەکە چییە (ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە) لەم بارەدا؟

ج. کۆگورزە بێت؟ جۆری هەریەکە لە تەن و وێنەکە چییە (ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە) لەم بارەدا؟

**21.** ئەگەر تۆ لە دووریەکی دیاریکراو لە ئاوێنەیەکی ڕووتەختی شێوە بازنەیی تیرە زانراو وەستابیت، بەڕێگای وێنەکێشانی هێلکاری تیشك، ناوچەی دەوروبەری خۆت کە وێنەکەی لە ئاوێنەکەوە دیارە بکێشە. ئایا بۆی هەیە وێنەی تەنەکانی دەوروبەری خۆت ببینی و وێنەی خۆت نەبینی لە ئاوێنەکە؟ کەی ئەمە دەبێت.

**22.** کاتێك لایتێکی کارەبایی گیرفان دادەگیرسێنیت لە ژوورێکدا ئەوا پەڵەیەکی ڕووناکی لەسەر دیوارەکە دەردەکەوێت، ڕوونی بکەرەوە بۆچی ڕووناکیەکە لەهەواد ا نابینرێت؟

**23.** چۆن دەگونجێت تەنێك هەندێك لە شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکان بە ڕێکی بداتەوە، بەڵام هەندێکی تریان بە نارێکی بداتەوە؟

**24.** ئاوێنەیەك درێژیەکەی 0.85 m بە دیوارێکەوە هەڵواسرا وە بە شێوەیەك لای سەرەوەی 1.7 m لە ڕووی زەویەوە بەرز بوو، یاسای ڕووناکی دانەوەو هێڵکاری تیشکەکان بەکاربهێنە بۆ زانینی ئەوەی ئایا کەسێك کە درێژیەکەی 1.7 m بێت دەتوانێت وێنەی خۆی بە تەواوەتی ببینێت لە ئاوێنەکەدا؟

**25.** ئەم وێنەیەی لاتەنیشت دوو ئاوێنەی ڕوتەخت پیشان دەدات کە گۆشەی نێوانیان $90^o$ بێت. تیشکێك بە گۆشەی $35^o$ لەگەڵ شاوڵدا دەکەوێتە سەر ئاوێنەی A ، یاسای ڕووناکی دانەوە بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی گۆشەی دانەوە لە ئاوێنەی B دا، ئەو شتە نائاساییە چییە کە لە هەردوو تیشکی لێدەرو دراوەدا هەیە لەم بارەدا.



ئاوێنە A

**26.** ئەگەر بە خێرایی 1.2 m/s بەرەو ڕووی ئاوێنەیەکی ڕووتەخت بڕۆیت، ئایا خێرایی وێنەکەت بەرەو ئاوێنەکە چەندە، بە گوێرەی تۆوە وێنەکەت چۆن دەجوڵێت؟

**27.** بۆچی ئەو وێنەیەی بەهۆی دوو ئاوێنەی ڕووتەختی بەرامبەر یەکترەوە پەیدا دەبن بچووك و بچووکتر دەبنەوە؟

**28.** منداڵێك لە ئاوێنەیەکی ڕووتەخت بە خێرایی 1.0 m/s نزیك دەبێتەوە .

أ. بە چ خێراییەك وێنەکەی لە ئاوێنەکە نزیك دەبێتەوە؟

ب. خێرایی وێنەکە بە گوێرەی منداڵەکەوە چەندە؟

ج. ئەگەر منداڵەکە ڕاوەستاو ئاوێنەکە بەرەو منداڵەکە جووڵێنرا بە خێرایی 1.0 m/s ، بە چ خێراییەك وێنەی منداڵەکە دەجووڵێت بە گوێرەی ئاوێنەکەوە؟

## ئاوێنە گۆییەکان

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**29.** کام جۆری ئاوێنە بەکاردەهێنرێ بۆ ئەوەی وێنە سینەماییەکان بخرێنە سەر شاشەی گەورە؟

**30.** ئەگەر تەنێك لە پشت تیشکۆی ئاوێنەیەکی ڕووچاڵەوە دانرا، ئەوا جۆری وێنە دروستبووەکە چۆنە؟ ئایا ئەم وێنەیە لەبەردەم ئاوێنەکە یان لە پشتیەوە دەردەکەوێت؟

**31.** ئایا دەتوانی ئاوێنەیەکی قۆقز بەکاربهێنی بۆ کون کردنی کاغەزێك بە سوتان، لە ڕێگای کۆکردنەوەی تیشکی خۆر لە تیشکۆکەیدا؟

**32.** ئاوێنەی قۆقز وێنەی تەنێکی ڕاستەقینە دەدات، ئایا دەتوانرێ ئەو وێنەیە گەورەتربکرێت لەتەنە ڕاستەقینەکە؟

**33.** بۆچی لە تەلسکۆبە ڕووناکی دەرەوەکاندا وا باشترە ئاوێنەی شێوە برگە هاوتا بەکاربهێنرێت لە جیاتی بەکارهێنانی ئاوێنەی گۆیی؟

### پرسیار دەربارەی چەمکەکان

**34.** چۆن تیشکی ڕووناکی تەریب بە تەوەرەی بنچینەی ئاوێنەی ڕووچاڵ دەدرێتەوە، کاتی بەرکەوتنی بەرووی ئاوێنەکە؟

**35.** چی بەسەر وێنەیەکی ڕاستەقینەدا دێت کە ئاوێنەیەکی ڕووچاڵ بۆ تەنێك دروستی دەکات ئەگەر تەنەکە بگوازرێتەوە بۆ شوێنی وێنەکە؟

**36.** وادابنێ ئاوێنەیەکی گۆیی ڕووچاڵ وتەنێکی ڕاستەقینەت هەیە، ئایا وێنەکە هەردەم هەڵگەڕاوەیە، وە ئایا هەردەم ڕاستەقینەیە؟ مەرجی وەڵامەکەت دیاری بکە.

**37.** بۆچی توندی ڕووناکی وێنە گەورەکراوەکان کەمترە لە ڕووناکی تەنە بنەڕەتیەکان؟

**38.** ئەو تاقیکردنەوەیە چییە کە دەتوانیت ئەنجامی بدەیت بۆ ئەوەی بیسەلمێنی کە وێنەی تەنێك ڕاستەقینەیە یان خەیاڵییە؟

**39.** ئاوێنەیەکی ڕووچاڵت هەیە لەوانەیە لە شێوەی برگە هاوتادا بێت یان نا، ئەو تاقیکردنەوە چییە کە دەتوانی ئەنجامی بدەیت بۆ سەلماندنی ئەوەی سەرەوە؟

### پرسیارەکانی ڕاهێنان

**بۆ شیکارکردنی پرسیاری 40 ، 41 سەیری نموونەی 5 (ب) ل 130 بکە.**

**40.** ئاوێنەیەکی سەرتاشینی ڕووچاڵ نیوە تیرەی کوڕیەکەی 25.0 cm بێت. گەورەکردنی لە هەریەك لەم بارانەدا بدۆزەرەوە، وە دیاری بکە ئایا وێنەکە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە، هەڵگەڕاوەیە یان هەڵنەگەڕاوەیە؟

أ. قەڵەمێك لە دووری 45.0 cm لە ئاوێنەکەوە دانرابێت.

ب. قەڵەمێك لەدووری 25.0 cm لە ئاوێنەکەوە دانرابێت.

ج. قەڵەمێك لە دووری 5.00 cm لەئاوێنەکەوە دانرابێت.

**41.** ئاوێنەیەکی گۆیی ڕووچاڵ بەکارهات بۆ ئەوەی وێنەیەکی ڕاستەقینەی گەورەکراو بۆ تەنێکی ڕاستەقینە بخاتە سەر ڕووی کاغەزێك، ئەگەر دوورە تیشکۆی ئاوێنەکە 8.5 cm بێت، ئایا دەبێت کاغەزەکە لە کوێدابنرێت تاوەکو وێنەیەك دروست بێت کە دووریەکەی دوو هێندەی دووری تەنەکە بێت لە ئاوێنەکەوە؟ ئایا وێنەکە هەڵگەڕاوەیە یان هەڵنەگەڕاوەیە؟ ڕاستەقینەیە یان خەیاڵییە؟ گەورەکردنی وێنەکە چەندە؟

**بۆ شیکارکردنی پرسیاری 42 سەیری نموونەی 5 (ج) ل 134 بکە.**

**42.** ئاوێنەیەکی گۆیی قۆقز نیوەتیرەی کوڕییەکەی 45.0 cm وێنە بۆ قەڵەمێك دروست دەکات بەرزیەکەی 1.70 cm لە دووری 15.8 cm لە پشت ئاوێنەکەوە. دووری قەڵەمەکە لە ئاوێنەکەو درێژییەکەی چەندە؟ وە ئایا وێنەکە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە؟ گەورەکردن چەندە؟ ئایا هەڵگەڕاوەیە یان هەڵنەگەڕاوەیە؟

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**43.** گەورەکردنی وێنەی دارێك بەهۆی ئاوێنەی سەرەتایی تەلەسکۆبەوە 0.085 - ئەگەر شوێنی ئەو وێنەیە لە دووری 35 cm بێت لە پێش ئاوێنەکەوە. ئەوا دووری نێوان دارەکەو ئاوێنەکە چەندە؟ دوورە تیشکۆی ئاوێنەکە چەندە؟ نیوە تیرەی کوڕی ئاوێنەکە چەندە؟ ئایا وێنەکە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵییە؟ ئایا هەڵگەڕاوەیە یان هەڵنەگەڕاوەیە؟

**44.** سەرچاوەیەکی ڕووناکی دەکەوێتە سەر تەوەرەی ئاوێنەیەکی ڕووتەختی شێوە چوارگۆشە کە درێژی لایەکی 80 cm بوو. ئەگەر دووری نێوان سەرچاوەکە و ئاوێنەکە 30 cm بێت، شێوە و دوورییەکانی ناوچە ڕووناککراوەکە کەبەهۆی ڕووناکی دانەوەکەوە پەیدادەبێت لەسەر دیوارێکی تەریب بە ئاوێنەکە لە دووری 40 cm لەدوای سەرچاوە ڕووناکیەکە؟

**45.** چاودێرێك درێژیەکەی 180 cm بوو سەیری وێنەکەی خۆی دەکات لەئاوێنەیەکی ڕووتەختدا، وە دووری نێوان چاوەکانی و زەوی 170 cm بوو. ئایا دەبێت کەمترین بەرزی بۆ ئاوێنەکە و دوورترین دووری لەلای خوارەوەی لە زەوی چەند بێت. تا چاودێرەکە بەتەواوی وێنەکەی خۆی لەئاوێنەکە ببینێ؟

**46.** مۆمی S لەدوورییەکی یەکسان دانرا لە دوو ئاوێنەی ڕووتەختەوە OM ، و OM کە گۆشەی نێوانیان °240 بوو.

أ. بەوێنە شێوەی مۆمی S لە هەریەك لە ئاوێنەکان بەدەست بهێنە، وە دووری نێوان دوو شێوەکە هەژماربکە ئەگەر دووری نێوان S و خاڵی یەکتربڕینی دوو ئاوێنەکە O ، 50 cm بێت.

ب. پێویستە S بکەوێتە کام ناوچە تاوەکو بەردەوام گورزە ڕووناکی دراوەکان دەست بکەوێت لەهەردوو ئاوێنەکەدا؟ چی دەبێت ئەگەر S بکەوێتە دەرەوەی ناوچەکە؟

**47.** وا دابنێ مۆم هەڵگرێك ڕوویەکی ڕووناکی دەرەوەی ڕووچاڵی هەیە، وەك لە وێنەکەی خوارەوەدا دیارە. ڕووەکە وێنەی مۆمەکە گەورە دەکات بە بڕی 0.75 - جار، وێنەکە لە دووری 4.6 cm لە بەردەم ئاوێنەکەدا پەیدادەبێت. ئایا وێنەکە هەڵگەڕاوەیە یان هەڵنەگەڕاوەیە؟ دووری مۆمەکە لە ڕووە ڕووناکی دەرەوەکەوە چەندە؟ دوورە تیشکۆی ڕووە ڕووناکی دەرەوەکە چەندە؟ ئایا وێنەکە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە؟



**48.** منداڵێك پارچە نەستەلەیەکی لە دووری 15.5 cm لە ئاوێنەیەکی قۆقزی ئۆتۆمبێلێکەوە کە بۆ بینینی پشتەوە بەکاردێت دانا. درێژی وێنەکە نیوەی درێژی پارچە نەستەلەکەیە ئایا نیوە تیرەی کوڕی ئاوێنەکە چەندە؟

**49.** گلۆپێکی داگیرساو لە بەرامبەر ئاوێنەیەکی ڕووچاڵدا لە دووری 15 cm دانرا، وە وێنەیەکی ڕاستەقینەی بۆ دروست بوو لە دووری 8.5 cm لە ئاوێنەکەوە، ئەگەر گلۆپەکە بگوازرێتەوە بۆ دووری 25 cm لە ئاوێنەکەوە، وێنەکە دەکەوێتە کوێ؟ وە ئایا دوا وێنە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە؟ ئایا گەورەکردنی هەردوو وێنەکە چەندە؟ ئایا وێنەکان هەڵگەڕاوەن یان هەڵنەگەڕاوەن؟

**50.** ئاوێنەیەکی قۆقز بە بنمێچێکەوە چەسپ کرا لە دووریانێکی یەکتربڕدا. ئەگەر یەکێك لە ژێر ئاوێنەکەوە وەستا، بە جۆرێك دووری پێڵاوەکانی لە ئاوێنەکەوە 195 cm بێت، وە وێنەی دروست بوو بۆ پێڵاوەکە لە پشت ئاوێنەکەوە لە دووری 12.8 cm بێت. ئایا دوورە تیشکۆی ئاوێنەکە چەندە؟ گەورەکردنی وێنەکە چەندە؟ ئایا وێنەکە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە؟ هەڵگەڕاوەیە یان هەڵنەگەڕاوەیە؟

**51.** نیوە تیرەی کوڕی ئاوێنەکانی لاتەنیشتی ئۆتۆمبیل 11.3 cm وێنەیەکی خەیاڵی دروست دەکات درێژییەکەی سێ یەکی درێژی تەنەکەیە. ئایا دووری تەنەکە لە ئاوێنەکەوە چەندە؟

**52.** تەنێك لە بەرامبەر ئاوێنەیەك لە دووری 10.0 cm دانرا، ئایا جۆری ئەو ئاوێنەیە چییە بۆ ئەوەی لەسەر دیوارێك کە 2.00 m دوورە لە ئاوێنەکەوە وێنەیەك بۆ تەنەکە دروست بکات،گەورەکردنی وێنەکە چەندە؟ ئایا وێنەکە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە؟ ئایا هەڵگەڕاوەیە یان هەڵنەگەڕاوەیە؟

**53.** بیسەلمێنە کاتێك کە نیوەتیرەی کوڕی ئاوێنەی ڕووتەخت بێ کۆتاییە. هاوکێشەی ئاوێنەکە دەبێتە $q = -p$.

**.54** ئاوێنەیەکی گەورەی ڕووچاڵ لەلای نیشانەی 100.0cm لە ڕاستەیەکی مەتری دانراوە لەسەر نیشانەی(0.0)ی ڕاستەکە تەنێکی ڕاستەقینە دانراوە لەسەر نیشانەی 70.0cm دا وێنەیەك پەیدابوو ئەگەر ئاوێنەیەکی قۆقزی بچووك لەلای نیشانەی 20.0cm دانرا. وێنەی کۆتایی هەمان تەن لەسەر نیشانەی 10.0cm پەیدابوو. ئایا نیوەتیرەی کوڕی ئاوێنە قۆقزەکە چەندە؟ (تێبینی وێنەی یەکەم لە ئاوێنەی ڕووچاڵەکە دەبێتە تەن بۆ ئاوێنە قۆقزەکە)

**.55** یەکێك لە ئارەزوومەندەکانی پێشبرکێی ئۆتۆمبیل کە کڵاوەکەی نیوە گۆییە و لە دەرەوەو ناوەوە بۆیەی کرد بە ماددەیەکی ڕووناکیدەرەوە، ئەگەر سەیری ناوەوەی کڵاوەکەی بکات وێنەی خۆی دەبینێت لە دووری 30.0 cm دا لە پشت کڵاوەکەوە، ئەگەر سەیری دەرەوەی کڵاوەکە بکات وێنەی خۆی لە دووری 10.0 cm لەپشت کڵاوەکە دەبینێت.

أ. دووریەکەی چەند بووە لە کڵاوەکەوە؟

ب. نیوەتیرەی کوڕی کڵاوەکە چەندە؟

ج. گەورەکردنی وێنەکە چەندە؟

د. دوو وێنەکە ڕاستەقینەن یان خەیاڵین؟

هـ. دوو وێنەکە هەڵگەڕاوەن یان هەڵنەگەڕاوەن؟

**.56** تەنێك درێژیەکەی 2.70 cm لە دووری 12.0 cm لە بەرامبەر ئاوێنەیەکدا دانرابوو. ئایا جۆری ئاوێنەکە و نیوە تیرەی کوڕیەکەی چەندە؟ کە وێنەیەکی هەڵنەگەڕاوەی بۆ دروست بوو کە درێژی 5.40 cm بێت، گەورەکردنی وێنەکە چەندە؟ ئایا وێنەکە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵیە؟

## پرۆژە و ڕاپۆرتەکان

**.1** لەگەڵ گروپێك لە هاوڕێکانتدا کار بکە بۆ دۆزینەوەی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئاوێنەی بنمیچ و گۆشەکان وەك ئامرازێکی چاودێریکردن کە پشت بە تەکنیکی سادە دەبەستن. هێلکاری نەخشەی زەوی سوپرمارکێتێك بکێشە، ئەو شوێنانە دیاربکە کە فەرمانبەرێك دەتوانێت ئاوێنەی ڕوتەخت لە گۆشەیەکدا بەکاربهێنێت بۆ چاودێریکردن، ئەگەر توانرا ئاوێنەی گۆیی بەکاربهێنرێت. ئایا چ جۆرە ئاوێنەیەك هەڵدەبژێردرێت. ڕووچاڵ یان قۆقز؟ وە لە چ شوێنێکدا دایاندەنێت، جێگەکانی سوپەمارکێتەکە دیاربکە کە دەتوانرێت چاودێری بکرێت بە بەکارهێنانی ئاوێنە گۆییەکان، ئەو گرفتانەی دێتە ڕێگەتان لە هەڵبژاردنی ئاوێنەکاندا چییە؟

**.2** لێکۆڵینەوەیەك بکە دەربارەی ناوچەیەکی دیاریکراو لە شەبەنگی کارۆموگناتیسی. هەروەها دەربارەی کاریگەری ئەو ناوچەیە و بەکار هێنانەکانی، زانیاری بەدەست بهێنە لەسەر مەودای درێژە شەپۆلەکان و لەرە لەرە دروستکراوەکانی ئەو ناوچەیە. وە هەروەها دەربارەی ڕێگەی کەشفکردن. باسی ئەو مەترسیانە بکە کە لەو شەپۆلانەو بەکارهێنانەکانیانەوە لە تەکنیکدا پەیدا دەبن لە گەڵ گروپەکانی تردا هاوکاری بکە کە لەناوچەکانی تری شەبەنگ دەکۆڵنەوە. بۆ ئەوەی کارێکی هەرەوەزی بکەن لە ئامادەکردنی بڵاوکراوەیەکدا یان سایتێکی ئینتەرنێت کە هەموو شەبەنگی کارۆموگناتیسی بگرێتەوە.

**.3** زانای فەلەکی چینی تشانگ هینگ گەیشتە ئەو ڕاستیەی کە ڕووناکی سەر ڕووی هەیڤ لە ئەنجامی دانەوەی ڕووناکی خۆرەوەیە، وە هەڵسا بە جێبەجێکردنی بیردۆزەکەی بۆ لێکدانەوەی دیاردەی هەیڤ گیران. وێنەی چەند هێڵکارییەك بکێشە ئەوە دەربخات کە بە چ شێوەیەك هێنگ ڕووناکی هەیڤ وڕێڕەوی ڕووناکی نواند کاتێ کە زەوی و هەیڤ و خۆر لە شوێنی جیاوازدا جێگیر دەبن لە شەوانی ئاساییدا وە هەروەها لەو شەوانەدا کە هەیڤ گیرانی تێدا ڕوودەدات باسی کارە زانستیەکانی تری هێنگ بکەو هەرچییەکت بینیوە لە ڕاپۆرتێکدا پیشکەشی پۆلەکەتی بکە.

**.4** ژمارەی ئەو وێنانە بدۆزەرەوە کە بەدەستیان دەهێنیت کاتێك لە نێوان دوو ئاوێنەی ڕووتەختی بەرانبەر یەکتردا دەوەستێت کە ڕوە ڕووناکی دەرەوەکەیان بەرانبەر یەکترە. شوێنەکانی وێنەکان لە کوێدان؟ ئایا لە قەبارەدا بەقەدەر یەکتر دەبن؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە بە بەکارهێنانی هێلکاری و هەژمارکردنەکان، لە پاشاندا ئەو ئەنجامانە بپشکنە کە لەدوو ئاوێنە تەرییەکەوە بەدەست هاتوون. هەروەها بۆ دوو ئاوێنەی ئەستون لەسەریەکترو بۆ ئەو دوو ئاوێنەیەش کە گۆشەیەکی دیاریکراو لە نێوان دوو ڕووەکەیاندا هەیە، ئەو گۆشەیەی یەك وێنە دەدات، یان دوو وێنە یان سێ وێنە یان پێنج یان حەوت وێنە دەدات کامەیە؟ ئەنجامەکانت لەسەر وێنەکە پوخت بکەرەوە یان لەسەر هێلکارییەکە یان بەبەکارهێنانی کۆمپیوتەر.

# بـــــەشـــــی 6

# شکانەوە

## *Refraction*

زۆربەمان پەلکە زێڕینەمان دیووەکە پەیدا دەبێت لە ئەنجامی بەرکەوتنی تیشکی ڕووناکی بە دڵۆپەکانی ئاو لەهەوادا. تیشکەکانی ڕووناکی لادەدەن یان دەشکێنەوە کاتی تێپەڕبوونیان بە دڵۆپە ئاوەکاندا. ئەو شەپۆلە ڕووناکیانەی کە درێژی شەپۆلیان زۆرە (ڕەنگی سور) کەم لادەدەن لە ڕێرەوەکەیان، بەڵام ئەو شەپۆلانەی کە درێژی شەپۆلیان کورتە (ڕەنگی وەنەوشەیی) زۆرتر لادەدەن لە ڕێرەوەکەیان.




### ئەوەی کە پێشبینی بەدیهێنانی دەکرێت

لەم بەشەدا دیاردەکانی ڕوناکی کە پەیوەستن بە شکانەوەی ڕووناکی لە کاتی تێپەڕبوونی لە ناوەندی ڕوونەوە بۆ ناوەندێکی تر دەخوێنین.

فێر دەبیت کە چۆن ڕەفتار دەکەیت لەگەڵ هاوێنپەرت و هاوێن کۆ و تێدەگەی لە ڕێگەی کارکردنی ئامێرەبینایەکان بە شێوەیەکی باشتر.

### گرنگییەکەی چییە

ئامێرە بینایەکانی وەك کامیرە و میکرۆسکۆب و تەلسکۆب، کاردەکەن لەسەر بنەمای دانەوە و شکانەوە بۆ بەرهەمهێنانی وێنە کە دەتوانین بەکاری بهێنین لە زۆربەی جێبەجێکردنە زانستی و هونەریەکاندا وە تێگەیشتن لە چۆنیەتی کارکردنی هاوێنە زۆرگرنگە بۆ پێوانکارییە بیناییەکان.

### ناوەڕۆکی بەشی 6

**1 شکانەوە**
- شکانەوەی ڕووناکی.
- جووتە یاسای شکانەوە.

**2 هاوێنە تەنکەکان**
- جۆرەکانی هاوێنە.
- تایبەتمەندییەکانی هاوێنە.
- دوو هاوکێشەکەی هاوێنە تەنکەکان و گەورەکردن.
- چاویلکە و هاوێنە لکێنراوەکان.
- کۆکردنەوەی هاوێنەتەنکەکان

**3 دیاردەکانی ڕووناکی**
- دانەوەی تەواوەتی ناوەکی و گۆشەی مۆڵەقە
- پەرەوازەکردن
- شکانەوە لە بەرگە هەوادا
- لێل ڕەنگی لە هاوێنەدا.

# بەندی 1-6

# شکانەوە
## *Refraction*

### 1-6 ئامانجەکان

- ئەو بارانە دیاری دەکات کە ڕووناکی شکانەوەتێیدا ڕوودەدات.
- ئاراستەی لادانی ڕووناکی دیاریدەکات کاتێك لە ناوەندێکەوە بچێتە ناوەندێکی تر
- شیکاری پرسیارەکان دەکات بەبەکارهێنانی یاسای سنێڵ.

**شکانەوە:** **Refraction**

گۆڕانی ئاراستەی بەرەی شەپۆلە کاتێك بە لاری لە ناوەندێکەوە دەچێتە ناوەندێکی تری چڕی جیاواز بە هۆی گۆڕانی خێراییەوە.

## شکانەوەی ڕووناکی

لە **وێنەی 1-6** دا سەیری وێنەی ئەو گوڵە بچووکە بکە لە نێو دڵۆپە ئاوێکەوە، وادەردەکەوێ کە وێنەی گوڵەکە لە پشت دڵۆپەکەدایە. بۆچی گوڵەکە جیاواز دەردەکەوێ کاتی سەیرکردنی لە ڕێی دڵۆپەکەوە؟ ئەم دیاردەیە ڕوودەدات چونکە ڕووناکی لادەدات لەڕووە جیاکراوەکەی نێوان ئاوو هەوای دەوروبەری. لادانی ڕووناکی لە ڕێرەوەکەی لە کاتی تێپەڕبوونی لە ناوەندێکی ڕوونەوە بۆ ناوەندێکی تری ڕوون پێیدەڵێن **شکانەوە** refraction . گەر ڕووناکیەك لە ناوەندێکی ڕوونەوە بۆ ناوەندێکی تری ڕوون تێپەر بێت، وە تیشکەکە ئەستون نەبێت لەسەر ڕووە جیاکراوەکە، ئاراستەی ڕووناکیەکە لە ڕووەکەدا لادەدات وەك لە باری ڕووناکیدانەوەدا یا لە باری شکانەوەکەدا، گۆشەی لێدان و شکانەوە بە گوێرەی ستونی سەر ڕووەجیاکەرەوەکە دەپێورێت، کاتێ لێکۆڵینەوە لە شکانەوە دەکرێت ستونەکە درێژ دەکرێتەوە بۆ ناوەندەکەی تر، وەك لە **وێنە 2-6** دا دیارە وە بەگۆشەی نێوان تیشکی شکاوە و ستونەکە دەوترێت گۆشەی شکانەوە $\theta_r$. وەبەگۆشەی نێوان تیشکی لێدەرو ستونەکە دەوترێت گۆشەی لێدان $\theta_i$.

### شکانەوەو گۆڕان لە خێرایی ڕووناکیدا

شوشە و ئاو هەواو کوارتز نموونەن لەسەر ناوەندە ڕوونەکان کە ڕووناکی دەتوانێ پیایاندا تێ پەڕبێت، خێرایی ڕووناکی لە ناوەندێکەوە بۆ ناوەندێکی تر جیاوازە. بۆ نموونە خێرایی ڕووناکی لە ئاودا کەمترە لە خێرایی ڕووناکی لە هەوادا. هەروەها خێرایی ڕووناکی لە شووشەدا کەمترە لە خێرایی ڕووناکی لە ئاودا.



**وێنەی 1-6**
گوڵەکە بچوکتر بەدیار دەکەوێت لە کاتی سەیرکردنی لە نێودڵۆپە ئاوەکەدا. ئەوتیشکەی لە گوڵەکەوە دەرئەچێت لادەدات لەبەر شێوەی دڵۆپە ئاوەکەوە و لە ئەنجامی گۆڕانی ناوەندەکە بە تێپەڕ بوونی ڕووناکی بەناو ئاوەکەدا.







**وێنەی 2-6**
لە ئەنجامی تێپەڕبوونی ڕووناکی لە ناوەندێکەوە بۆ ناوەندێکی تر بەشێوەیەکی لار لەسەر ڕووەکە بەشێك لە ڕووناکیەکە دەدرێتەوەو، وەبەشەکەی تری دەشکێتەوە **(أ)** بە تێپەڕبوونی تیشکی ڕووناکی لە هەواوە بۆ شووشە تیشکە شکاوەکە لادەدات و نزیك دەبێتەوە لە ستوونەکە (ب) کاتێ تێپەڕبوونی تیشکی ڕووناکی لە شووشەوە بۆ هەوا تیشکە شکاوەکە لادەدات و لە ستونەکە دووردەکەوێتەوە.

لە كاتی تێپەڕبوونی ڕووناكی لە ناوەندێكەوە بۆ ناوەندێكی تر كە خێرایی ڕووناكی تێیدا كەمترە وەك لە باری تێپەڕبوونی ڕووناكی لە هەواوە بۆ شوشە تێشكەكە لادەدات و نزیك دەبێتەوە، لە ئەستونە كێشراوەكە، وەك لە **وێنەی 6-2** (أ) بەڵام ئەگەر تیشكەكە تێپەڕبوو لە ناوەندێكەوە بۆ ناوەندێكی تر كە خێرایی ڕووناكی تیایدا زیاتر بێت وەك لە **وێنەی 6-2** (ب) تیشكەكە لادەدات و دوور دەكەوێتەوە لە ئەستونە كێشراوەكە، بەڵام ئەگەر تیشكە كەوتوەكە تەریب بێت بە ئەستونی كێشراو لەسەر ڕووەكە، شكانەوە ڕوونادات ( گەر تیشكەكە لە ناوەندی چڕی زۆر بچێتە ناوەندی چڕی كەم یان بەپێچەوانەوە).

تێبینی ڕێڕەوی ڕووناكی بكە كە ڕووە جیاكەرەوەكەی نێوان دووناوەندەكە دەبڕێت. لە **وێنەی 6-2** (ب) دا ئەگەر تیشكێك لە شووشەكەوە دەربچێت ئەوا تیشكەكە هەمان ڕێڕەوی دەبێت بەڵام تیشكە دراوەكە ئەمجارەیان ڕووە و ناو شووشەكە دەبێت.

### ئایا دەزانیت؟

خێرایی ڕووناكی $c$ لە بۆشایی نەگۆڕێكی گرنگە لە فیزیادا وە نرخە پێوراوەكەی دەگاتە نزیكەی $3.00 \times 10^8$ m/s بەڵام لە ناوندەكانی تردا وەك هەواو ئاو و شووشە خێرایی ڕووناكی كەمترە لە $c$ .

### لێكدانەوەی شكانەوەی ڕووناكی لەسەر بنەمای شەپۆلە بیردۆزی ڕووناكی

لە بەشی پێشودا فێری ( ڕووناكیدانەوە ) بوویت وە چۆن بەرە شەپۆڵەكان و تیشكە ڕووناكیەكان وەك سەرچاوەی شەپۆلە ڕووناكی بەكاردەهێنرێت. دەتوانرێت ئەم بارە جێبەجێ بكرێت لە تێپەڕبوونی ڕووناكی لە ناوەندێكەوە بۆ ناوەندێكی تر. لە **وێنەی 6-3 دا** بەرەی شەپۆلە گۆییەكان بە ڕەنگی سوور كێشراون بەرەی شەپۆلی یەكگرتوو( ئەو هێڵانەی نیشاندراون بە خاڵ كە بەرە شەپۆلە بڵاوبوەكان بەیەك دەگەیەنێت) بەلێكەوتی هاوبەش دادەنرێ بۆ هەر بەرەی شەپۆلێك، كە ئاراستەی تێپەڕبوونی شەپۆلەكەیە (كە پێی دەڵێن تیشكی ڕووناكی) ستوون دەبێت لەسەر لێكەوتەكە وا دابنێ كە بەرەی شەپۆلەكانی شەپۆلێكی تەخت بە گۆشەیەكی دیاریكراو بە ڕووی پارچە شووشەیەكدا تێپەڕدەبێت وەك لە **وێنەی 6-3** دا دیارە. كاتێك تیشكی ڕووناكی دەچێتە ناو شووشەكەوە ئەوا بەرەی شەپۆلە ڕوناكیەكان هێواش دەبنەوە، بەڵام ئەو بەرە شەپۆلە ڕووناكیانەی كە هێشتا نەگەیشتوونەتە شووشەكە لە ڕێرەوەكەیاندا بە خێرایی ڕووناكی لە هەوادا بەردەوام دەبن، لەم كاتەدا بەرەی شەپۆلە هێواشبووەكان دووریەكی كەمتر دەبڕن بەبەراوردكردنی بە بەرەی شەپۆلەكانی ڕووناكی لەهەوادا. بەم شێوەیە شەپۆلە تەختەكە ئاراستەی ڕێڕەوەكەی دەگۆڕێت.

تێبینی ئەو جیاوازیەی كە لە درێژە شەپۆلی (دووری نێوان بەرەی شەپۆلەكان) و نێوان شەپۆلە تەختەكان كە بەهەوادا تێپەڕدەبن، لەگەڵ ئەو شەپۆلانەی كە دەچنە ناو شووشەكەوە بكە. لەبەر ئەوەی ئەو بەرە شەپۆلانەی كە بەناو شووشەكەدا تێپەڕدەبن هێواش ترن بۆیە دووریەكی كەمتر دەبڕن بە بەراورد بە بەرە شەپۆلەكانی ڕووناكی كە لە هەوادان لە هەمان كاتی خایەنراودا. وە لەبەرئەوە درێژی شەپۆلی ڕووناكی لە ناو شووشە $\lambda_{شووشە}$ كورترە لە درێژی شەپۆلە ڕووناكیەكەی لەهەوادا $\lambda_{هەوا}$ وە لەرەلەری ڕووناكی ناگۆڕێت كاتێك شەپۆلی ڕووناكی لە ناوەندێكەوە بچێتە ناوەندێكی تر.




**وێنەی 6-3**
شەپۆلێكی تەخت بە هەوادا تێپەڕ دەبێت (أ) و درێژی شەپۆلەكەی $\lambda_{هەوا}$ ، وە خێرایی تێپەڕبوونی $v_{هەوا}$ هەموو بەرە شەپۆلە گەیشتووەكان بە ڕووی شووشەكە لادەدەن وە خێرایی بەرە شەپۆلەكان لە شووشەدا $v_{شوشە}$ (ب) كەمترە بۆیە درێژی شەپۆل لە شووشەدا كورترە لەبەر ئەوە ئاڕاستەی بەرە شەپۆلەكان دەگۆڕێن.

# جووتە یاسای شكانەوە

یەكێك لە تایبەتمەندیە گرنگەكانی مادەی ڕوون **هاوكۆلكەی شكانەوەیە** index of refraction

یاسای یەكەم هاوكۆلكەی شكانەوەی مادەیەكی دیاریكراو بریتیە لە ڕێژەی نێوان خێرایی ڕووناكی لە بۆشاییدا بۆ خێرایی ڕووناكی لە مادەكەدا.

**هاوكۆلكەی شكانەوە**

$$n = \frac{c}{v}$$

هاوكۆلكەی شكانەوەی ناوەندێك = خێرایی ڕووناكی لە بۆشاییدا / خێرایی ڕووناكی لە ناوەندەكەدا (مادە)

دەبینین، لەو پێناسەی سەرەوەدا هاوكۆلكەی شكانەوە ژمارەیەكی بێ یەكەیە. وە هەمیشە گەورەترە لەیەك چونكە خێرایی ڕووناكی لە هەر ناوەندێكدا كەمترە لە خێرایی ڕووناكی لە بۆشاییدا. لە **خشتەی 1-6** هاوكۆلكەی شكانەوەی چەند مادەیەكی جیاواز ڕوونكراوەتەوە، تێبینی بكە كە هەر چەندە هاوكۆلكەی شكانەوەی مادەیەك گەورەتربێت ئەوا خێرایی ڕووناكی لەو مادەیەدا كەمترە، وە لادانەكەی زیاتر دەبێت كاتێ كە ڕووناكی لە بۆشاییەوە بچێتە ناو مادەكەوە.

یاسای دووەم: كاتێك ڕووناكی لە هەواوە دەچێتە ئاوەوە كە (خێراییەكەی لە هەوادا زۆرە وە هاوكۆڵكەی شكانەوەكەی كەمە) بەڵام لە ئاودا (خێرایەكەی كەمە وە هاوكۆلكەی شكانەوەی زۆرە)، تیشكەكە لادەدات و نزیكدەبێتەوە لە ئەستونی كێشراو لەسەر ڕووەكە وە بە پێچەوانەوە كاتێك ڕووناكی لە ئاوەوە بچێتە هەوا تیشكە ڕوناكیەكە لادەدات و دوور دەكەوێتەوە لە ئەستونە كێشراوەكەوە. تێبینی كە هاوكۆلكەی شكانەوەی هەوا زۆرنزیكە لە هاوكۆلكەی شكانەوەی بۆشایی بۆ ئاسانكاری $n_{هەوا}$ = 1.00 لە شیكاركردنی پرسیارەكاندا.

**خشتە 1-6 هاوكۆڵكەی شكانەوەی چەند ماددەیەك**

| مادە ڕەقەكان لە 20°C | n | مادە شلەكان لە 20°C | n |
|---|---|---|---|
| شەش پالوی ئۆكسیدی زركۆنیۆم | 2.20 | بەنزین | 1.501 |
| ئەلماس | 2.419 | دوانە سلفایدی كاربۆن | 1.628 |
| فلورایت | 1.434 | تێترا كلۆرایدی كاربۆن | 1.461 |
| كوارتزی شلبووە | 1.458 | كحولی ئەثیلی | 1.361 |
| شووشەی پەنجەرە (ئاسایی) | 1.52 | گلیسرین | 1.473 |
| شووشەی سینی (چینی.) | 1.66 | ئاو | 1.333 |
| سەهۆڵ (لە 0°C ) | 1.309 | **گاز لە 0°C وە لە پەستانی هەوای ئاسایدا** | **n** |
| پۆلیسترین | 1.49 | هەوا | 1.000 293 |
| كلۆریدی سۆدیۆم | 1.544 | دوانە ئۆكسیدی كاربون | 1.000 450 |
| زركۆن | 1.923 | | |

هاوكۆلكەكان پێوراون بە ڕووناكیەك كە درێژی شەپۆلەكەی لە بۆشاییدا( 589 nm ).

**هاوكۆلكەی شكانەوە ناوەند (n)**

بریتیە لە ڕێژەی نێوان خێرایی ڕووناكی لە بۆشاییدا بۆ خێرایەكەی لە ناوەندێكی ڕووندا.

## ئایا دەزانیت؟

هاوكۆلكەی شكانەوەی ناوەندێك دەردەبرێت بە ڕێژەی نێوان درێژی شەپۆلی ڕووناكی لە بۆشاییدا $\lambda_o$ بۆ درێژی شەپۆلی ڕووناكی $\lambda_n$ بۆ ناوەندی ناوبراو بە پێی ئەم هاوكێشەیە.

$$n = \frac{\lambda_o}{\lambda_n}$$




**وێنەی 4-6**
(أ) پشیلە وەستاوەکەی سەر ڕاگرەکە ماسیەکە نزیکتر دەبینێت لە ڕووی ئاوەکەوە بە گوێرەی شوێنە ڕاستەقینەکەی (ب) وە ماسیەکە پشیلەکە دوورتر دەبینێت لە ڕووی ئاوەکەوە بە گوێرەی شوێنە ڕاستەقینەکەی.

**دەرکەوتنی تەنەکان لە شوێنە جیاوازەکاندا لە ئەنجامی شکانەوەوە:**

کاتێك پشیلەیەکی وەستاو لەسەر ڕاگرێك سەیری ماسیەك دەکات لەناو ئاودا ئەوا وا دەردەکەوێت کە ماسییەکە لە دووریەکی نزیکترەوەیە لە ڕووی ئاوەکەوە بە گوێرەی شوێنە ڕاستەقینەکەی وەك لە **وێنەی 4-6** أ دا دیارە وە بەپێچەوانەوە ماسیەکە پشیلەکە لە شوێنێکی دوورتر لە ڕووی ئاوەکەوە دەبینێت بە گوێرەی شوێنە ڕاستەقینەکەی. وەك لە **وێنەی 4-6 ب** دا دیارە. لە ئەنجامی پێچەوانەبوونەوەی شکانەوەوە هەریەك لە پشیلە و ماسیەکە لەسەر هەمان ڕێڕەوی ڕووناکی دەبینرێت وەك لە وێنەکانی پێشەوە بینران، بەڵام ئەو تیشکە ڕووناکیەی کە دەگاتە ماسییەکە نزیکترە لە ستوونی کێشراو لە چاو ئەو تیشکەی کە لە پشیلەکەوە دەردەچێت بۆ سەر ڕووی ئاوەکە وە هۆکەشی ئەوەیە ڕووناکی لائەدات بە نزیکبوونەوەی لە ستوونەکەوە کاتی گواستنەوەی لە ناوەندێکەوە کە هاوکۆلکەی شکانەوەی کەمترە (هەوا) بۆ ناوەندێکی تر کە هاوکۆلکەی شکانەوەی گەورەترە (ئاو) درێژ کراوەی ئەو تیشکانەی دەگاتە ماسیەکە بە هێڵی ڕاست ئەوە دەگەیەنێ کە وێنەی پشیلەکە بە ڕووکەش وادەردەکەوێت کە دوورترە لە شوێنە ڕاستەقینەکەی.

لە لایەکی ترەوە ئەو تیشکەی کە لە ڕووی ئاوەکەوە دەگاتە پشیلەکە گۆشەیەکی گەورەتر لەگەڵ ستوونی کێشراو دروستدەکات چونکە ڕووناکی هاتوو لە ماسیەکەوە لە ناوەندێکەوە دەچێتەوە ناوەندێکی تر کە هاوکۆلکەی شکانەوەی کەمترە. تێبینی ئەوە بکە کە وێنەی ماسیەکە لە ڕووی ئاوەکەوە نزیکتر بەدەردەکەوێت وەك لە شوێنە ڕاستەقینەکەی. لەبەر ئەوە تەنی نوقوم بوو لە ئاودا کە لە هەواوە سەیری دەکرێت قەبارەکەی گەورەتر دەردەکەوێت وەك لە قەبارە ڕاستەقینەکەی، چونکە ئەو وێنەیەی کە هەمان قەبارەی هەیەنزیکتر دەردەکەوێت لە چاودێرەکەوە.



## فیزیا و ژیان



**راوکردنی ماسی** چۆن باڵندەی ماسی گرە خۆی نوقوم دەکات بۆ گرتنی ماسیەك؟

### کاریگەری درێژی شەپۆل لەسەر هاوکۆلکەی شکانەوە

تێبینی بکە، کە ئەو هاوکۆلکەی شکانەوانەی کە لە **خشتەی 6-1** دا هاتووە راستە تەنها بۆ ئەو ڕووناکیەی کە درێژی شەپولەکەی لە بۆشاییدا 589 nm هۆیەکەشی ئەوەیە کە بڕی لادانی ڕووناکی کاتی تێپەڕبوونی بە ناوەندێکی دیاریکراودا بەندە لەسەر درێژی شەپۆلەکەیی و خێراییەکەی بۆیە کاتێك ڕووناکی سپی بە ئاوێزەیەکدا تێپەر دەبێت شەبەنگ دروست دەکات. لەبەر ئەوەی هەر ڕەنگێك درێژی شەپۆلی جیاوازە لەوانی تریان ئەوا هەر ڕەنگێك بە بڕێکی جیاواز لا دەدات.

### دیاریکردنی گۆشەی شکانەوە بە هۆی (یاسای سنێڵ) ەوە:

هاوکوڵکەی شکانەوەی مادەیەك بەکاردێت بۆ دیاریکردنی بڕی شکانەوەی ڕووناکی کاتێك لە ناوەندێکەوە دەچێتە ناوەندێکی تر وەك لە پێشەوە باس کرا، هەتا هاوکۆڵکەی شکانەوە گەورەبێت، ئەوا بڕی لادانەکەش زیاد دەکات. بەڵام چۆن گۆشەی شکانەوە دیاری دەکرێت؟

لەساڵی 1621 ویلبرۆرد سنێل تاقیکردنەوەی ئەنجامدا لەبارەی تێپەڕبوونی ڕووناکی، بە ناوەندە جیاوازەکاندا، پەیوەندیەکی پەرەپێدا کەناونرا یاسای سنێڵ دەتوانرێت بەکاربهێنرێت بۆ دۆزینەوەی گۆشەی شکانەوەی روناکی تێپەڕبووی نێوان دووناوەند.

**یاسای سنێڵ**

$$n_i \sin \theta_i = n_r \sin \theta_r$$

هاوکۆلکەی شکانەوەی ناوەندی یەکەم × ساینی گۆشەی لێدان

= هاوکۆلکەی شکانەوەی ناوەندی دووەم × ساینی گۆشەی شکانەوە

## نموونە 6 (أ)

### یاسای سنێڵ

**پرسیار**

**تیشکێکی ڕووناکی درێژی شەپۆلی 589 nm کە لە گڵۆپێکی سۆدیۆم دەردەچێت، لەهەواوە بۆ پارچە شووشەیەکی ئاسایی دەڕوات بە گۆشەی لێدانی $30.0^o$ لەگەڵ ستونەکەدا ئایا گۆشەی شکانەوەی شووشەکە چەندە؟**

**شیکار**

**1. دەزانم**

دراو: $n_r = 1.52 \qquad n_i = 1.00 \qquad \theta_i = 30.0^o$

نەزانراو: $\theta_r = ?$

**2. پلان دادەنێم**

هاوکێشەی یاسای سنێڵ بەکاردەهێنم $n_i \sin \theta_i = n_r \sin \theta_r$

**3. هەژماردەکەم**

بە ڕێکخستنی هاوکێشەکە نەزانراوەکە لە لایەك دا ئەنێم، پاشان نرخەکان لە هاوکێشەکە دادەنێم

$$n_i \sin \theta_i = n_r \sin \theta_r$$

$$\theta_r = \sin^{-1}\left[\frac{n_i}{n_r}(\sin \theta_i)\right] = \sin^{-1}\left[\frac{1.00}{1.52}(\sin 30.0^o)\right]$$

$$\boxed{\theta_r = 19.2^o}$$

## ڕاهێنانی 6 (أ)

### یاسای سنێڵ

**.1** گۆشەی شکانەوەی تیشکێکی ڕووناکی چەندە؟ کاتێك لەهەواوە تێپەڕ دەبێت بۆ دەفرێکی ئاو بە گۆشەی $25.0^o$ لەگەڵ ستونەکەدا؟
(تێبینی: خشتەی 1-6 بەکاربهێنە).

**.2** لە خشتەی خوارەوەدا نرخە نەزانروەکان بدۆزەرەوە بۆ تیشکێکی لێدەر کە لە بۆشاییدا درێژە شەپۆلەکەی 589 nm.
(تێبینی: خشتەی 1-6 بەکاربهێنە).

| | لە ناوەندێك | بۆ ناوەندێك | $\theta_i$ | $\theta_r$ |
|---|---|---|---|---|
| أ. | شووشەی سینی | شووشەی ئاسایی | $25.0^o$ | ? |
| ب. | هەوا | ? | $14.5^o$ | $9.80^o$ |
| ج. | هەوا | ئەڵماس | $31.6^o$ | ? |

**.3** تیشکێکی ڕووناکی درێژی شەپۆلەکەی لە بۆشاییدا 550 nm لە هەواوە تێپەڕ دەبێت بە پارچەیەکی ڕوونی مادەیەکی دیاریکراودا، هەردوو گۆشەی لێدان و شکانەوە لەگەڵ ستونەکەدا $40.0^o$ و $26.0^o$ یەك لەدواییەك . ئایا هاوکۆلکەی شکانەوەی پارچە ڕوونەکە چەندە؟ (وادابنێ هاوکۆلکەی شکانەوەی هەوا بۆ تیشکێك کە درێژی شەپۆڵەکەی 550 nm دەکاتە 1.00 ).

## پێداچوونەوەی بەندی 1-6

**.1** ڕووناکی خۆر دەکەوێتە سەر دڵۆپە ئاوێك بە گۆشەی $22.5^o$ لەگەڵ ستوونەکە لە خاڵێکی دیاریکراوی دڵۆپەکەدا. ئایا گۆشەی شکانەوە چەندە؟

**.2** ئایا لادانی تیشکی ڕووناکی نزیکبوونەوە دەبێت یان دوورکەوتنەوە لە ستوونە کێشراوەکە لە هەریەك لەم بارانەی خوارەوەدا؟
أ. $\theta_i = 20^o$ کاتێك کە $n_i > n_r$
ب. $\theta_i = 20^o$ کاتێك کە $n_i < n_r$
ج. لە هەواوە بۆ ناو شووشە بە گۆشەی لێدانی $30^o$ .
د. لە شووشەوە بۆ هەوا بە گۆشەی لێدانی $30^o$ .

**.3** گۆشەی شکانەوەی تیشکی ڕووناکیتێپەڕبوو لە هەواوە بۆ ناو ئەڵماس چەندە کە گۆشەی لێدانی $15.0^o$ بێت لەگەڵ ستوونەکەدا. (تێبینی: خشتەی 1-6 بەکاربهێنە).

**.4** **بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە:** لەکام باردا لەمانەی خوارەوە تیشکی دەرچوو لە سەرچاوەیەکی لەیزەر دەشکێتەوە؟ لەکاتی
أ. تێپەڕبوونی لە هەواوە بۆ ئەڵماس کە گۆشەکەی لێدان $30^o$ بێت لەگەڵ ستونەکەدا.
ب. تێپەڕبوونی لە ئاوەوە بۆ هەوا بە ئاڕاستەیەکی ستون.
ج. کەوتنە سەر ڕویەکی کانزایی.
د. تێپەڕبوونی لەهەواوە بۆ کوپێك چای ساردکراوە بە گۆشەی لێدانی $25^o$ لەگەڵ ستونەکەدا

## بەندی 2-6

# هاوێنە تەنکەکان
*Thin Lenses*

## جۆرەکانی هاوێنە

کاتێك تیشکێکی ڕووناکی بڵاوبووە لەهەواوە دەچێتە ناو پارچە شووشەیەك لادەدات بەنزیك بوونەوەی لە ستونەکە. وەکاتی دەردەچێ لە شووشەوە بۆ هەوا دووبارە جارێکی تر لادەدات بەدوور کەوتنەوەی لە ستونەکە. وە لە بەرئەوەی هەمان بڕی لادانە. بەبێ لەبەر چاوگرتنی چوونە ژوورەوەی تیشکەکە یان هاتنە دەرەوەی لە ناوەندەکە، لەبەر ئەوە لادانی ڕووناکییەکە کاتی چوونە ناو پارچە شوشەکەوە یەکسانە بە لادانەکەی کاتی دەرچوونی لە شووشەکەوە.

### گۆڕانی ئاڕاستەی ڕووناکی لە ڕووە کورەکانەوە:

کاتێك ڕووی ناوەندێکی دیاریکراو کوورە ئاڕاستەی ستونی کێشراو لەسەر ڕووەکە لە خاڵێك بۆ خاڵێکی تر دەگۆڕێت، بۆیە کە تیشکێکی ڕووناکی دەچێتە ناوەندێك کە ڕوویەکی کوڕ یان زیاتری تێدابێت، بڕی لادانەکەی دەگۆڕێت لە خاڵێکەوە بۆ خاڵێکی تر. ئەو بنچینەیە جێبەجێ دەبێت لەو ناوەندانەدا کە پێیان دەوترێت **هاوێنەکان** lenses هاوێنەکان، وەك ئاوێنەکان، وێنە دروستدەکەن، بەڵام ئەمە بە شکانەوە ڕوودەدات نەك بەدانەوە، وێنە دروستبووەکان لەوانەیە ڕاستەقینە یان خەیاڵی بن بە پێی جۆری هاوێنەکە و شوێنی تەنەکە، ئەوەی شایانی باسە وێنەی ڕاستەقینە پەیدا دەبێت لە ئەنجامی یەکتربڕینی ڕاستەقینەی تیشکە تێپەڕ بووەکان، بەڵام وێنە خەیاڵیەکان پەیدا دەبن لەو خاڵانەی کەوا بەدیاردەکەوێ کە خاڵی دەرچوونی تیشکەکانە نەك خاڵی یەکتربڕینی ڕاستەقینەیان، دەتوانرێت وێنەی ڕاستەقینە لەسەر شاشە ببینرێت، بەڵام وێنەی خەیاڵی لەسەر شاشە نابینرێت.

هاوێنەکان بەکاردێن لە ئاستێکی بەر فراواندا لە ئامێرە بینایەکانی وەك کامیرا مایکرۆسکۆب و تەلسکۆب، یەکێك لە شانە ڕوونەکانی پێشەوەی چاو وەك هاوێنەیەك کاردەکات بۆ کۆکردنەوەی تیشکە کەوتووەکان لەسەر تۆڕەی چاو لە کۆتایی چاودا. هاوێنەی نموونەیی پێکهاتووە لە پارچە شووشەیەك یان پلاستیکێك، دوو ڕووە ڕووناکی شکێنەرەوەکەیان، بە شێوەی گۆیی یان ڕووتەخت دەبڕێن. **وێنەی 5-6** دوو نموونەن لەسەر هاوێنەی شێوە جیاواز. ئەو هاوێنەی کە ناوەڕاستەکەی ئەستوورترە لە لێوارەکانی پێیدەڵێن هاوێنکۆ وەك لە **وێنەی 5-6** (أ) دا دیارە. بەڵام ئەو هاوێنەیەی کە ناوەڕاستی تەنکترە لە لێوارەکانی پێیدەڵێن هاوێنپەرت وەك لە وێنەی **5-6** (ب)دا دیارە .

### 2-6 ئامانجەکان

- وێنە کێشانی تیشکەکان بەکاردێت بۆ دۆزینەوەی وێنەی دروستبوو لە هاوێنکۆ یان هاوێنپەرت و وێنەی ڕاستەقینە و خەیاڵی لێکجیادەکاتەوە.
- شیکارکردنی پرسیارەکان بەبەکارهێنانی هاوکێشەی هاوێنە تەنکەکان.
- گەورەکردن بە هاوێنەکان هەژمێر دەکرێن.
- ڕۆڵی هاوێنەکان لە میکرۆسکۆبی ئاڵۆز و تەلەسکۆبی دانەوە. دیاریدەکات.

**هاوێنە**

تەنێکی ڕونە کە تیشکی ڕووناکی دەشکێنێتەوە کۆیان دەکاتەوە یان پەرتیان دەکات بۆ دروست کردنی وێنە.


( أ )


(ب)

**وێنەی 5-6**
لەکاتی تێپەڕبوونی تیشکێکی ڕووناکی وێنەی (أ) بە هاوێنکۆیەك کەناوەڕاستەکەی ئەستورترە لادەدات بۆ ناوەوە. (ب) بە تێپەڕبوونی تیشکەکە بەهاوێنپەرتدا (کە لێوارەکانی ئەستوورترە) لادەدات بەرەو دەرەوە.

تیشکە ڕووناکیەکان دوای شکانەوەیان لە هاوێنەکەوە، هۆکارن بۆ ناونانی ئەم دوو هاوێنەیە بە هاوێنکۆ یان هاوێنپەرت.

### دروستبوونی وێنەی تەنە زۆر دوورەکان لە تیشکۆدا

وەك لە باری ئاوێنەکاندا، لێرەش ناسینی خاڵێك کەپێیدەڵێن تیشکۆی هاوێنە زۆر بە سوودە. تێبینی ئەو تیشکانە بکە کەلە تەنێکی زۆر دوورەوە دەردەچن نیمچە تەریبن تیشکۆی هاوێنکۆ دەکەوێتە شوێنی وێنەی تەنێکی زۆر دوور لە هاوێنەکەوە. بۆ نموونە وێنەی 6-6 (أ) کۆمەڵە تیشکێکی تەریب بە تەوەرەی بنچینەی لە خاڵی تیشکۆ $F$ کۆدەبێتەوە دوای لادانیان بۆ ناوەوە بە هۆی هاوێنەکەوە. بە پێچەوانەی ئاوێنەکان، هەموو هاوێنەیەك لە هەردوو لایدا تیشکۆیەکی هەیە چونکە ڕووناکی دەتوانێت بەهەردوولایدا تێپەڕبێت، وەك لە وێنەی 6-6 دا ڕوون کراوەتەوە. بە دووری نێوان خاڵی تیشکۆ و هاوێنەکە دەووترێت دوورە تیشکۆ $f$ وە دوورەتیشکۆ دووری وێنەی دروست بوو بۆ تەنەدوورەکان دەگەیەنێت لە هاوێنەکەوە.

تیشکە تەریبەکان بە تەوەرەی بنچینەیی پەرت دەبنەوە دوای تێپەڕبوونیان بە هاوێنپەرتدا وەك لە وێنەی 6-6 (ب) دا دیارە لەم بارەدا تیشکۆ پێناسە دەکرێت بەو خاڵەی کەوا بەدیار دەکەوێت کە چەقی دەرچوونی تیشکە پەرتەکان بێت. وەدوورەتیشکۆ بریتییە لە دووری نێوان تیشکۆو هاوێنەکە.



( أ )



(ب)

**وێنەی 6-6**

هەریەك لە هاوینکۆ (أ) و هاوێنپەرت (ب) دوو تیشکۆ وەیەك دوورە تیشکۆیان هەیە.

### دیاریکردنی شوێنی وێنەی دروستبوو وەدرێژییەکەی لە هاوێنەی تەنکدا بە بەکارهێنانی هێڵکاری تیشکەوە:

وەك لەبەشی پێشەوەدا کۆمەڵێك تیشکی سەرەکیمان بەکارهێنا بۆ وێنەکێشانی تیشکەکان بۆ پێشبینی کردنی سیفەتەکانی وێنەی دروست بوو لە ئاوێنەی گۆییدا، هەمان ڕێگا دەگرینەوە بەر لە باری هاوێنەکاندا.

وەك لە وێنەی 6-5 دا دیارە دەزانین، شکانەوە ڕوودەدات لە ڕووە جیاکەرەوەکەی نێوان دووماددە کە هاوکۆلکەی شکانەوەیان جیاوازە، بەڵام لە باری هاوێنە تەنکەکان دا ( کە ئەستووریان کەمە بەبەراورد لەگەڵ کوری وە دووری تەنەکان لێوەی) دەتوانین هەردوولای هاوێنەکە بە هێڵێکی ڕاست بنوێنین کە بە چەقەکەیدا تێپەڕ ببێت وە لە هێڵکاری تیشك لە هاوێنە تەنکەکان دا هێڵێکی ڕاست بەکاردەهێنین لەگەڵ دوو تیراسا لە هەردوو لای هێڵەکەوە، بۆ نواندی هاوێنکۆ وەك لە وێنەی 6-6 (أ) دا دیارە بەڵام هاوێنپەرت بە هێڵێکی ڕاست و دوو تیراسای هەڵگەڕاوە لە هەردوولای هێڵەکە دەنوێنرێت وەك وێنەی 6-6 (ب) بەم شێوەیە دەتوانین هێڵکاری تیشك جێبەجێبکەین بە پێی ئەو بنەمایانەی کە لە خشتەی 6-2 دا هاتووە.

**خشتە 2-6 بنەماکانی هێڵکاری تیشکە سەرەکییەکان**

| تیشك | لە تەنەوە بۆ هاوێنە | لە هاوێنکۆوە بۆ وێنە | لە هاوێنپەرتەوە بۆ وێنە |
|---|---|---|---|
| تیشکی تەریب | تەریب بە تەوەرەی بنچینەیە | بە تیشکۆدا $F$ تێپەڕ دەبێت | لادەدات وەك لە« $F$ »وە هاتبێت. |
| چەقەتیشك | بەچەقی هاوێنەکەدا تێپەڕدەبێت . | هەربەچەقی هاوێنەکە دا تێپەڕ دەبێت | هەر بە چەقی هاوێنەکەدا تێپەڕ دەبێت. |
| تیشکی تیشکۆی | بە تیشکۆی هاوێنکۆدا تێپەڕدەبێت یان درێژکراوەکەی بە تیشکۆی هاوێنپەرتدا تێپەڕدەبێت لە ڕووەکەی تردا. | تەریبە بە تەوەرەی بنچینەی | تەریبە بە تەرەوەی بنچینەی. |

ئەوەی پشتگیری ڕاستی ئەم ڕێسایانە دەکات ئەو چەمکانەیە کە لەم کتێبەدا پشتی پێ بەستراوە لە پێناسەی خاڵی تیشکۆوە، دەزانین تیشکی کەوتوو لەسەر هاوێنەکە بە شێوەیەکی تەریب بە تەوەرەی بنچینەیی (تیشکی تەریب)، لە چەقی تیشکۆدا کۆ دەبێتەوە. لە ڕاستیدا ئەوەی پەیوەستە بە هاوینکۆ مانای کۆبوونەوەی تیشکە شکاوەکانە لە خاڵی تیشکۆوە لە پشت هاوێنەکەدا، لەم کتێبەدا مەبەست لە ناوچەی (بەردەم هاوێنە) ئەو ناوچەیەیە کە تیشکە سەرەتایەکانی دەکەوێتە سەر، بەڵام (پشت هاوێنە) بە ناوچەکەی بەرامبەری دادەنرێت کە تیشکە شکاوەکانی تێدایە. بەڵام تیشکی کەوتووی سەر هاوێنپەرت کە تەریب بێت بە تەوەرەی بنچینەیی دەشکێتەوەو وادەردەکەوێت کە لە خاڵی تیشکۆی بەردەم هاوێنەکەوە هاتووە. بەهۆی پێچەوانەیەتی دیاردەی شکانەوە، تیشکی کەوتو لەسەر هاوێنکۆ کە بەیەکێك لە تیشکۆکانیدا تێپەڕ بووبێت دەشکێتەوە وە تەریب دەبێت بەتەوەرەی بنچینەیی.

بەڵام ئەو تیشکانەی دەکەوێتە سەر هەریەك لە هاوێنەکان کە بە چەقەکەیاندا تێپەربووبێ ئەوا بەهەمان هێڵی راست تێپەر دەبێ بێ شکانەوە . ئەمە ڕوودەدات چونکە هەردوولای هاوێنە هاوڕێکن بە گوێرەی هەر هێڵێك کە بە چەقەکەیان دا تێپەر ببێت وە بە هەمان شێوە جێبەجێدەبێت لەسەر لەوحی شووشە کاتێك کە ئەو تیشکەی دەکەوێتە سەر لەوحێکی شووشە تەریب دەبێت بەو تیشکەی لێوەی دەردەچێت ئەستووری هاوێنە فەرامۆش دەکرێت لە هێڵکاری تیشکەکاندا، بە جۆرێك کە تیشکی تێپەر بوو بە چەقەکەیاندا بە هێڵی ڕاست تێپەر دەبێت بە بێ لادان.

## تایبەتمەندییەکانی هاوێنە

### دروستبوونی وێنەی ڕاستەقینە یان خەیاڵی بۆ تەنێکی ڕاستەقینە بە هۆی هاوێنکۆوە:

هاوێنکۆ وێنەیەك دروستدەکات لە ئاستی تیشکۆ (لە تیشکۆدا) بۆ ئەو تەنەی کە دوریەکی بێ کۆتای هەیە لە هاوێنەکەوە، وەك ڕوونکراوەتەوە لە وێنەی یەکەمی **خشتەی 6-3 دا**، وێنەی ڕاستەقینەی دروست بوو لە سەر شاشە دەبینرێ. لەگەڵ نزیك بوونەوەی تەنە دوورەکە لە تیشکۆوە، وێنەکە گەورەتر دەبێت و دور دەکەوێتەوە لە دیووەکەی تری هاوێنەکەوە وەك لە وێنەی دووەم و سێیەم و چوارەم دا ڕوون کراوەتەوە لە **خشتەی 6-3 دا**. وەکاتێك تەنەکە لە تیشکۆدا دادەنرێت، وەك لە وێنەی پێنجەم دا دیارە، ئەو تیشکانەی کە لەتەنەکەوە دەردەچن دەشکێنەوە بە شێوەیەکی تەریبی لە هاوێنەکە دەردەچن. لەبەر ئەوەی تەنەکە لە تیشکۆدایە، کێشانی تیشکی سێیەم کە بەخاڵی تیشکۆ و هاوێنەکە و بەرزترین خاڵی تەنەکەدا تێپەر ببێت ئەستەمە. وەکاتێك تەنێك لە نێوان هاوێنەو تیشکۆدایە، تیشکە شکاوەکان لە هاوێنەکەوە لێك دووردەکەونەوە وە پەرت دەبنەوە وەك لە وێنەی شەشەم دا دیارە لە **خشتەی 6-3**. بۆ چاودێرێك کە لە پشت هاوێنەکەدا بێت، وادەردەکەوێت کە تەنەکەو وێنەکە دەکەونە هەمان دیوی هاوێنەکەوە. وەمێشك وای لێکدەداتەوە کە ئەو تیشکە پەرتانە، وەك لە تەنێکەوە هاتبن کە دەکەونە پێش تیشکەکان کە ڕاستەوخۆ دەگەنە چاو. لەم بارەدا هێڵکاری تیشکەکان ئاسان نییە وەك بارەکانی پێشووتر کە لە خشتەکەدایە، دووتیشك وێنە دەکێشین یەکەمیان تەریب بە تەوەرەی بنچینەیی وە ئەوەی تریان بە چەقی هاوێنەکەدا تێپەر بێت بەهەمان ڕێگەی پێشوو. بەڵام تیشکی سێیەم وێنە دەکێشین وەك لە تیشکۆ دەرچووبێت، بە جۆرێك تیشکۆو سەری تەن و هاوێنەکە بکەونە سەریەك هێڵ، وە بۆ دیاریکردنی شوێنی وێنەکە هێڵەکانی تیشکە دەرچووەکان بۆ پشتەوەی تەواودەکەین بە ئاراستەی خاڵی یەکتر برین کەوا بە دیاردەکەوێ کە خاڵی دەرچوونی تیشکەکانە. ئەم هێڵانە بریتین لە هێڵی پچر پچر وەك لە وێنەی شەشەم دا لە **خشتەی 6-3** دا هاتووە.

**خشتەی 6-3** پەیوەندییە شیاوەکە لە نێوان شوێنی تەن و وێنەدا بە گوێرەی هاوێنکۆکەوە، کە بنەماکانی وێنەکێشان بۆ تیشکە سەرەکیەکان تیایدا بەکارهاتوە بۆ هەربارێك. تێبینی جێ بەجێ کردنە زانستیەکان بکە بۆ هەر بارێك کە لە وێنەی هێڵکاری تایبەت بە تیشکدا هاتووە.

چالاکییەکی کرداری
خێرا

**دووره تیشکۆ**
**کەرەستەکان**

- ✓ هاوێنەی (هاوینکۆ)ی گەورەکەر.
- ✓ راستەیەك.



**ڕێنمایی سەلامەتی**

ئاگاداربە تیشکی خۆر کۆنەکەیتەوە لەسەر ئەو ڕووانەی توانای گڕگرتنیان هەیە یان لەسەر دەست و باسکەکان.
سەیری تیشکی خۆرمەکە لە هاوێنکۆوە ئەمە کاریگەری ترسناکی دەبێت.

لە ڕۆژێکی خۆرەتاوا تیشکی خۆر خرایە سەر ڕوویەك کە توانای گڕگرتنی نەبێت، وەك ڕووی زەوی، کاتێك هاوێنکۆی گەورەکردنی ڕووناکی. بەدەست بگریت ئەوا پەڵەیەکی ڕووناك لەسەر ڕووەکە دەردەکەوێت هاوێنەکە بەرزو نزم بکەرەوە تاوەکو پەڵە ڕووناکەکە قەبارەی بچوکتر و توندیەکی زۆری دەبێت ڕاستەیەك بەکاربهێنە بۆ پێوانی دووری نێوان هاوێنەکە و ڕووی زەوی ئەمەش بەنزیکەی دەبێتە دوره تیشکۆی هاوێنەکە.

## هێڵکاری تیشك

**.1**




**دۆخی ( 1 )** : تەن لە ناکۆتادایە، وێنە لە $F$ دایە.

**جێبەجێکردن** : سوتان و کون کردن بە هۆی هاوێنکۆوە.

**.2**




**دۆخی ( 2 )** : تەن لەدوای $2f$ وەیە، وێنەی ڕاستەقینەی بچوك کراوەی هەڵگراوە و دەکەوێتە نێوان $F$، $2f$

**جێبەجێکردن**: هاوێنەی کامیرا، هاوێنەی بیلبیلەی چاو هاوێنتەنی تەلسکۆبی ڕووناکی شکێنەرەوە.

**.3**




**دۆخی( 3 )**: تەن لە $2F$ دایە: وێنەیەکی ڕاستەقینەی هەڵگەراوەیە بەهەمان گەورەی تەنەکە. وە دەکەوێتە هەمان شوێنی تەنەکە.

**جێبەجێکردن**: هاوێنەی تەلسکۆبی گۆڕەپان کە وێنە هەڵدەگەڕێنێتەوە.

**.4**




**دۆخی ( 4 )** : تەن لە نێوان $F$ ، $2F$ وێنەی دروست بوو ڕاستەقینەی هەڵگەڕاوەی گەورەکراوە دەکەوێتە پشت $2F$ .

**جێبەجێکردن**: وێنە جوڵاوەکان یان ئۆڤەرهێد، وەهاوێنتەنی میکرۆسکۆبی ئاڵۆز.

**.5**




**دۆخی ( 5 )** : تەن لە $F$ دایە: وێنە لەبێ کۆتادایە.

**جێبەجێکردن**: هاوێنەی بەکارهاتوو لە ڕووناك کردنەوە و دروستکردنی لایت و پرۆجێکتەر.

**.6**




**دۆخی ( 6 )** : تەن لە نێوان $F$ و هاوێنەکەدایە، وێنەیەکی خەیاڵی گەورەکراوی هەڵنەگەڕاوە کەدەکەوێتە هەمان دیوی تەنەکەوە.

**جێبەجێکردن**: گەورەکردن بە هۆی هاوێنکۆوە، وە هاوێن چاوی میکرۆسکۆب، وە جووت هاوێن چاو، وە تەلسکۆب.

**هاوێنپەرتەکان وێنەی خەیاڵی دروستدەکەن بۆ تەنە ڕاستەقینەکان**

هاوێنپەرت وێنەی خەیاڵی دروستدەکات بۆ هەر تەنێکی ڕاستەقینە کە لە هەر شوێنێکدا بێت بەرامبەر هاوێنەکە.

وێنەکە هەڵنەگەڕاوەی بچووککراوە دەبێت و گەورەکردنی هەمیشە لەیەك کەمتر دەبێ. هەروەها شوێنی وێنەکە لە نێوان هاوێنە و تیشکۆکەدا دەبێ، تەنەکە لە هەر شوێنێکدا دابنرێت .




**وێنەی 6-7**

وێنەی پەیدا بوو لە هاوێنپەرتدا هەمیشە خەیاڵی و بچووککراوە دەبێت.

**وێنەی 6-7** کێشراوە بەهۆی هێڵکاری تیشك بۆ هاوێنپەرت بە بەکارهێنانی ئەو بنەمایانەی کە لە خشتەی **6-2** دا هاتووە. تیشکی یەکەم کە تەریبی تەوەرەی بنچینەیی دەبێ دەشکێتەوە وەك لەو تیشکۆیەوە هاتبێ کە دەکەوێتە هەمان لای هاوێنەکە لەگەڵ تەنەکەداو بەشێکی ئەم تیشکە بە هێڵی بە خاڵ کێشراو دەری دەبرین، تیشکی دووەم بە چەقی هاوێنەکەدا تێپەر دەبێ بێ شکانەوە، تیشکی سێیەم بە جۆرێك بەرەو تیشکۆی پشت هاوێنەکە دەبێت، وە دەشکێتەوە تەریب بە تەوەرەی بنچینەیی، ئەبێ درێژ بکرێتەوە بۆ دواوە، وەکو لە هێڵی بە خاڵ کێشراوی ئاسۆیی ڕوون کراوەتەوە. شوێنی سەری وێنەکە ئەو خاڵەیە کەوا دەردەکەوێت کە تیشکە شکاوەکەی لێوە دەرچووبێ.

## دووهاوکێشەکەی هاوێنە تەنکەکان و گەورەکردن

وێنەکانی تیشك خەملاندنێکی باشمان دەداتی بۆ قەبارەی وێنەکە و شوێنەکەی ئەتوانین پێوانی ئەو بڕانە بکەین بە هاوکێشەیەك کە هەردوو شوێنەکەی تەن و شوێنی وێنەکە بە گوێرەی هاوێنەکە بەیەکەوە دەبەستێت و ئەم هاوکێشەیە بە هاوکێشەی هاوێنە تەنکەکان دا دەنرێت، وەلە بەر ئەوەی وا دانراوە هاوێنەکە زۆر تەنکە بۆیە هاوکێشەکە بەم شێوەیە داڕێژراوە. وە ئەم هاوکێشەیە جێبەجێ دەکرێت کاتێك ئەستوری هاوێنەکە زۆر کەمتر بێت لە دورە تیشکۆکەی

**هاوکێشەی هاوێنە تەنکەکان.**

$$\frac{1}{p}+\frac{1}{q}=\frac{1}{f}$$

$$\frac{1}{\text{دووری تەنەکە لە هاوێنەکەوە}}+\frac{1}{\text{دووری وێنەکە لەهاوێنەکەوە}}=\frac{1}{\text{دووره تیشکۆ}}$$

کاتێك هاوکێشەی هاوێنە تەنکەکان بەکاردەهێنین. زۆر جار بە کێشانی هێڵکاری تیشك ڕوونی دەکەینەوە کە ڕووی هاوێنەکە بە هێڵێکی شاوولی درێژ و باریك دەنوێنرێت. لە بیرت نەچێ کە تیشك لادەدات کاتی گەیشتنی بە ڕووی هاوێنەکە.

### ئایا دەزانیت؟

هاوێنەی کامیرا وێنەیەکی هەڵگەڕاوە دروست دەکات لەسەر (فیلمە). چەسپ کراوەکە لە کۆ تایی کامیرەکەدا دوو ڕێگا هەیە بۆ ئەوەی وێنەی دروستبوو هەڵنەگەڕاوە بێت لەسەر فیلمەکە.
لە هەنگاوی یەکەمدا سیستەمی ئاوێنەکان و ئاوێزەکان وا دەکات هەڵنەگەڕاوەبێت پێش ئەوەی بکەوێتە سەر فلیمەکە.
بەلام لە هەنگاوی دووەمدا هاوێن پەرتێك دا دەنرێت بە جیا لە دەزگای هاوێنە سەرەکییەکان ئەم هاوێنەیە وێنەیەکی خەیاڵی هەڵنەگەڕاوە دەخاتە سەر فیلمەکە.

وە کێشانی ئەو تیشکەی کە ئەو لادانە ڕوون ئەکاتەوە لە ئاستی هێڵی شاوڵی چەقەوە، نموونەیەکی بێ وێنەیە کە بە شێوەیەکی باش جێبەجێ دەکرێت لە هاوێنە تەنکەکاندا. بەڵام نموونەکە و کێشانی تیشکەکە پێویستە راست بکرێتەوە لە باری هاوێنە ئەستوورەکاندا یان لە سیستمی هاوێنەکاندا. وە هەروەها لە باری تەنەکان و وێنە دوورەکان لە تەوەری بنچینەییەوە. وە دەتوانین هاوکێشەی هاوێنەی تەنکەکان جێبەجێ بکەین لەسەر هەریەکە لە هاوێنکۆو هاوێنپەرت بە مەرجی پابەند بوونمان بە ڕێساکانی نیشانە دیاری کراوەکانی **خشتەی 4-6** بە پێی ئەو ڕێسایانە شوێنی ئەو وێنە ڕاستەقینەی کە کەوتۆتە پشت هاوێنەکەوە پۆزەتیڤە وە شوێنی وێنە خەیاڵیەکەی بەردەمی نێگەتیڤە هەروەها دوورە تیشکۆی هاوێنکۆ پۆزەتیڤە وە دوورە تیشکۆی هاوێنپەرت نێگەتیڤە.

## پابەندبوونی گەورەکردنی هاوێنە لەسەر دووری تەن ودووری وێنە

بە بیری خۆتی بهێنەوە کە $(M)$ ڕێژەی نێوان درێژی وێنەیە بۆ درێژی تەنەکە و ئەتوانرێت ئەو هاوکێشەیە بەکاربهێنرێت بۆ هەژماری گەورەکردن لە هاوێنکۆ و هاوێنپەرت دا.

### گەورەکردنی هاوێنە

$$M = \frac{h'}{h} = -\frac{q}{p}$$

گەورەکردن = درێژی وێنە / درێژی تەن = − دووری وێنە لە هاوێنەکەوە / دووری تەن لە هاوێنەکەوە

ئەگەر پابەندبووین بە ڕێساکانی نیشانە دیاریکراوەکان لە **خشتەی** ( **4-6** ) دا ئەوکاتە گەورەکرن درێژی تەنەکە دەدات وە ئایا هەڵگەڕاوەیە یان هەڵنەگەڕاوەیە، ئەگەر بڕی گەورەکردن لە یەك کەمتر بوو ئەوا وێنەکە لە تەنەکە بچووکترە و ئەگەر بڕی گەورە کردن لەیەك گەورەتر بوو، ئەوا وێنەکە لە تەنەکە گەورەتر دەبێ.

وەنیشانەی نێگەتیڤی گەورەکردن ئەوە دەگەیەنێ کە وێنەکە ڕاستەقینە و هەڵگەراوەیە، و نیشانەی پۆزەتیڤی گەورە کردن ئەوە دەگەینێ کە وێنەکە خەیاڵییە و هەڵگەڕاوە نی یە.

**خشتە 4-6** ڕێسای نیشانەکانی هاوێنەکان

| | + | − |
|---|---|---|
| $p$ | تەنی ڕاستەقینە بەرامبەر هاوێنەکەیە | تەنی خەیاڵی پشت هاوێنەکەیە |
| $q$ | وێنەکە ڕاستەقینەیەو پشت هاوێنەکەیە | وێنەکە خەیاڵیەو پێش هاوێنەکەیە |
| $f$ | هاوێنکۆ | هاوێنپەرت |

## هاوێنەکان

### پرسیارەکە

تەنێك لەدوری **30.0 cm** دانرا بەرامبەر هاوێنکۆیەك پاشان لە دووری **12.5 cm** دانرا بەرامبەر هاوێنپەرتێك دوورە تیشکۆی هەریەك لە هاوێنەکان **10.0 cm** بوو. دووری وێنە و گەورەکردن بدۆزەرەوە لە هەربارێکدا وەسیفەتەکانی چین لە هەردوو بارەکەدا؟

### شیکار

**1. دەزانم**

دراو:

$f_{\text{کۆکەرەوە}} = 10.0\ \text{cm}$ $\quad f_{\text{پەرت کەرەوە}} = -10.0\ \text{cm}$

$p_{\text{کۆکەرەوە}} = 30.0\ \text{cm}$ $\quad p_{\text{پەرت کەرەوە}} = 12.5\ \text{cm}$

نەزانراو:

$q_{\text{کۆکەرەوە}} = ?$ $\quad M = ?$ $\quad q_{\text{پەرت کەرەوە}} = ?$ $\quad M = ?$.

هێڵکاری تیشکەکان:




**2. پلان دادەنێم**

ئەتوانرێت هاوکێشەی هاوێنە تەنکەکان بەکار بهێنرێت بۆ دیارکردنی شوێنی وێنەکە، و هاوکێشەی گەورەکردن بۆ دەست کەوتنی درێژی وێنەکە و ئایا هەڵگەڕاوەیە یان هەڵنەگەڕاوەیە.

$$\frac{1}{p} + \frac{1}{q} = \frac{1}{f} \qquad M = -\frac{q}{p}$$

دووبارە هاوکێشەکە ڕێکدەخەم بۆ جیاکردنەوەی نەزانراوەکە.

$$\frac{1}{q} = \frac{1}{f} - \frac{1}{p}$$

**3. هەژماردەکەم**

بۆ هاوێنە تەنکەکان (هاوێنکۆ)

$$\frac{1}{q} = \frac{1}{f} - \frac{1}{p} = \frac{1}{10.0\ \text{cm}} - \frac{1}{30.0\ \text{cm}}$$

$$\boxed{q = 15.0\ \text{cm}}$$

$$M = -\frac{q}{p} = -\frac{15.0\ \text{cm}}{30.0\ \text{cm}}$$

$$\boxed{M = -0.500}$$

**بۆ هاوێنپەرت**

$$\frac{1}{q}=\frac{1}{f}-\frac{1}{p}=\frac{1}{-10.0\text{ cm}}-\frac{1}{12.5\text{ cm}}=\frac{-22.5}{125\text{ cm}}$$

$$\boxed{q=-5.56\text{ cm}}$$

$$M=-\frac{q}{p}=\frac{-5.56\text{ cm}}{12.5\text{ cm}}$$

$$\boxed{M=0.445}$$

**4. هەڵدەسەنگێنم**

ئەم نرخ و هێمایانە ئەو دەگەیەنن لە باری هاوینکۆکەدا وێنەکە ڕاستەقینەیە و هەڵگەڕاوەیە و بچووکترە لە تەنەکە، ئەمەش پێشبینی کراوە لە بەر ئەوەی دووری تەنەکە لە هاوێنەکەوە زیاترە لە دوو هێندەی دوورە تیشکۆی هاوێنکۆکە. وە لە دۆخی هاوێنپەرتدا نرخ و هێماکان ئەوە دەگەیەنن کە وێنەکە خەیاڵیە و هەڵنەگەڕاوەیە، وە دەکەوێتە نێوان هاوێنەکەو تیشکۆ، وە بچووکترە لەتەنەکە. ئەم جۆرە وێنانە تەنیا لە هاوێنپەرتدا دروست دەبن.

## ڕاهێنانی 6 (ب)

### هاوێنەکان

**1.** تەنێك لە دووری 20.0 cm بەرامبەر هاوێنکۆیەك دانرا، کە دورە تیشکۆکەی 10.0 cm بوو ئایا دوری وێنەکە چەندە لەهاوێنەکەوە؟ گەورەکردنی چەندە؟ وەئایا وێنەکە ڕاستەقینەیە یان خەیاڵییە؟

**2.** یەکێك لە لێکۆڵەرەوەکان بۆ دڵنیابوون لە بەڵگەیەك هاوێنەیەکی گەورەکەرەوەی بەکار هێنا ئەم هاوێنەیەی لە دووری 10.0 cm لە بەڵگەکەوە بەدەستەوە گرتبوو، دوورە تیشکۆی هاوێنەکە 15.0 cm بوو دووری وێنەکەو گەورەکردنی بدۆزەرەوە، سیفەتەکانی وێنەکە چین؟

**3.** تەنێك لە دووری 20.0 cm لە بەرامبەر هاوێنپەرتێکەوە دانرا کە دوورە تیشکۆکەی 10.0 cm بوو دووری وێنەکە و گەورەکردنی بدۆزەرەوە. سیفەتەکانی وێنەکە چی یە؟

**4.** نرخە نە نووسراوەکان لەم خشتەیەدا بنووسە؟ (تەواوبکە)

| | $f$ | $p$ | $q$ | $M$ |
|---|---|---|---|---|
| | **هاوێنکۆ** | | | |
| أ. | 6.0 cm | ? | – 3.0 cm | ? |
| ب. | 2.9 cm | ? | 7.0 cm | ? |
| | **هاوێنپەرت** | | | |
| ج. | – 6.0 cm | 4.0 cm | ? | ? |
| د. | ? | 5.0 cm | ? | 0.50 |

# چاویلکە و هاوێنە لکێنراوەکان

## Eyeglasses and Contact Lenses

بەشە روونەکەی پێشەوەی چاو کە پێیدەوترێت (گلێنە)وەك هاوێنەیەك کاردەکات کە تیشکەکان کۆ دەکاتەوە بە ئاراستەی ناوچەیەکی هەستیار بۆ ڕووناکی کە لە پشتی چاودایە و پێی دەوترێت (تۆڕە)، هەرچەندە زۆربەی شکانەوەی رووناکی لە (گلێنە)دا ڕوودەدات. چاویش هاوێنەیەکی بچووکی تێدایە کە پێیدەوترێت (هاوێنرِوون) کە هاوبەشی دەکات لە شکانەوەی رووناکیدا.

کاتێك چاو هەوڵ ئەدات بۆ بینینی وێنەی تەنێکی نزیك، لەوانەیە وێنەیەك لە پشت (تورە) وە دروستبێ. ئەم کەموکورِیە (نەنگیە) لە بینیندا پێیدەوترێت (دووربینی). ئەوەی تووشی ئەم نەنگیە بووە تەنە دوورەکان بەباشی و روونی دەبینێ، بەڵام تەنە نزیکەکان بە باشی و روونی نابینێت (لێڵ دیارە) هۆی نەنگیەکە یان ناتەواوەیەکی گەورەیە لە چاودا وەیان ماسولکەکانی برژۆڵەکان ناتوانن بەپێی پێویست دەست بەسەر شێوەی هاوێنەکەدا بگرن.

بۆ بینینی وێنە بە شێوەیەکی ڕوون، وێنەی **6-5** چۆنیەتی چارەسەرکردنی دووربینی نیشان ئەدات بەبەکارهێنانی هاوێنکۆیەك. نەنگیەکی تری چاو هەیە کەپێیدەوترێت «نزیکبینی» وەکاتێك ئەوە ڕووئەدات کە هاوێنەکەی چاو درێژتر دەبێ لە پێویست، یان کاتێك گەورەترین دوورە تیشکۆی چاو بەشی دروستکردنی وێنەیەکی روون ناکات لەسەر تۆڕەکەی، وەجیاوازی ئەم بارە ئەوەیە کە تەنە دوورەکان بە ڕوون و ئاشکرا نابینرێن، وە دەتوانرێت ئەم نەنگیە ڕاست بکرێتەوە بەبەکارهێنانی هاوێنپەرتێك وەك لە خشتەی ( **6-5**) دیارە.

هاوێنەی لکێنراو هاوێنەیەکە کە ڕاستەوخۆ دەخرێتە سەر کۆرنیەی چاو کە لەسەر چینێکی تەنکی فرمێسك سەرکەوتە دەبێت واتە (فرمێسك دەکەوێتە نێوان کۆرنیەو هاوێنەکە).

**خشتە 5-6 دوور بینی ونزیکبینی**

**دوور بینی**



دوور بینی | چارەسەرکردنی دووربینی بەبەکارهێنانی هاوێنکۆ

**نزیکبینی**



نزیکبینی | چارەسەرکردنی نزیکبینی بەبەکارهێنانی هاوێنپەرت

---

**چالاکییەکی کرداری خێرا**

**چاویلکە پزیشکییەکان**

**کەرەستەکان**

✓ چەند چاویلکەیەکی پزیشکی

یەکێك لە چاویلکە پزیشکیەکان لە دووری جیا جیا لە چاوتەوە دابنێ.
بە هۆیەوە سەیری چەند تەنێکی جیاواز بکە وە ئەمەش دووبارە بکەوە بۆ چاویلکەکانی تر. وەك ئەو چاویلکانەی کە بەکاردێت بۆ ڕاست کردنەوەی نزیکبینی و دوربینی وە کاریگەری ئەوەش ڕوون بکەرەوە لە و وێنانەی کە دەیبینی.
ئەگەر چاویلکەی جووت هاوێنەت بەکارهێنا بەراورد بکە لە نێوان ئەو دوو وێنەیەی کە دەیبینی بە هۆی هەردوو بەشی خوارەوە و سەرەوەی چاویلکەکە.

## کۆکردنەوەی هاوێنە تەنکەکان

ئەگەر دوو هاوێنە بەکارهات بۆ دروستبوونی وێنە، ئەوا مامەڵەکردن لەگەڵ سیستمەکە بەم شێوەی خوارەوە دەبێت:

یەکەم: وێنەکە دیاریدەکرێت لەڕێگەی هاوێنەی یەکەمەوە هەروەك هاوێنەی دووەم نەبێت وایە.

دووەم: تیشکەکان دەکەونە سەر هاوێنەی دووەم وەك ئەوەی کە لە وێنە دروست بووەکەی هاوێنەی یەکەمەوە هاتبێ بۆیە وێنەی دروستبوو لە هاوێنەی یەکەمدا وەك تەن دەبێت بۆ هاوێنەی دووەم و مامەڵەی بۆ دەکرێت وە وێنەی دروستبوو لە هاوێنەی دووەم وێنەی کۆتایی سیستمەکە دەبێت کە پێکهاتووە لە دوو هاوێنە. وە دواگەورەکردن لە سیستمی دوو هاوێنەدا بریتییە لە لێکدانی گەورەکردنی دوو هاوێنەکە هەریەك بە تەنیا، وە ئەگەر وێنەی دروستبوو لە هاوێنەی یەکەم کەوتە پشت هاوێنەی دووەم ئەوا ئەم وێنەیە دەبێتە تەنێکی خەیاڵی بۆ هاوێنەی دووەم (واتە $P$ نێگەتیف دەبێت) دەتوانرێت هەمان ڕێگە بەکاربهێنرێت بۆ سیستمێك کە لە سێ هاوێنە یان زیاتر پێکهاتبێت.

### بەکارهێنانی مایکرۆسکۆبی نادە(ئاڵۆز) پێکهاتوو لە جووت هاوێنکو

بەکارهێنانی هاوێنکۆی سادە ڕێگەیەکی سنووردارە بۆ پشکنینی ووردەکاری تەنەکان، دەتوانرێت گەورەکردن زیاتر بکرێت بە کۆ کردنەوەی دوو هاوێنە لە ئامێرێکدا کە پێی دەڵێن مایکرۆسکۆبی ئاڵۆز. ئەم مایکرۆسکۆبە (وردبینە) پێکدێت لە دوو هاوێنکۆ، هاوێنتەن(نزیکترە لە تەن) کە دوورە تیشکۆکەی لە $1\ cm$ کەمترە، وە هاوێنچاو کە دوورە تیشکۆکەی چەند سانتیمەترێکە وەك لە **وێنەی 6-8** دیارە، تەنەکە کەمێك دوورتر دادەنرێت لە تیشکۆی هاوێنتەنەکەوە وێنەیەکی ڕاستەقینەی گەورەکراوی هەڵگەڕاوەی بۆ پەیدا دەبێت لە تیشکۆی هاوێنچاوەکە یان کەمێك نزیکتر بە ئاراستەی هاوێنەکە. لەبەر ئەوەی هاوێنچاوەکە ڕۆڵی هاوێنەی گەورەکردن دەبینێت وە وێنەی گەورەکراوی یەکەم دەبێتە تەن بۆ ئەو هاوێنەیەی کە وێنەیەکی خەیاڵی زیاتر گەورە کراوی لێدروست دەبێت، دواوێنەی پەیدابوو لە مایکرۆسکۆبەکە هەڵگەڕاوەیە لە چاوتەنەکەدا وەك لە **وێنەی ( 6-8 )** دا دیارە.




**وێنەی 6-8**

لە مایکرۆسکۆبی ئاڵۆز، وێنەی ڕاستەقینەی هەڵگەڕاوەی پەیدابوو لە هاوێنتەن دەبێتە تەنێك بۆ هاوێنچاوەکە.

مایکرۆسکۆبی نادە گەشەیدا بە تێڕوانینمان بۆ جیهانی تەنە بچووکە یەکجار ووردەکان کە پێشتر نەمان دەناسین، وە پرسیاری ئاراستەکراو دەربارەی مایکرۆسکۆب (ئایا دەتوانین بە ئارامی و ووردبینی جۆرە مایکرۆسکۆبێك دروست بکەین کە بتوانرێت گەردیلەی پێ ببینرێت؟) ئەگەر ڕووناکی بینراو بە کارهات بۆ ڕووناککردنەوەی ووردیلەکە. وەڵام: نەخێر، بۆ ئەوەی تەن ببینرێت لە ژێر مایکرۆسکۆبدا پێویستە دووریەکانی تەنەکە یەکسان نە بێت بە درێژی شەپۆلەکە بەلای کەمەوە. لەبەرئەوەی دووریەکانی گەردیلە بچووکترە لە درێژی شەپۆلی ڕووناکی بینراو بەچەند جارێك، لەبەر ئەوە دەبێت بە تەکنیکی نوێ چارەسەری ئەم شاراوەییەی گەردیلەکان بکرێت.

## بە کارهێنانی دوو هاوێنکۆ لە تەلسکۆبەکانی ڕووناکی شکێنەرەوەدا (تەلسکۆبە هاوێنەدارەکان)

لە بەشی ڕووناکی و دانەوەدا باسمان کرد، تەلسکۆب دوو جۆری هەیە، تەلسکۆبی ئاوێنەدار و تەلسکۆبی هاوێنەدار لە تەلسکۆبی هاوێنەداردا وێنە لەسەر چاو دروست دەبێ بە ڕێگەیەك وەك ئەوەی لە باری میکرۆسکۆبدایە. یەکەم جار وێنەیەکی بچوکراوەی هەڵگەڕاوە لە تیشکۆی هاوێنتەنەکە $F_0$ دروست دەبێ، تەنەکە دەکەوێتە دوریەکی بێ کۆتایی، وەهاوێنچاوەکە بە شێوەیەك جێگیر دەکرێت بە مەرجێ تیشکۆکەی زۆر نزیکبێت لە تیشکۆی هاوێنتەنەکەوە، وێنەی یەکەم دروست دەبێ وەك لە **وێنەی 9-6** دا دیارە. وە لەبەر ئەوەی ئێستا وێنەکە دەکەوێتە ناو تیشکۆی هاوێنچاوەکەوە $F_e$ ، ئەوا ئەم هاوێنەیە ڕۆڵی گەورەکردنی سادە دەگێڕێت، بەم پێیە بینەر دەتوانێ بە تەواوی تەنەکە دەست نیشانبکات.




**وێنەی 9-6**

ئەو وێنەیەی هاوێنتەنی تەلسکۆبی هاوێنەدار دروستی دەکات ڕاستەقینە و هەڵگەڕاوەیە و دەکەوێتە تیشکۆوە. ئەو وێنەیە دەبێتە تەن بۆ هاوێنچاو، کە وێنەیەکی خەیاڵی گەورەکراوی بۆ دروست دەکات.

## پێداچوونەوەی بەندی 2-6

**1.** جۆری ئەو وێنەیە چۆنە کە کۆرنیە و هاوێنە لەسەر تۆڕەی چاو دروستیدەکەن؟

**2.** ئایا وێنەی دروستبوو لەم بارانەی خوارەوەدا ڕاستەقینەن یان خەیاڵین؟

أ. تەنێك نزیکترە لە هاوێنەی کامێرایەك وەك لە تیشکۆکەیەوە.

ب. تەنێك دوورترە لە تیشکۆی هاوێنتەنەکەی تەلەسکۆبی هاوێنەدارەوە.

ج. تەنێك دوورترە لە تیشکۆی هاوێنەی کامێرایەکەوە.

**3.** شوێنی وێنەی تەنێك دیاریبکە کە دەکەوێتە دووری 3.0 cm دوورتر لە تیشکۆی هاوێنکۆیەکەوە کە دووره تیشکۆکەی 4.0 cm .

**4.** گەورەکردنی تەنەکە چەندە لە پرسیاری 3 دا؟

**5.** **لێکدانەوەی وێنەکان** : هێڵکاری تیشك بەکاربهێنە، بۆ دۆزینەوەی شوێنی وێنەی دروست بوو لە زومی کامیرە (هاوێنپەرت) کە دووره تیشکۆی 5.0 cm بێت؟ درێژیەکەی چەندە ئەگەر درێژی تەن 1.0 cm بێت و لە دووری 10.0 cm لەبەردەم هاوێنەی کامێراکەوە دانرابێت؟

**6.** **بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە** : بەراورد بکە لە نێوان درێژی تەلسکۆبی هاوێنەدارو کۆکراوەی هەردوو دووره تیشکۆی هاوێنەکانی.

# ڕۆشنایەك لەسەر بابەتی
# کامیراکان

کامیراکان زۆر چەشن و قەبارە جیاوازن هەر لە کامیرا بچووکەکان و سادەکان کە ئاڕاستە دەکرێن وە وێنە دەگرن بە ئاسانی لەکاتی گەشتەکاندا، تا دەگاتە کامیرای ڤیدیۆی گەورەی ئاڵۆزی بەکارهاتوو بۆ وێنەگرتنی سینەمایی، زۆربەی کامیراکان بەلایەنی کەم هاوێنەیەکیان هەیە بەڵام لە کامیرا ئاڵۆزەکان (ناسادەکان) ژمارەی هاوێنەکان لە 30 هاوێنە تێپەڕدەکات وە لەوانەیە ئاوێنە و ئاوێزەشیان تێدابێت. سادەترین کامیرا پێیدەڵێن «کامیرای کون بچووک» کە پێکدێت لە سندوقێکی بچووکی پتەو کە کونێکی بچووکی تێدایە تیرەکەی نزیکەی 0.5 mm وە ئەم کامیرایە سەرەڕای سادەییەکەی وێنەیەکی باش دروست دەکات لەسەر فلیمەکە کە لەسەر دیواری سندوقەکە بەرامبەر کونەکە چەسپ کراوە. پێویستە کامێراکە کاتێکی زۆر ئاڕاستەی تەنەکە بکرێت چونکە ئەو ڕووناکیەی بە کونەکەدا تێپەڕ دەبێت زۆر کەمە لەوانەیە کونەکە گەورەتربێت بۆیە هاوێنکۆیەك و سەر پۆشێکی جولاوەی بۆ زیاد دەکرێت کە بە خێرایی دەکرێتەوە و دادەخرێت، بە جۆرێك کە ڕێگەبدات بە تێپەڕبوونی ڕووناکی بە هاوێنەکەدا و کاربکاتە سەر فلیمەکە. بەم شێوەیە کامێرایەکی سادەی تر دەستدەکەوێت ( پێیدەڵێن کامیرای توندی ڕووناکی نەگۆڕ). فلیمەکە لە هەمان دووری لە دوورە تیشکۆی هاوێنەکەوە دادەنرێت،وە ئەو کامیرانەی کە تەنها یەکجار بەکاردەهێنرێن بۆ وێنەگرتنی یەك فلیم ئەوا وێنەی باش دروست دەکەن تەنها بۆ تەنە دوورەکان بەڵام بۆتەنە نزیکەکان وێنەکە چردەبێتەوە لە پشت فلیمەکە لەبەر ئەوەی شوێنی فلیمەکە نەگۆڕە بۆیە پێویستە هاوێنەکە دوور بخرێتەوە لە فلیمەکە تا وێنەیەکی دیار و ڕوون بدات.

هاوێنەی کامیرا زۆر چەشنی هەیە کە دەتوانرێت بە ئاسانی بگۆڕدرێن لە کامیرای تاك هاوێنەکەدا هاوێنەی سروشتی ئەو هاوێنەیەیە کە هەمان بواری بینینی چاوی مرۆڤی هەیە.

لەوانەیە وێنەگر ئارەزووبکات کە وێنەی تەنە دوورەکان بگرێت کە ووردەکاری زۆری تێدایە یان وێنەی تەنە گەورەکان بگرێت بە بێ ئەوەی چەند وێنەیەك بگرێت ئەمە دەکرێت چونکە لە هاوێنە گۆشە گەورەکاندا دوورە تیشکۆ زۆر بچووکە دەتوانن بواری بینینی زۆر گەورەتر دابین بکەن لە بواری بینینی چاودا بەڵام هاوێنەی وێنەگرتن لە دووردا دوورە تیشکۆی درێژە دەبێتە هۆی زیادکردنی گەورەکردن. هاوێنەی وێنەگرتن لە دووردا گۆشەی بینینی تەنها بچووکە. هاوێنەی زووم یارمەتیت دەدات بۆ گۆڕینی دوورە تیشکۆ بەبێ گۆڕینی هاوێنەکان، ئەم کامیرایانە کۆمەڵێك هاوێنەی تیایە کە دەتوانرێت یەکێکیان بجوڵێنرێت بە پێی ئەوانی تر. کامیرا جۆر چاکەکان ژمارەیەك هاوێنەی تیایە هەندێکیان هاوێنپەرت و ئەوانی تر هاوێنکۆن ئەمەش بۆ کەمکردنەوەی شێواندن و لێڵ ڕەنگی کە پەیدا دەبن لە باری کامیرای کۆکەرەوەی تاك (هاوێنە) زۆربەی بارەکانی دروست بوونی لێڵ ڕەنگی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هاوێنەکان تیشکە ڕەنگ جیاوازەکان لادەدەن بە بڕی جیاجیا ئەمەش دەبێتە هۆی کاریگەری شەبەنگی ڕووناکی ئاسایی (پەلکە زێڕینە) لەسەر وێنەکە لەوانەیە پرسیاربکەیت لە ڕێگەی کارکردنە بینایەکان لە کامیرای ژمارەیی (دیجیتڵ) وەڵامی ئەمە ئەوەیە کە هاوێنەکە و سەرپۆشە جولاوەکە هەر هەمانن کە لەو کامیرانەدا بەکاردێن کە فلیم تیایاندا بەکاردێت، بەڵام فلیمەکە لێرەدا دەگۆڕێت بە ڕیزبەندیەکی هەستیاری بەستراو بەشانەی (سەرچاوە) (CCD) ئەم ڕیزبەندیە پێك دێت لە چەند هەستیاریەکی بچووك کە تەزویەکی کارەبا دەدات کاتێك تیشکی بکەوێتە سەر لەو تەنەوە کە دەمانەوێت وێنەی بگرین. هەروەها هاوێنەکان ئەبێ تیشکە هاتووەکان لەتەنەکەوە بۆ سەر ڕیزبەندەکە (CCD) چڕبکەنەوە وەك چۆن چڕیان دەکردەوە لەسەر فلیمەکە.



لەم وێنەیە پانەبڕگەی لاتەنیشتی کامیرا نیشان دراوە لە چەند بەشێکی جیاواز پێك هاتووە بۆ دروست بوونی وێنە لەسەر فلیم.



سادەترین جۆری کامیرا پێکدێت لە سندوقێك کە کونێکی بچوکی تیایە تیشك دەکەوێتە سەردیواری ناوەوەی پشتەوەی سندوقەکە.

# بەندی 3-6

# دیاردەکانی ڕووناکی
## *Optical Phenomena*

## 3-6 ئامانجەکان

- پێشبینی دەکرێت ئایا ڕووناکی دەشکێتەوە یان تووشی دانەوەی تەواوەتی ناوەکی دەبێت.
- مەرجەکانی هەوا دەناسێنیٚ کە دەبێتە هۆی شکانەوە.
- پەرەوازەکردن لێك ئەداتەوە وە هەندیٚ لە دیاردەکانی تری ڕووناکی وەك پەلکەزێرینە، بە پێی پەیوەندی نێوان هاوکۆلکەی شکانەوە و درێژی شەپۆل.

## دانەوەی تەواوەتی ناوەکی و گۆشەی مۆڵەقە

دیاردەیەکی گرنگ هەیە کە پێدەڵێن دانەوەی تەواوەتی ناوەکی total internal reflection ئەمەش لەوانەیە جێبەجیٚ ببێت لە ئەنجامی تێپەر بوونی ڕووناکی لە ناوەندێکەوە بۆ ناوەندێکی تر کە هاوکۆلکەی شکانەوەی کەمتربێت. وادابنیٚ کە تیشکی ڕووناکی لە ئاوەوە تێپەربێت بۆ هەوا وەك لە وێنەی **10-6** (أ) دیارە. ئەگەری چوار ئاڕاستە بۆ تیشکەکان هەیە وەك لە وێنە **10-6** ب دیارە.

لە گۆشە لێدانێکی دیاریکراودا کە پێیدەوترێت **گۆشەی مۆڵەقە** critical angle تیشکە شکاوەکە کە لادەدات تەریب دەبێت بەڕووە جیاکەرەوەکەی نێوان دوو ڕووەکە. وە گۆشەی شکانەوە $90^o$ دەبێت وەك وێنەی **10-6** (ب)، وەکاتێك گۆشەی لێدان زیاتر بێت لە گۆشەی مۆڵەقە، تیشکەکە بە تەواوەتی دەدرێتەوە لە ڕووە جیاکەرەوەکە وەك ئەوەی بەر ڕوویەکی تیشکدەرەوە کەوتبێت (کە ڕێڕەوی تیشکە هاوشێوەکان یاسای ڕووناکی دانەوە دیاریان دەکات) واتە گۆشەی لێدان یەکسانە بە گۆشەی دانەوە. وە لە ئامێرە بینایییەکان ئاوێزە دادەنرێت کە تیشکە کەوتووەکە بەتەواوەتی دەدرێتەوە لە ڕووی پشتەوەی ئاوێزەکەوە. ئاوێزەکان بە کاردێن لە جیاتی ئاوێنە ڕووکەش کراوەکان بەزیو یان بە ئەلەمنیۆم، چونکە ڕووناکی دەداتەوە بە شێوەیەکی باشتر وە بەرگری زیاترە بۆ ڕوشاندن.

دەتوانرێت یاسای سنێڵ بەکاربێت بۆ دۆزینەوەی گۆشەی مۆڵەقە وەك لە پێشتردا باسمان کرد کاتێك گۆشەی لێدان $\theta_i$ یەکسانە لەگەڵ گۆشەی مۆڵەقە $\theta_c$ ئەوا گۆشەی شکانەوە $\theta_r = 90^o$ دەبێت.

بە دانانی ئەم نرخانە لە یاسای سنێڵ ئەم پەیوەندیەمان دەست دەکەوێت:

$$n_i \sin \theta_c = n_r \sin 90^o$$

لەبەر ئەوەی (ساین 90 )دەکاتە 1 دەگەینە ئەم هاوکێشەیە:

**گۆشی مۆڵەقە**

$$\sin \theta_c = \frac{n_r}{n_i} \qquad n_i > n_r$$

ساینی گۆشەی مۆڵەقە = هاوکۆلکەی شکانەوەی ناوەندی دووەم / هاوکۆلکەی شکانەوەی ناوەندی یەکەم

**تەنها لەوکاتەدا کە هاوکۆلکەی شکانەوەی ناوەندی یەکەم > هاوکۆلکەی شکانەوەی ناوەندی دووەم.**

تێبینی بکە ئەم پەیوەندیە بەکاردێت تەنها کاتێك $n_i$ گەورەترە لە $n_r$ . واتە دانەوەی تەواوەتی ناوەکی ڕوودەدات تەنها بە تێپەر بوونی ڕووناکی لە ناوەندێکەوە بۆ ناوەندێکی تر کە هاوکۆلکەی شکانەوەی کەمتر بێت. ئەگەر $n_i$ بچوکتر بوو لە $n_r$ ئەوا $\sin \theta_i$ بە پێی ئەم هاوکێشەیە گەورەتر دەبێت لەیەك، ئەمەش ئەستەمە چونکە ساینی

### دانەوەی تەواوەتی ناوەکی

دانەوەیەکی تەواوتییە کە لە ناو ماددەدا ڕوو دەدات، کاتێك گۆشەی لێدانی ڕووناکییەکە بۆ سەر ڕووە جیاکەرەوەکە لە گۆشەی مۆلەقە زیاتر بێت.

### گۆشەی مۆڵەقە

ئەو گۆشەی لێدانەیە کە گۆشەیەکی شکانەوەی وەستاوی بەرامبەرە، کاتێك ڕوناکی لە ناوەندێکی هاوکۆلکە شکانەوە گەورەوە دەچێتە ناوەندێکی تر کە هاوکۆلکەی شکانەوەکەی بچوکترە.


(أ)



(ب)

**وێنەی 10-6**
(أ) ئەم وێنەیە ڕێڕەوی جیاوازی ڕووناکی دەرچوو لە خوارەوەی حەوزی ئاو ڕوون دەکاتەوە. (ب) لە گۆشەی مۆڵەقە $\theta_c$ تیشکەکە دەشکێتەوە بە تەریبی بۆ ڕووی ئاوەکە. هەر تیشکێك کە گۆشەی لێدانی زیاتر بێت لە $\theta_c$ بە تەواوەتی بۆ ناو ئاوەکە دەدرێتەوە.

هەر گۆشەیەك نابێت لەیەك زیاتر بێت. ئەگەر ناوەندی دووەم هەوابێت، ئەوا گۆشەی مۆلەقە زۆر بچووك دەبێت بۆ ئەو مادانەی كە هاوكۆلكەی شكانەوەیان بەرزە. ئەڵماس هاوكۆلكەی شكانەوەكەی دەگاتە 2.419 كە گۆشە مۆڵەقەكەی $24.4^{o}$ بەبەراورد كردن لەگەڵ گۆشەی مۆڵەقەی شووشەی ئاسایی كە هاوكولكەی شكانەوەكەی دەگاتە $n = 1.52$ و گۆشە مۆلەقەكەی $41.0^{o}$ ، لەبەر ئەوەی گۆشە مۆڵەقەی ئەڵماس بچوكە، هەر لەبەر ئەوە ئەو ڕووناكیەی دەكەوێتە سەری و بەناویدا تێپەڕ دەبێت چەندەها دانەوەی گشتی دەدەرێتەوە دواجاریش ڕووە و چاوی تەماشاكەر دەڕوات و ئەو درەوشانەوە و بریقەدانەوە جوانەی تێدا دەردەكەوێت. هەر لە بەر ئەوەشە زەرەنگەرەكان ئەڵماس بە شێوەیەك دەبڕن، كە زۆربەی ئەو ڕووناكیەی دەچێتە ژوورەوە بیگەڕێنێتەوە بە ئاڕاستەی ڕووی سەرەوە، واتە دانەوە بە ئاڕاستەی ڕووەكان دەبێت.

## نموونە 6 (ج)

### گۆشەی مۆڵەقە

**پرسیارەكە**

**گۆشەی مۆڵەقەی نێوان ڕووە جیاكراوەكەی ئاو وهەوا چەندە، ئەگەر بزانیت كە هاوكۆلكەی شكانەوەی ئاو 1.333 بێت؟**

**شیكار**

**1. دەزانم**

دراو: $n_i = 1.333$ $\quad n_r = 1.00$

نەزانراو: $\theta_c = ?$

**2. پلان دادەنێم**

هاوكێشەی گۆشەی مۆڵەقە بە كاردەهێنم.

$$\sin\,\theta_c = \frac{n_r}{n_i}$$

**3. هەژماردەكەم**

$$\theta_c = \sin^{-1}\left(\frac{n_r}{n_i}\right) = \sin^{-1}\left(\frac{1.00}{1.333}\right)$$

$$\boxed{\theta_c = 48.6^{o}}$$

## ڕاهێنانی 6 (ج)

### گۆشەی مۆڵەقە

1. گلیسرین بەكاردێت بۆ بەرهەمهێنانی صابون و هەروەها بۆ چەند بەكارهێنانێكی پێویستی تر گۆشەی مۆڵەقەی ڕووناكی گوێزراوە لە گلیسرینەوە $(n = 1.473)$ بۆ هەوا بدۆزەرەوە؟
2. گۆشەی مولەقەی ڕووناكیەكی تێپەر بوو بە گلیسرینەوە$(n = 1.473)$ بۆئاو $(n = 1.333)$ چەندە؟
3. هاوكۆلكەی شكانەوەی سەهۆڵ كەمترە لە هاوكۆلكەی شكانەوەی ئاو، گۆشە مۆلەقەی ڕووناكی تێپەر بوو لە سەهۆڵەوە $(n = 1.309)$ بۆ هەوا چەندە؟
4. كام لەم دوو مادانە گۆشەی مۆڵەقەیان بچوكترە، ئەڵماس $(n = 2.419)$ یان پارچە زركونیوم $(n = 2.20)$ ؟ هۆیەكەی بڵێ.

چالاكییەكی كرداری خێرا

**بریسكۆب**

**كەرەستەكان**

✓ دوو ئاوێزەی گۆشە وەستاو

دوو ئاوێزە لە تەنیشت یەك دابنێ وەك لەم وێنەی خوارەوەدا دیارە.




تێبینی بكە ئەم شێوە دانانە دەتوانرێت وەك بریسكۆب بەكار بهێنرێت، بۆ بینینی ئەو تەنانەی كە دەكەونە سەروی هێڵی بینینت، ئەگەر ئامێرەكە بەشێوەیەكی شاوڵی دابنرێت، بەڵام وێنەكە لە پشت گۆشەكان دەبینیت ئەگەر بە شێوەیەكی ئاسۆی دابنرێت. ئێستا چۆن ئامێرەكە ڕێك دەخەی بۆ ئەوەی دواوەی خۆتی پێ ببینی، وێنەكە لەسەر لاپەرەیەك بكێشە و پاشان تاقیبكەرەوە.

بیرۆكەی بەسوود لەبیرت نەچێت كە گۆشەی مۆڵەقە كاتێك دروست دەبێت كە ڕووناكی لە ناوەندی هاوكۆلكەی شكانەوەی گەورەوە بۆ ناوەندێكی تر بچێت كە هاوكۆلكەی شكانەوەكەی كەمتربێت



## ڕۆشنایەك لەسەر بابەتی ڕیشاڵە بینایەکان

یەکێ لە بەجێهێنانە گرنگەکانی تری ڕووناکی دانەوەی تەواوەتی ناوەکی،بەکارهێنانی لوولەی شووشەیی یان پلاستیکی ڕوونە، وەك ئەم لولەیەی کە لە وێنەکەدا ڕوون کراوەتەوە، بۆ گواستنەوەی ڕووناکی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر. ڕووناکی بە ناو ئەو لوولانەدا تێپەڕ دەبێت وە هەروەها لە شوێنە چەماوە سادەکانی لوولەکەدا بەهۆی ڕووناکی دانەوەی ناوەکی تەواوی یەك لەدواییەك. بۆی هەیە ئەم لوولە ڕووناکیانە نەرم بن ئەگەر بگۆڕدرێن بە لوولەی ڕەقی ڕیشاڵ تەنك. وە گورزەیەك لە ڕیشاڵی تەریب بەکاربهێنن بۆ دروست کردنی هێڵی گواستنەوەی ڕووناکی، دەتوانرێ ڕووناکی لە خاڵێکەوە بۆ خاڵێکی تر بگوازرێتەوە، ڕێگەی تەکنەلۆجیای بەکارهاتوو پێی دەڵێن ڕیشاڵە بینایەکان



ڕووناکی بە درێژایی بۆریە کە دەگوێزرێتەوە بەهۆی ڕووناکی دانەوەی تەواوەتی

کە بڕێکی زۆر کەمی ڕووناکی ون دەبێ لە ناو ئەم ڕیشاڵانەدا لە ئەنجامی دانەوەی یەك لە دوای یەك، لەسەر دیوارەکانی لوولەکەکە هەرکەم بوونەوەیەك لە ڕۆشنایی بە شێوەیەکی سەرەکی لە ئەنجامی دانەوەکانی روودەدات لە هەردوو سەری، وە بۆ هەڵمژینی مادەی ریشاڵەکان ئەوا ئامێرە ریشاڵە بینایەکان بە شێوەیەکی سەرەکی بەکاردێت بۆ بینینی وێنەی ئەو ناوچانەی کە دورەدەستن. بۆ نموونە دەتوانرێ لوولەیەکی باریك لە ڕیشاڵە بینایەکان لە ڕێگەی سورێنچکەوە بگاتە گەدە بۆ بینین و دەست نیشانکردنی هەر گرێیەك و برینێك تیایدا. ڕیشاڵە بینایەکان بە شێوەیەکی فراوان لەبواری گەیاندنی تەلی و بێ تەلدا بەکاردێت چونکە ڕیشاڵەکان دەتوانن بڕێکی زۆر لە پەیوەندیە تەلەفونیەکان و نیشانەکانی کۆمپیوتەری بگوێزنەوە گەر بەراورد بکرێن لەگەڵ تەلی کارەباییدا.

## شکانەوە لە بەرگە هەوادا ( ئەتمۆسفیر)

ڕۆژانە دەتوانی نموونە لەسەر شکانەوە ببینی، خۆر دەتوانرێ ببینرێ دوای ئاوابونی پەیکەکەی لە پشت ئاسۆوە، ئەو تیشکەی لە خۆرەوە دێت بەر بەرگە هەوای زەوی دەکەوێت و لادەدات، چونکە هاوکۆلکەی شکانەوەی بەرگی هەوا جیاوازە لە کە هاوکۆلکەی شکانەوەی هەوای چینەکانی نزیك بۆشایی. لەم بارەدا لادانەکە وردە وردە و لێك نەپچڕاو دەبێت، چونکە ڕووناکی دەگوێزرێتەوە لە نێوان چینەکانی هەوادا کە هاوکۆلکەی شکانەوەکەی بەرەبەرە دەگۆڕێت بەشێوەیەکی بەردەوام وە چاومان بەدوای ڕێرەوی ئەم تیشکانە دەکەوێت بە ئاراستەی پێچەوانەی ئەو سەرچاوەی تیشکەکانی لێوە هاتووە.

### تراویلکە (سراب) Mirages

تراویلکە دیاردەیەکی سروشتی ترە بە هۆی شکانەوەی ڕووناکی لە چینەکانی هەوادا ڕوودەدات. وە دەتوانرێ تراویلکە ببینرێ کاتێ زەوی زۆر گەرم بێ، وەك لە ناوچە بیابانەکاندا، بە جۆرێك کە هەوای نزیك ڕووی زەوی گەرمتر بێت لەو هەوایەی کە دەکەوێتە چینە بەرزەکان.

لەبەر ئەوەی چینەکانی هەوا لە بەرزییە جیاجیاکانی سەر ڕووی زەویدا چڕییان جیاوازە، وەهاوکۆلکەی شکانەوەشیان جیاواز دەبێت.




**وێنەی 11-6**

تراویلکە دروست دەبێ لە ئەنجامی لادانی تیشکی ڕووناکی لە چینەکانی هەوا. کاتێ جیاوازیەکی گەورە هەیە لە نێوان پلەی گەرمی زەوی و هەوادا.

ئەم کاریگەریە لە **وێنەی 6-11** دا دیارە کە چاودێریك دارەکە بە دوو ڕێگای جیاواز دەبینێت. کۆمەڵەی یەکەمی تیشکەکان دەگاتە چاودێر بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەسەر ڕێڕەوی A ، وە چاو بە دوای ئەو تیشکە (بە شێوەی پێچەوانە) دەکەوێت وە چاودێرەکە دارەکە لە شوێنی ڕاستەقینەکەی دەبینیت. بەڵام کۆمەڵەی دووەمی تیشکەکان بە ئاراستەی ڕێڕەوی B تێپەر دەبن کە بە ئاڕاستەی زەوی دەچن وە ووردە ووردە لا دەدەن لە ئەنجامی شکانەوەدا لەبەر ئەوە چاودێرەکە وێنەیەکی هەڵگەڕاوەی دارەکە دەبینێت کاتێك بەدوای تیشکەکە دەکەوێت کە بە پێچەوانەی ئاڕاستەی ئەو سەرچاوەیەی کە لێوەی هاتووە وە لەبەرئەوەی چاودێرەکە دوو وێنە دەبینێت کە یەکێکیان هەڵنەگەڕاوەیە و ئەوەی تریان هەڵگەڕاوەیە بۆ دارەکە لەبەردەم ڕووە ڕووناکی دەرەوەکەدا بۆیە وا دێتە پێش چاوی کە گۆمە ئاوێك لەبەردەم دارەکەدایە.

# پەرەوازەکردن

یەکێك لە سیفەتە گرنگەکانی هاوکۆلکەی شکانەوە ئەوەیە کە بڕەکەی جگە لە بۆشایدا بەندە لەسەر درێژە شەپۆلی ڕووناکی، لەبەر ئەوە بە پێی یاسای سنێڵ ئەو ڕووناکییەی کە درێژی شەپۆلەکانی جیاوازە، بە گۆشەی شکانەوەی جیاواز لا ئەدەن یان دەشکێنەوە لە کاتی تێپەڕبوونی بە مادەیەکدا. وە بەم دیاردەیە دەگوترێت پەرەوازەکردن dispersion وەك لە **بەندی 6-1** باس کرا، هاوکۆلکەی شکانەوە، کەم دەکات بەزیادبوونی درێژی شەپۆل. بۆ نموونە ڕەنگی شین $(\lambda = 470\ nm)$ زیاتر دەشکێتەوە لە ڕەنگی سوور $(\lambda = 650\ nm)$ کاتی تێپەڕبوونی بە مادەیەکی ڕووناکی شکێنەرەوەدا.

**پەرەوازەکردن**

کرداری لێکجیاکردنەوەی ڕووناکیە بۆ ڕەنگە سەرەکیەکانی.

## شەبەنگی بینراوی پەیدابوو لە ئەنجامی تێپەڕبوونی ڕووناکی سپی بە ناو ئاوێزەدا

بۆ تێگەیشتنی کاریگەری پەرەوازەکردنی ڕووناکی وادابنێ ئەو تیشکە ڕووناکیەی دەکەوێتە سەر ئاوێزەیەك وەك **وێنەی 6-12** لەئەنجامی پەرەوازەبووندا بەشە شینەکەی ڕووناکیەکە زیاتر لادەدات لە بەشە سوورەکەی وە تیشکە دەرچووەکان لە ڕووەکەی تری ئاوێزەکەوە بەش دەبێت بۆ زنجیرە ڕەنگێك پێی دەڵێن شەبەنگی بینراو وە ئەو ڕەنگانە بەدوایەك دەبن بە گوێرەی کەمبوونەوەی درێژی شەپۆلەکانیان کە دەست پێدەکات لە ڕەنگی سوور و پرتەقاڵی و زەرد بۆ سەوز و شین و نیلی تا وەنەوشەیی.




**وێنەی 6-12**
کاتێك ڕووناکی سپی دەچێتە ناو ئاوێزەیەکەوە، ئەوا لادانی ڕووناکی شین زیاترە لە لادانی ڕووناکی سوور وە ئاوێزە ڕەنگی سپی پەرەوازە دەکات بۆ پێکهێنەرە جیاوازەکانی.

## پەیدابوونی (دروستبوونی) پەلکە زێرینە لە پەرەوازەکردنی ڕووناکی لە دڵۆپەکانی ئاودا.

پەرەوازەبوونی ڕووناکی بە ڕوونی بەدیار دەکەوێت لە شەبەنگی ڕەنگاوڕەنگی پەلکە زێرینەوە، کە چاودێرێك تێبینی دەکات کە لە نێوان تیشکی خۆر و دڵۆپە ئاوەکاندا وەستابێت. کاتێك تیشکی خۆر دەکەوێتە سەر دڵۆپە ئاوێك لەهەوادا، یەکەم جار لەسەر ڕووی دەرەوەی دەشکێتەوە وە ڕووناکی وەنەوشەیی زیاتر دەشکێتەوە، بەڵام ڕووناکی سوور کەمتر دەشکێتەوە پاشان تیشکەکە بەتەواوەتی دەدرێتەوە بۆ ڕووی ناوەوەی دڵۆپەکە، بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ڕووی دەرەوە، وە جارێکی تر دەشکێتەوە لە کاتی چوونە دەرەوەی لە دڵۆپەکەوە بۆ هەوا. تیشکەکە لە دڵۆپەکە دەچێتە دەرەوە بە شێوەیەك کە گۆشەی نێوان تیشکە سپیە کەوتووەکەو تیشکە وەنەوشەییە دەرچووەکە $40^{o}$ بەڵام گۆشەی نێوان تیشکە سپیە کەوتووەکە و تیشکە سوورە دەرچووەکە $42^{o}$ وەك لە **وێنەی 6-13** (ب) دا ڕوون کراوەتەوە.




**وێنەی 13-6**

پەلكە زێڕینە لە وێنەی (أ) دا لە ئەنجامی پەرەوازەبوونی ڕووناكی سپی یە لە ناو دڵۆپەكانی باراندا، ڕووناكی خۆر شیتەڵ دەبێت وەشەبەنگ دروست دەبێت كاتی چوونە ناو دڵۆپە گۆییەكانەوە و تیشكدانەوەی تەواوەتی و ناوخۆی لە سەر ڕووی ناوەوەی دڵۆپەكە. وەك لە وێنەی (ب)دایە ڕەنگی بینراوی هەر دڵۆپێك بەندە لەسەر ئەو گۆشەیەی كە دڵۆپەكەی لێوە دەبینرێت.

وادابنێ ئێستا لە **وێنەی 13-6 (أ)** دا كەسێك چاودێری دڵۆپە بارانێك لە بەرزایی ئاسماندا دەكات، ڕەنگی سور دەبینێ بەڵام ڕەنگی وەنەوشەیی و ڕەنگەكانی تر بەسەر چاودێرەكەدا تێپەر دەبێت، چونكە ئەم ڕەنگانە لادانە كەیان لە ڕێژەوی ڕووناكی ڕەنگی سپیدا زیاترە لە ڕەنگی سوور. لەبەر ئەوە چاودێرەكە دڵۆپەكە بە ڕەنگی سور دەبینێ. هەروەها وادابنێ كە دڵۆپێكی بارانی نزمتر لە دڵۆپەكەی یەكەم لە ئاسماندایە. ئێستا چاودێرەكە ڕەنگی وەنەوشەیی دەبینێ كە لێوەی دەرچووە، وە دڵۆپەكە بە ڕەنگی وەنەوشەیی دەرئەكەوێت (ڕووناكییە سورەكە لە دڵۆپەكەوە دەردەچێت بەر زەوی دەكەوێت و نابینرێت) چاودێرەكە ڕەنگەكانی تری شەبەنگ دەبینێت لەو دڵۆپانەی بارانەكەوە دەكەونە نێوان ئەو دوو بەرزیەوە.

تێبینی بكە پەلكە زێڕینە زۆربەی جار لە سەرو ئاسۆوە دەبینرێ كە هەردوو لاكەی بەر زەوی دەكەوێت. ئەگەر چاودێرەكە لە فرۆكەیەكی بەرزەوە بێت یان لە لوتكەی چیایەكی بەرزدا بێت ئەوا پەلكە زێڕینە بەشێوەی بازنەیەكی تەواو دەبینرێت.

# لێڵ ڕەنگی لە هاوێنەدا

یەكێك لە كێشە گرنگەكان كە بە هۆی هاوێنە و سیستمی هاوێنەوە دروستدەبێت بریتیە لە وێنەی لێڵ و ناڕێك. بیردۆزە ساكارەكەی ئاوێنە و هاوێنە تێبینی دروست بوونی گۆشەیەكی بچووك لە نێوان تیشك و تەوەرەی بنچینەییدا دەكات. هەروەها گەر وادابنێین كە هەر تیشكێك كە دەكەوێتە سەر ئاوێنە یان هاوێنە لەسەر چاوەیەكی خاڵێكی ڕووناكەوە، لە خاڵێكدا كۆدەبێتەوە، وێنەیەكی ئاشكرا دروست دەبێ. ئاشكرایە كە ئەمەش هەموو كات جێبەجێ ناكرێت لە باری ئاساییدا. وە لەو بارانەی كە نزیك كردنەوە ناگونجێ لەگەڵ ئەگەرەكانی ئەم بیردۆزە وێنەیەكی لێڵی نادیار دروست دەبێ، وەك لە باری ئاوێنە گۆییەكاندا، هەروەها هەمان شت پەیدا دەبێ لە هاوێنەش دا كە ئەمەش لێڵ گۆیی ( Spherical ) پەیدا دەكات. (لە كۆنەبوونەوەی تیشكە دراوەكان لەیەك خاڵدا).

**لێڵ گۆیی ڕوودەدات بە هۆی جیاوازی نێوان جووت تیشكۆی تیشكە دوورەكان لە تەوەرەی بنچینەی هاوێنەی گۆی و جووت تیشكۆی تیشكە نزیكەكان كە لە چەقی هاوێنەكەدا كۆدەبنەوە لە خاڵەكانی دوور لە هاوێنەكە،** بەبەراورد كردن لەگەڵ تیشكە كەوتووەكانی سەر لاكانی هاوێنەكە.

جۆرێکی تر لە لێڵی هەیە پێیدەڵێن **لێڵ ڕەنگی** chromatic aberration پەیدا دەبێت بە هۆی پابەندبوونی شکانەوە لەسەر درێژی شەپۆل. وە لەبەرئەوەی هاوکۆلکەی شکانەوەی مادەیەکی دیاریکراو دەگۆڕێت بە گۆڕانی درێژی شەپۆل، ئەو تیشکانەی کە درێژە شەپۆلەکانیان جیاوازە، لە چەند تیشکۆیەکی جیا جیای هاوێنەکەدا کۆدەبنەوە بۆ نموونە، کاتێ تیشکێکی سپی دەکەوێتە سەر هاوێنەیەك، ڕەنگی ڕووناکی وەنەوشەیی شکانەوەی زیاتر دەبێت لە ڕەنگی سور، وەك لە **وێنەی 6-14** ڕوون کراوەتەوە لەبەر ئەوەی دوورە تیشکۆی ڕەنگی سور گەورەترە لە دوورە تیشکۆی ڕەنگی وەنەوشەیی. وە دوورە تیشکۆی ڕەنگەکانی تر دەکەوێتە نێوان ئەم دوو دورە تیشکۆیەوە، جا لەبەرئەوە لێڵ گۆیی هاوێنپەرت پێچەوانەی لێڵ گۆیی هاوێنکۆیە دەتوانرێت لێڵ گۆیی کەم بکرێتەوە بە شێوەیەکی چالاك، بەبەکارهێنانی دوو کۆمەڵە هاوێنە، یەکێکیان هاوێنپەرتە وە ئەوی تریان هاوێنکۆیە کە لە دوو مادەی شووشە جیاواز دروست کرابن.

**لێڵ ڕەنگی**

کۆبوونەوەی ڕەنگی ڕووناکیە جیاوازەکانە لە دووری جیاواز لە پشت هاوێنەوە.




**وێنەی 6-14**

بە هۆی پەرەوازەبونەوە Dispersion ، ڕووناکی سپی کەوتوو لەسەر هاوێنە، لە تیشکۆی جیاجیادا کۆ دەبنەوە کە هەر یەکەیان تایبەتە بە درێژیە شەپۆلێکی دیاریکراو. (گۆشەکانی وێنەکە تەنها بۆ ڕوونکردنەوەن چونکە ڕاستەقینە نین).

## پێداچوونەوەی بەندی 6-3

**1.** گۆشەی مۆڵەقەی ڕووناکی تێپەڕ بوو لە ئاوەوە $(n = 1.333)$ بۆ سەهۆڵ $(n = 1.309)$ بدۆزەرەوە؟

**2.** لە کام لەم بارانەی خوارەوەدا دیاردەی تراویلکە ڕوودەدات؟

أ. لەسەر دەریاچەیەکی گەرم لە ڕۆژێکی گەرمدا.

ب. لەسەر ڕێگەیەکی قیرتاو لە ڕۆژێکی گەرم دا.

ج. لەسەر لێژاییەکی سەهۆڵ بەندانی خلیسکاندن لە ڕۆژێکی سارددا.

د. لەسەر لمی کەنارێك لە ڕۆژێکی گەرمدا

هـ. لەسەر ئۆتۆمبێلێکی ڕەش لەڕۆژێکی خۆرەتاودا

**3.** گەر ڕووناکیەکی سپی بە ئاوێزەیەکدا تێپەڕ بێت، کام لەم دوو ڕەنگە زیاتر لادەدەن: سور یان سەوز؟

**4.** **بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە:** پیاوێك لە ماڵ دەردەچێ دوای ڕۆژێکی باراناوی، تەماشای خۆر هەڵات دەکات پەلکە زێڕینە لەسەر ماڵی دراوسێکەی دەبینێ. ئایا لە بەیانیان یان دوای نیوەڕۆ ئەمە ڕوودەدات؟

# پوختەی بەشی 6

## زاراوە بنەڕەتییەکان

**شکانەوە** (لا 146) Refraction

**هاوکۆلکەی شکانەوەی ناوەند** (لا 148) Index of refraction

**هاوێنە** (لا 152) Lens

**دانەوەی تەواوەتی ناوەکی** (لا 164) Total internal reflection

**گۆشەی مۆڵەقە** (لا 164) Critical angle

**پەرەوازەکردن** (لا 167) Dispersion

**لێڵ ڕەنگی** (لا 169) Chromatic aberration

## بیرۆکە بنەڕەتییەکان

### بەندی 6-1 شکانەوە

- دەقی یاسای سنێڵ بریتییە لە: کاتێك ڕووناکی تێپەڕ دەبێت لە ناوەندێکەوە بۆ ناوەندێکی تر کە خێرایەکەی تێیدا جیاوازە تیشکە ڕووناکیەکە ئاڕاستەکەی دەگۆڕێ تەنها لە باری ستوونیدا نەبێت.
- کاتێك ڕووناکی لە ناوەندێکەوە بچێتە ناوەندێکی تر کە هاوکۆلکەی شکانەوەی گەورەتر بێت تیشکەکە لادەدات و نزیکدەبێتەوە لە ستوونەکە بەڵام لە باری پێچەوانەدا تیشکەکە دەشکێتەوە و دوور دەکەوێتەوە لە ستوونەکە.

### بەندی 6-2 هاوێنە تەنکەکان

- ئەو وێنەی کە لە هاوێنکۆدا پەیدادەبێت ڕاستەقینە و هەڵگەڕاوەیە ئەگەر تەنەکە دوورتربێت لە تیشکۆ. وەخەیاڵی و هەڵنەگەڕاوە دەبێت ئەگەر تەنەکە نزیکتر بێت لە تیشکۆی هاوێنەکە.
  بەڵام لە هاوێنپەرتدا هەموو کات وێنەی خەیاڵی و هەڵنەگەڕاوە پەیدا دەبێت.
- دەتوانرێت شوێنی وێنەکە دیاریبکرێت لە هاوێنەدا بە بەکارهێنانی هێڵکاری تیشک یان جێبەجێکردنی هاوکێشەی هاوێنە تەنکەکان.

### بەندی 6-3 دیاردەکانی ڕووناکی

- دانەوەی تەواوەتی ناوەکی ڕوودەدات لە کاتی تێپەڕبوونی ڕووناکی لە ناوەندێکەوە بۆ ناوەندێکی تر کە هاوکۆلکەی شکانەوەی بچووکتر بێت. ئەگەر گۆشەی لێدان گەورەتر بێت لە گۆشەی مۆڵەقە ئەوا ڕووناکی دانەوەی تەواوەتی ڕوودەدات لە ڕووە جیاکەرەوەکەی نێوان دوو ناوەندەکە.
- تراویلکەو بینینی پەپکەی خۆر پاش ئاوابوون، دوو دیاردەی سروشتین کە پەیدادەبن لە ئەنجامی شکانەوەی ڕووناکی لە هەوای دەوروبەری زەوی.

### هێمای گۆڕاوەکان

| بڕ | هێما | یەکە |
|---|---|---|
| گۆشەی لێدان | $\theta_i$ | ° پلە |
| گۆشەی شکانەوە | $\theta_r$ | ° پلە |
| هاوکۆلکەی شکانەوە | $n$ | |
| دووری تەن لە هاوێنە | $p$ | m مەتر |
| دووری وێنە لە هاوێنە | $q$ | m مەتر |
| درێژی وێنە | $h'$ | m مەتر |
| درێژی تەن | $h$ | m مەتر |
| گۆشەی مۆڵەقە | $\theta_c$ | ° پلە |



# پێداچوونەوەی بەشی 6

## پێدابچۆرەوە و هەڵیسەنگێنە

## شکانەوەو یاسای سنیڵ

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**1.** کاتێك ڕووناکی لە ناوەندێکەوە بچێتە ناوەندێکی تر ئایا هەموو کات بە ئاڕاستەی ستوونەکە دەشکێتەوە؟

**2.** ئایا درێژی شەپۆلی ڕووناکی دەگۆڕێت کاتێك لە بۆشاییەوە بچێتە شووشە ئەگەر ( $n_{\text{هەوا}} = 1$ ) ( $n_{\text{شووشە}} > 1$ ) وە ئایا خێراییەکەی دەگۆڕێت؟ وە لەرەلەرەکەی دەگۆڕێت؟

**3.** پەیوەندی نێوان خێرایی ڕووناکی لە ناوەندی ڕوون و هاوکۆلکەی شکانەوەی چی یە؟

**4.** بۆچی جۆگەیەکی ئاو هەردەم وا دەردەکەوێت کە قوڵیەکەی کەمترە لە قوڵیە ڕاستەقینەکەی؟

**5.** ئەو مەرجانە چین کە پێویستە هەبن بۆ ئەوەی شکانەوە ڕووبدات؟

### پرسیار دەربارەی چەمکەکان

**6.** دوو تیشکی ڕووناکی $x$ و $y$ بە دوو ڕەنگی جیاواز کەوتنە سەر ئاوێزەیەك تیشکی $x$ زیاتر لا دەدات لە $y$. کامیان خێرایی کەمترە لە ناو ئاوێزەکەدا؟

**7.** بۆچی سەوڵی بەلەم بە شێوەی چەماوە دەردەکەوێت کاتێك بە شێکی لەناو ئاودایە؟

**8.** برادەرەکەت پارچە کانزایەك هەڵدەداتە ناو ئاوی گۆمێك. چاوت بنوقێنە و خۆت نقوم کەو مەلەبکە لە لێواری ئاوەکە بەرەو ئاڕاستەی ئەو شوێنەی کە پارچە کانزاکەت تێدا دیوە. کاتێك دەگەیتە بنی گۆمەکە ئایا پارچە کانزاکە لە پێشتەوەیە یان لە دواتەوەیە؟

**9.** دەتوانرێت ڕووی ئاوێك کە ($n = 1.33$) لە کوپێکی ڕوون دایە بە چاوی ئاسایی ببینرێت بەڵام ناتوانرێت ڕووی هیلیۆمی شل بووە ($n = 1.03$) لەهەمان کوپ بە چاوی ئاسایی ببینی ئەمە لێکبدەرەوە؟

### پرسیارەکانی ڕاهێنان

**بۆ شیکاری پرسیارەکانی 10-14 سەیری نموونەی 6 (أ) لا 150 بکە**

**10.** تیشکێکی ڕووناکی بە گۆشەی لێدان $42.3°$ لە هەواوە دەکەوێتە سەر ئاو، ئەوا گۆشەی شکانەوە لە ئاوەکە هەژمێربکە.

**11.** تیشکێکی ڕووناکی بە گۆشەی $36°$ لەگەڵ ئەستووندا دەکەوێتە سەر ڕووی ئاوی کوپێك ئایا گۆشەی نێوان تیشکی شکاوەو ئەستونەکە چەندە؟

**12.** گورزە ڕووناکیەکی تەسك لە ڕەنگی زەرد کە پەیدا دەبێت لە گڵۆپێکی سۆدیۆمی درەوشاوە ($\lambda_o = 589$ nm) لە هەواوە دەکەوێتە سەر ڕووی ئاوێك بە گۆشەی $\theta_i = 35.0°$ ئایا گۆشەی شکانەوە $\theta_r$ چەندە؟

**13.** تیشکێکی ڕووناکی لە هەواوە کەوتە سەر پارچە شووشەیەك بەگۆشەی لێدانی $30.0°$ لەگەڵ ئەستوونەکە ئەگەر ئەستووری شووشەکە $2.00$ cm بێت وە هاوکۆلکەی شکانەوەی $n = 1.50$ بێت بە دوای ڕێڕەوی تیشکەکە بکەوە لە ناو شووشەکەدا وە گۆشەی لێدان و شکانەوە لەهەر ڕوویەك بدۆزەرەوە؟

**14.** ئەو تیشکەی کە لەم وێنەیەی خوارەوەدا ڕوون کراوەتەوە گۆشەی $20.0°$ ی دروست کردووە لەگەڵ ئەستوونەکەی سەر ڕووە جیاکەرەوەکەی نێوان زەیتەکە و ئاوەکە ئەوا هەردوو گۆشەی $\theta_1$ و $\theta_2$ بدۆزەرەوە ئەگەر زانیت کە $n = 1.48$ بۆ زەیت.



## هاوێنە تەنکەکان

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**15.** کام لە هاوێنەکان دەتوانن تیشکی خۆر کۆ بکەنەوە.

**16.** بۆچی وێنە بۆ تەنێك دروست نابێت کە لە تیشکۆی هاوێنکۆیەکدا دانرابێت.

**17.** وادابنێ وێنەیەك بە هۆی هاوێنکۆیەك دروستبوو بۆ تەنێك. لە کام باردا وێنەی تەنەکە:

أ. هەڵگەراوەیە؟

ب. هەڵنەگەراویە؟

جـ. ڕاستەقینەیە؟

د. خەیاڵییە؟

هـ. گەورەترە لە تەن؟

و. بچوکترە لە تەن؟

**18.** وەڵامەکەت لە سەر لقەکانی (أ) تا (و) دووبارە بکەرەوە لە پرسیاری 17 . بەڵام ئەم جارەیان بەبەکارهێنانی هاوێنپەرت.

**19.** دەقی ئەمەی خوارەوە باس بکە: تیشکۆی هاوینکۆ بریتییە لە خاڵی دروستبوونی وێنەی تەنێك کە لە دووریەکی بێ کۆتادابێت. بەهۆی ئەم دەقەوە دەتوانی پشت بە ڕێگەیەکی خێرا ببەستی بۆ دیاریکردنی دوورە تیشکۆی هاوێنکۆ؟

### پرسیار لەسەر چەمکەکان

**20.** ئەگەر هاوێنکۆیەکی شووشە لە ئاودا نقوم بکرێت، ئایا دوورە تیشکۆکەی زیاد یان کەمدەکات بەبەراوردکردنی لەگەڵ بونی لە هەوادا؟

**21.** بۆ ئەوەی بتوانی وێنەی سلایدێك بە هەڵنەگەڕاوەی لەسەر شاشەی ئۆڤەرهێدێك over head ببینی ئەوا پێویستە سلایدەکە بە شێوەیەکی هەڵگەڕاوە لەسەر ئۆڤەرهێدەکە دابنرێ ئایا جۆری هاوێنەی ئۆڤەرهێدەکە چییە؟ ئایا سلایدەکە لە ناو دوورە تیشکۆیە یان لە دەرەوەیەتی؟

**22.** ئەگەر میکرۆسکۆبێکی ناسادە لە دوو هاوێنکۆ پێکهاتبێ، لەبەرچی هێشتا وێنەیەکی هەڵگەراوەت دەستدەکەوێت؟

**23.** ڕۆمانێکی جیهانی باس لەوە دەکات هاوێنەیەکی گەورەکەر لە پارچە سەهۆڵ دروست کراو ئەتوانێ تیشکی خۆر لە تیشکۆکەیدا چڕ بکاتەوە بۆ ڕووداوی ئاگر کەوتنەوە ئایا ئەمە دەکرێت؟

### پرسیارەکانی ڕاهێنان

**بۆشیکاری پرسیارەکانی 24-26 سەیری نموونەی 6 (ب)لا 158 بکە**

**24.** تەنێك لەبەردەم هاوێنپەرتێك دانرا دوورە تیشکۆی 20.0 cm دووری وێنەکە لە هاوێنەکەوە چەندە؟ گەورەکردن چەندە؟ سیفەتی وێنەکە دیاری بکە ئایا وێنەکە خەیاڵیە یان ڕاستەقینەیە بۆ هەریەك لەم دووریانەی خوارەوە بۆ تەنە دانراوەکە؟

أ. 40.0 cm

ب. 20.0 cm

جـ. 10.0 cm

**25.** کەسێك سەیری بەردێکی بەنرخ دەکات بە هاوێنکۆیەك دوورە تیشکۆکەی 12.5 cm ، ئەوا وێنەیەکی خەیاڵی لە دووری 20.0 cm لە هاوێنەکەوە بۆ دروست بوو. گەورەکردن چەندە؟ ئایا وێنەکە هەڵنەگەڕاوەیە یان هەڵگەراوەیە؟

**26.** تەنێك لەبەردەم هاوێنکۆیەك دانرا دوورە تیشکۆکەی 20.0 cm بۆ هەر دووریەك بۆ تەنەکە لەم دووریانەی خوارەوە لە هاوێنەکەوە دووری وێنەکە و گەورەکردن بدۆزەرەوە؟ و سیفەتەکانی وێنەکە دیاریبکە.

أ. 40.0 cm

ب. 10.0 cm

## دیاردەکانی ڕووناکی

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**27.** ئایا دەتوانرێ دانەوەی تەواوەتی ناوەکی ڕوودات کاتی تێپەڕبوونی ڕووناکی لە هەواوە بۆ ئاو؟ ئەمە لێك بدەرەوە.

**28.** مەرجە پێویستەکان بۆ وەدەستهێنانی دیاریدەی تراویلکە چین؟

**29.** لە بەرچی ڕەنگی سوور لەسەرەوەی پەلکە زێرینە دەبینرێ و ڕەنگی بنەوشەیی لە ژێرەوەی ؟

**30.** جۆرەکانی (لێڵ )ی لەم بارانەی خوارەوەدا دیاریبکە؟

أ. بینینی ڕەنگی سور لە لاکانی وێنەیەکی دیاریکراو.

ب. ناتوانرێ ووردببیتەوە لە چەقە بەشی وێنەیەك

جـ. ناتوانرێ بەشی دەرەوەی وێنەیەك بەڕوون و ئاشکرا ببینرێت.

د. گەورەکردنی بەشی ناوەڕاستی وێنەیەك زیاتر لە بەشی دەرەوەی.

## پرسیار دەربارەی چەمکەکان

**31.** تیشکێکی لێزەر ڕێڕەوێکی چەماوە دەگرێتە بەر کاتێك بە گیراوەیەکی شەکری ناچوونیەکدا تێپەڕ دەکرێت، ئەمە لێك بدەرەوە.

**32.** وێنەی بەلەمێکی سەر ئاو کەوتوو لەسەر ڕووی ئاوێکی سارد لە ڕۆژێکی گەرمدا وا دەردەکەوێت کە دەکەوێتە سەروی شوێنی بەلەمەکەوە. ئەمە لێکبدەوە؟

**33.** لەبەرچی بەهۆی ئاوێنە لێڵ ڕەنگی پەیدا نابێت؟

**34.** هۆی دەرچوونی چەند ڕەنگێکی جیاواز چیە لە پارچە ئەڵماسێکدا کاتێك ڕووناکیەکی سپی دەکەوێتە سەر؟

## پرسیارەکانی ڕاهێنان

**بۆ شیکاری پرسیارەکانی 35-37 سەیری نموونەی 6 (ج) لا 165بکە**

**35.** گۆشەی مۆڵەقەی ڕووناکی تێپەر بوو لە گلیسرینەوە بۆ هەوا بدۆزەرەوە؟

**36.** وا دابنێ $\lambda = 589$ nm گۆشەی موڵەقەی هەریەك لەم مادانە بدۆزەوە کە هەوا دەوری داون:

أ. زرگۆنیۆم ب. فلوریت

ج. سەهۆڵ.

**37.** تیشکێکی ڕووناکی لە هەواوە دەچێتە ناو ئاوێزەیەك کە لە شووشەی ئاسایی دروستکراوە ($n = 1.52$) لە ڕێی ئەو ڕووەی کە ڕوونکراوەتەوە لە وێنەکەدا ئایا تیشکەکە دەردەچێت لە ڕووی بەرامبەردا یان دەدرێتەوە بە تەواوەتی بۆ ناوەوە؟ وێنەی هێلکاری ڕێڕەوی تیشکەکان ڕوونبکەرەوە؟




## پێداچوونەوەی گشتی

**38.** هەردوو گۆشەی لێدان و شکانەوەی تیشکێك کە لە هەواوە دەچێتە ناو مادەیەك کە هاوکۆلکەی شکانەوەی گەورەترە بریتین لە $63.5^\circ$ و $42.9^\circ$ یەك لە دواییەك ئایا هاوکۆلکەی شکانەوەی مادەکە چەندە؟

**39.** یەکێك تیشکێکی ڕووناکی ئاراستەی هاوڕێکەی دەکات کە لە ژێر ئاودا مەلە ئەکات ئەگەر گۆشەی نێوان ئەو تیشکەی ناو ئاوەکە و (شکانەوەکە) و ستونی کێشراو لە سەر ڕووەکە $36.2^\circ$ بێت ئایا گۆشەی لێدان چەندە؟

**40.** هاوکۆلکەی شکانەوەی مادەیەك چەندە کە خێرایی ڕووناکی تیایدا $1.85 \times 10^8$ m/s ؟ سەیری **خشتەی 1-6** هاوکۆلکەکانی شکانەوە بکە بۆ ناسینەوەی مادەکە.

**41.** تیشکێکی ڕووناکی لە شووشەیەکی سینیەوە دەکەوێتە سەر ڕووی ئاوێك بە گۆشەی لێدانی $28.7^\circ$ .

أ. گۆشەی شکانەوە چەندە؟

ب. ئایا گۆشەی لێدان چەندە بۆ ئەوەی گۆشەی شکانەوە $90.0^\circ$ بێت؟

**42.** دووره تیشکۆی هاوێنکۆیەکی گەورەکردن 15.0 cm ئایا دووری نێوان هاوێنەکە و دراوێکی کانزایی چەندە تاوەکو وێنەیەکمان دەست کەوێت گەورەکردنەکەی +2.00 بێت؟

**43.** قەبارەی وێنەی پولێکی پۆستەی هەرێمی کوردستانی عیراق کاتێك بە هاوێنکۆیەك سەیری دەکرێت 1.50 هێندەی قەبارەی ئاسایی پولەکەیە، ئایا دووره تیشکۆی هاوێنەکە چەندە ئەگەر دووری نێوان پولەکەو هاوێنەکە 2.84 cm بێت.

**44.** هاوێنپەرتێك بەکاردێت بۆ دروستکردنی وێنەیەکی خەیاڵی بۆ تەنێك دووری تەنەکە لە هاوێنپەرتەوە 80.0 cm وە دووری وێنەکە لە هاوێنەکەوە 40.0 cm ئایا دووره تیشکۆی هاوێنەکە چەندە؟

**45.** سلایدێکی تاقیگە لە بەرامبەر هاوێنکۆی مایکرۆسکۆپێك دانرا کە دووره تیشکۆکەی 2.44 cm بێت وێنەیەك بۆ سلایدەکە دروست دەبێت لە دووری 12.9 cm لە سلایدەکەوە.

أ. دووری هاوێنەکە چەندە لە سلایدەکە (تەنەکە) ئەگەر وێنەکە راستەقینەبێت؟

ب. دوری هاوێنەکە چەندە لە سلایدەکە ئەگەر وێنەکە خەیاڵی بێت؟

**46.** لە چ دوورییەك پێویستە تەنێك دابنرێت بۆ ئەوەی وێنەیەکی بۆ دروستبێت لە دووری 30.0 cm لە هاوێنپەرتێك کە دووره تیشکۆکەی 40.0 cm ؟ گەورەکردن چەندە؟

**47.** هاوکۆلکەی شکانەوەی ڕەنگی سور لە ئاودا 1.331 و هاوکۆلکەی شکانەوەی ڕەنگی شین 1.340 ئەگەر تیشکێکی ڕووناکی سپی لە هەواوە بچێتە ناو ئاو بە گۆشەی لێدانی $83.0^\circ$ ئایا هەریەك لە گۆشەی شکانەوەی ڕەنگی سوور و ڕەنگی شین چەندە؟

**48.** تیشکێکی رووناکی لە هەواوە دەکەوێتە سەر رووی برێك زەیت بە گۆشە لێدانی $23.1^{o}$ لەگەڵ ئەستونی کیشراو لە سەررووەکە ئەگەر خێرایی رووناکی لە زەیتەکەدا $2.17 \times 10^{8}$ m/s بێت ئایا گۆشەی شکانەوە چەندە؟ (تێبینی پێناسەی هاوکۆلکەی شکانەوەت لە یادبێت).

**49.** تیشکێکی ڕوناکی لە هەواوە بەر ڕووی شلەیەك دەکەوێت بە گۆشەی لێدانی $30.0^{o}$ کە گۆشەی شکانەوەکەی $22.0^{o}$ بێت ئایا گۆشەی مۆڵەقە چەندە ئەگەر تیشکەکە لە شلەکەوە بچێتە هەوا؟

**50.** یاساکانی دانەوە و شکانەوە بۆ رووناکی و دەنگ هەمان یاسان. خێرایی دەنگ لە هەوا 340 m/s وە لە ئاودا 1510 m/s ئەگەر شەپۆلێکی دەنگی بڵاوبووە لە هەواوە، بکەوێتە سەر ڕووی ئاوێکی ئاسۆیی بە گۆشەی لێدانی $12.0^{o}$ ئایا گۆشەی شکانەوە چەندە؟

**51.** تیشکێکی رووناکی لە هەواوە دەکەویتە سەر پارچە سەهۆڵێك بە گۆشەی لێدانی $40.0^{o}$ لەگەڵ ستوندا ، بەشێك لە رووناکیەکە دەدرێتەوە و بەشێکی تری دەشکێتەوە، گۆشەی نێوان تیشکی لێدەر و تیشکی شکاوە بدۆزەرەوە.

**52.** دووری نێوان تەن و هاوێنکۆیەك دە ئەوەندەی دوورە تیشکۆی هاوێنەکەیە. دووری وێنەکە لە هاوێنەکەوە چەندە؟وەڵامەکەت بە پێی دوورە تیشکۆ روون بکەرەوە.

**53.** لوولەیەکی ڕیشاڵە بینایەکان هاوکۆلکەی شکانەوەکەی 1.53 ، کەمترین گۆشەی لێدان لەناو لولەکەدا چەندە بۆ ئەوەی دانەوەی تەواوەتی ناوەکی ڕوویدات گەر لولەکە دەورەدراوە بێ بە:

أ. هەوا؟

ب. ئاو؟




**54.** تیشکێکی رووناکی لە هەواوە کەوتە سەر ناوەڕاستی ڕووی ئاوێزەیەکی لایەکسان $n$=1.50 بە گۆشەی $30^{o}$ لەگەڵ ڕووی ئاوێزەکەدا، وەك لە وێنەکەی سەرەوەدا دیارە

أ. ڕێڕەوی تیشکی ڕووناکیەکە تەواو بکە لەناو شووشەکەدا وە گۆشەی لێدانی تیشکەکە لە بنکەی ئاوێزەکەدا بدۆزەرەوە؟

ب.ئایا تیشکەکە لە بنکەی ئاوێزەکە دەردەچێت یان دانەوەی تەواوەتی بۆ ناوەوە ڕوودەدات؟

**55.** ڕووناکیەك دەکەوێتە سەر ڕووی ئاوێزەیەك هاوکۆلکەی شکانەوەی $n = 1.8$ وەك لە وێنەکەی خوارەوەدا، ئاوێزەکە بە شلگازێکی دیاریکراو دەورەدراوە. گەورەترین هاوکۆلکەی شکانەوەی شلگازەکە چەندە کە ڕێگە بە دانەوەی تەواوەتی لە ناو ئاوێزەکەدا دەدات؟




**56.** لوولەیەك لە ڕیشاڵە بینایەکان لە مادەیەکی سەرەکی دروست کراوە و ڕووی دەرەوەی ڕووپۆش کراوە، هاوکۆلکەی شکانەوەی ناوچەی ناوەوەی لوولەکە 1.60 ، ئەگەر هەموو تیشکەکانی ناو لوولەکەکە بەدانەوەیەکی تەواوەتی ناوەکی بدرێنەوە کاتێك گۆشەی لێدانەکەی لە $59.5^{o}$ تێپەربێت. ئایا هاوکۆلکەی شکانەوەی ماددە ڕووکەشەکە چەندە؟

**57.** دۆزەرەوەیەکی ڕۆشنکەرەوە لە بنی حەوزێکی مەلەکردنەوە کە قوڵایەکەی 4.00 m ڕووناکیەکەی لێوە دەردەچێ بۆ سەرەوە بە مەرجێك لە خاڵێکدا بەر ڕووی ئاوەکە دەکەوێت کە 2.00 m دوورە لەو خاڵەی یەکسەر دەکەویتە سەر دۆزەرەوەکە ئایا گۆشەی نێوان تیشکی دەرچوو بۆ هەوا و ڕووی ئاوەکە چەندە؟

**58.** شوێنی ژێر دەریاییەك لە قوڵای 115 m لە ژێر ئاوەوەیە، وە دووریە ئاسۆیەکەی لە لێواری دەریاوە (325 m)ە، تیشکێکی لێزەر لەژێر دەریاییەکەوە دەرچوو بۆ ئەوەی بەر ڕووی ئاوەکە بکەوێت لە خاڵێکدا کە 205 m لە قەراغەکەوە دوورە، ئەگەر تیشکەکە گەیشتە ڕووی باڵەخانەیەك لە لێواری ئاوەکەی، ئایا بەرزی باڵەخانەکە چەندە؟ ( تێبینی: بۆ زانینی گۆشەی لێدان، وا دابنێ سێ گۆشەیەکی گۆشە وەستاو دروست بووە لە تیشکی ڕووناکییەکەو هێڵە ئاسۆیە کێشراوەکەی سەر ڕووی ژێر دەریاییەکە و هێڵی ستونی خەیاڵی کێشراو لە خاڵی بەرکەوتنی بە ئاوەکە بە ئاڕاستەی بنکەی دەریاکە).

**59.** تیشکێکی لێزەر لە هەواوە دەردەچێ بۆ ئەوەی بەر ناوەڕاستی یەکێك لە لاکانی پارچەی مادەیەك بکەوێت کە هاوکۆلکەی شکانەوەکەی 1.48 وەك لە وێنەکەی خوارەوەدا دیارە، ژمارەی ئەو دانەوە تەواوە ناوخۆیانە چەندە پێش دەرچوونی تیشکە لێزەرەکە لە لاکەی بەرامبەری پارچە مادەکە.




**60.** وێنەگرێك کامیرەکەی بەکاردەهێنێ کە دوورە تیشکۆی هاوێنەکەی 4.80 cm هەوڵ دەدا وێنەی چەند دارێکی کۆن لە دارستانێك بگرێت، دەیەوێ هاوێنەکە ئاڕاستەی ئەم دارە زۆر کۆنانە بکات لە دووری 10.0 m .

أ. پێویستە دووری نێوان هاوێنە و فلیمی کامیرەکە چەند بێت بۆ دەستکەوتنی وێنەیەکی ڕوون و ئاشکرا.

ب. بۆچ دوریەك کامیراکە دەبێ: بجوولێنرێت بۆ وێنەگرتنی دارێکی تر لە دووری 1.75 m تاکو وێنەکە ڕوون و ئاشکرا بێت؟

**61.** دووری نێوان پێشەوەی چاوو پشتەوەی نزیکەی 1.90 cm بێت. ئەگەر لە تواناد ا بێت و ێنەی کتێبێك بە ڕوونی ببینی لە دووری 35.0 cm لە چاوەکانتەوە ئایا دوورە تیشکۆی سیستمی کۆرنیەی چاو چەندە؟

**62.** وا دابنێ کە لە پەنجەرەیەکەوە سەیری هاورێکەت دەکەیت کە بە ڕوونی لە دووری 15.0 m وە دەیبینیت، ئایا پێویستە ماسولکەکانی دوو هاوێنەکەی چاوەکانت بۆ چ دوورە تیشکۆیەك کرژ بکەیتەوە بۆ بینێنی وێنەیەکی ڕوون؟ وە لەیادت بێت کە دووری نێوان پێشەوەی چاو و دواوەی (پشتەوەی) نزیکەی 1.90 cm .

## پرۆژە و ڕاپۆرتەکان

**1** سەردانی پزیشکێکی نەخۆشیەکانی چاو یان پسپۆر لە چاویلکەسازی پزیشکی دا بکەو ئەو ئامێرو دەزگایانەی کە بەکاریان دەهێنێت زانیاریان لە بارەوە وەربگرە وە هەر یەك لەم ئامێرانە دەتوانن کام جۆری نەخۆشیەکانی چاو دیاری بکەن یا چارەسەری بکەن؟

**2.** لە مامۆستای زیندەوەرزانی خۆت یارمەتی وەربگرە بۆ بەکارهێنانی میکرۆسکۆب و سلایدی تاقیگە، وە پێکهێنەرە بنچینەییەکان بناسە کە بریتین لە (هاوێنەکان و ئاوێنەکان و تەنەکان وە سەرچاوە ڕووناکییەکان) وە دووگمەکانی ڕێکخستن و دەست بەسەراگرتن. لە ڕێگەی کارکردنی ئەم دووگمانە تێبگە لە گەورەکردنە جیاجیاکاندا و لەگەڵ وردی پێویست بۆ دەستکەوتنی وێنەیەکی ڕوون. وێنەی هێڵکاری بۆ ئەوەی دەیبینیت بکێشە و لە مایکرۆسکۆبەکە و قەبارەی وێنەکە کە دەیبینی بخەمڵێنە و قەبارەی ڕاستەقینەکەی خانە و شانە بچووکەکان بپێوە کە تێبینی دەکەیت، ئایا تا چەند نرخە خەملێنراوەکەی تۆ لەگەڵ گەورەکردنە دیاری کراوەکەی سەر مایکرۆسکۆبەکە لە یەکترەوە نزیك دەبن؟

**3.** تەلسکۆبێکی تایبەت بۆ خۆت دروست بکە بەبەکارهێنانی دوو بۆری (یەکێکیان تیرەکەی بچووکترە لەوەی تریان تا لە ناو یەکتردا بە ئاسانی بخلیسکێن) وە دوو هاوێنە و مەقەبای شێوە پەپکە بۆ ڕاگرتنی دوو هاوێنەکە، شریتی لکێنەر بەکاربهێنە، ئامێرەکەت تاقیبکەرەوە لە شەودا. وە هەوڵ بدە هاوێنەی جیاجیا بەکاربهێنیت بۆ پێشخستنی کاری ئامێرەکە. ئەنجامەکانت بنووسە و هەروەها ڕاپۆرتێك لەسەر چۆنیەتی دروستکردنی ئامێرەکەت بنووسە.

**4.** لێکۆڵینەوەیەك بکە لەسەر گواستنەوەی نیشانەی تەلەفزیۆنی و تەلەفۆن و بێتەل بۆ مەودای دوور بەبەکارهێنانی ریشاڵە بینایەکان. وە زانیاریەکان وەربگرە لە کۆمپانیاکانی تەلەفۆن و تەلەفزیۆن و بێتەل، ریشاڵە بینایەکان لە چ ماددەیەك دروستدەکرێن؟ وەگرنگترین سیفەتەکانی چییە؟ ئایا مەرج هەیە بۆ جۆری ئەو ڕووناکیەی کە بەناویاندا دەگوازرێتەوە؟ تایبەتمەندیەکانی تەکنیکی ریشاڵە بینایەکان بۆ بڵاوکردنەوە چین؟ بڵاوکراوەیەك یان فلیمێکی ڤیدیۆی بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم تەکنیکە بۆ بەکارهێنانی ئامادە بکە.

# بـــــەشـــــی 7

# ڕەنگ و جەمسەرگری
## *Color and Polarization*



ڕەنگی سپی لە ڕەنگە بنەڕەتییەکان پێکهاتووە، بە تێکەڵکردنی ڕەنگە بنەڕەتییەکان ڕەنگی سپی دەست دەکەوێت. وە ڕەنگی سپی سیفەتی تری هەیە ئەویش کە بەهۆی لەوحی جەمسەرگری تایبەت دەتوانرێت بپاڵێورێت. وێنەی تەلەفزیۆنی ڕەنگاوڕەنگ یەکێکە لە بەجێهێنانەکانی تێکەڵکردنی ڕەنگەکان دەنکۆڵەکانی بۆیەی شاشەی تەلەفزیۆن دەدرەوشێنەوە بە یەکێك لە ڕەنگە بنەڕەتیەکان کاتێك ئەلکترۆنیان بەردەکەوێت.

## ئەوەی کە پێشبینی بەدیهێنانی دەکرێت

لەم بەشەدا بەسیفەتەکانی ڕەنگ و بە جێهینانەکانی ئاشنا دەبیت، لەگەڵ جەمسەرگری شەپۆڵەکانی ڕووناکی و جۆرەکانی جەمسەرگیری.

## گرنگییەکەی چییە:

گرنگی ڕەنگەکان لە بەکارهێنانیان لە پێکهاتە کیمیاوییەکان و تێکەڵکردنی بۆیەکان دەردەکەوێ. وەجەمسەرگری گرنگیەکی تری هەیە لە دروستکردنی لەوحی جەمسەرگیر بۆ کەمکردنەوەی توندی ڕۆشنایی ڕووناکی.

## ناوەڕۆکی بەشی 7

بەندی 1-7

# ڕەنگ Color

## 1-7 ئامانجەکان

- چۆنێتی کارتێکردنی ڕووناکی بەڕەنگە بنەڕەتییەکان دەناسێنێ.
- چۆنێتی کارتێکردنی ڕەنگی بۆیە لە ڕەنگی ڕووناکی دراوە دەناسێنێ.

## تێکەڵکردنی ڕەنگەکان:

هەندێك جار وا هەست دەکەین کە ڕەنگی تەنێك جیاواز دەبێت بەپێی مەرجەکانی ڕووناککردنەوەکە. ئەم جیاوازیانە بەهۆی جیاوازی لە خاسیەتەکانی دانەوە و هەڵمژینی تەنە ڕووناك کەرەوەکەدا دەگۆڕێت.

تا ئێستا ئێمە وامان داناوە کە تەنەکان یان سافن و لە ئاوێنە دەچن و هەموو ڕووناکیەکە بە شێوەیەکی ڕێك وپێك دەدەنەوە، یان وامان داناوە کە تەنی زبرن و ڕووناکیەکە بە هەموو ئاراستەکان بڵاودەکەنەوە. بەڵام هەر وەك لە بەشی **5-2** دا، ڕوون کراوەتەوە تەنەکان هەندێك لەو درێژی شەپۆلانە هەڵدەمژن کە دەکەوێتە سەریان و بەشەکەی تریشی دەدەنەوە. ڕەنگی تەنێك لەسەر ئەو درێژی شەپۆلانە بەندە کە لێیانەوە دەردەچێت، یان کە لێیانەوە دەدرێتەوە **وێنەی 1-7**.

ئەگەر هەموو درێژە شەپۆلە کەوتوەکانی سەر تەنێك بدرێنەوە ئەوا ڕەنگی تەنەکە لە ڕەنگی ئەو ڕووناکیە دەچێت کە کەوتووەتە سەری، ئەوەش وادەکات کەڕەنگی تەنەکە سپییەکی درەوشاوە بێت. بەڵام ئەو تەنەی کە ڕەنگێکی دیاریکراوی هەیە وەك گەڵا سەوزەکەی وێنەی **1-7** هەموو ڕەنگەکانی ڕووناکیە کەوتوەکە هەڵدەمژێت بێجگە لەو ڕەنگەی کە وەك هی خۆیەتی، هەروەها ئەو تەنەی کە هیچ ڕووناکیەك نەداتەوە ڕەش دەردەکەوێت. لە ڕاستیدا گەڵای درەختەکان سەوز دەردەکەون. تەنها لەو کاتانەدا کە ڕەنگە بۆیە کلۆرۆفیلییەکەی هەبێت. لە وەرزی پایزدا گەڵاکان بۆیە کلۆرۆفیلییەکەیان لەناو دەچێت بۆیە بەڕەنگی جیاجیا دەردەکەون کاتێك ڕووناك دەکرێنەوە.

### تێکەڵکردنی ڕەنگە بنەڕەتییەکان ڕەنگی سپی پێکدەهێنێت

لەبەر ئەوەی دەتوانین ڕووناکی سپی شیتەڵ بکەین بۆ ڕەنگە پێکهێنەرەکانی، دەشتوانین بڵێین کە تێکەڵکردنی ڕەنگە بنەڕەتییەکان ڕەنگی سپیمان دەداتێ یەکێك لە ڕێگەکانی بەدەست هێنانی ڕەنگی سپی بەکارهێنانی ئاوێزەیەکە بۆ دووبارە کۆکردنەوەی ڕەنگەکانە دوای ئەوەی بەهۆی ئاوێزەیەکی ترەوە ڕەنگەکانی لە یەکتر جیاکرابونەوە. ڕێگەیەکی تری بەدەست هێنانی ڕووناکی سپی بەندە بە تێکەڵکردنی ئەو ڕەنگانەی کە پێشتر بە ڕەنگ پاڵێوێکی سور وسەوز و شین دابرابوون، ئەو ڕەنگانە پێیاندەگوترێت ڕەنگە بنەڕەتییەکان. ئەوانەش بۆ ڕاستکردنەوەی ڕێژەی ڕەنگەکان و بەدەست هێنانی هەموو ڕەنگەکانی شەبەنگ بەکاردەهێنرێت.




**شێوەی 1-7**

گەڵای درەختەکە سەوز دەردەکەوێت کاتێك ڕووناکی سپی دەکەوێتە سەری چونکە بۆیە بنەڕەتییەکەی گەڵاکە تەنها ڕەنگی سەوز دەداتەوە.

کاتێك ئەو ڕەنگەی لە ڕەنگ پاڵێوە سورەکەوە دەرچووە تێکەڵ دەکرێت لەگەڵ ئەو ڕەنگەی لە ڕەنگ پاڵێوە سەوزەکەوە دەرچووە، پەڵەیەکی زەردمان دەست دەکەوێت. ئەگەر ڕەنگە زەردەکە لەگەڵ ڕەنگی شیندا تێکەڵ بکرێت ئاوا ئەو ڕەنگەی بەرهەم دێت ڕەنگی سپییە وەك لە **وێنەی 7-3** دادیارە. ئەگەر ڕەنگی زەرد ئەو ڕەنگەبێت کە پێویستە لەگەڵ ڕەنگی شین تێکەڵبکرێت بۆ ئەوەی ڕەنگی سپیمان دەست بکەوێت. ئەوا بە ڕەنگی زەرد دەگوترێت ڕەنگی تەواوکەری ڕەنگی شین. دەتوانین دوو ڕەنگی بنەڕەتی تێکەڵ بکەین بۆ ئەوەی ڕەنگێکی تەواوکەری ڕەنگی سێیەم بەدەست بهێنین وەك لە **خشتەی 7-1** دا.



**وێنەی 7-2**

تێکەڵکردنی هەموو دوو ڕەنگێکی بنەڕەتی لەیەکتر بڕینی دوو بازنەدا ڕەنگێکی تەواوکەر بۆ ڕەنگی بنەڕەتی سێیەم بەرهەم دێنێت.

یەکێك لە بەجێهێنانەکانی ڕەنگە بنەڕەتییە زیادکراوەکان بەکارهێنانیەتی لە هەندێك لە ئاوێتە کیمیاییەکاندا، بۆ بۆیەکردنی شووشە بە ڕەنگێکی دیاریکراو. ئاوێتەکانی ئاسن ڕەنگی سەوز بە شووشە دەدەن، بەڵام ئاوێتەکانی مەگنیسیۆم ڕەنگی شینی مەیلەو سور (ئەرخەوانی) دەدەن هەردوو ڕەنگە سەوز و شینە سورباوەکە دوو ڕەنگی تەواوکەری یەکترن بۆیە تێکەڵکردنیان بە ڕێژەی ڕاست ودروست ئاوێتەیەکمان دەداتێ کە هەردوو ڕەنگەکەی تیادا یەکسانە، لەبەر ئەوە شووشەکە بێڕەنگ دەردەچێت (ئاوی).

وێنەی ڕەنگاوڕەنگی تەلەفزیۆن یەکێکی ترە لە بەجێهێنانەکانی تێکەڵکردنی ڕەنگەکان، شاشەی تەلەفزیۆن لە دەنکۆڵەی بۆیەی بچووکی بریقەدار پێکدێت، کاتێك کەئەلەکترۆنیان بەردەکەوێت بەیەکێك لە ڕەنگەکان سور یان شین یان سەوز دەدرەوشێنەوە سەیری **وێنەی 7-3** بکە.

گۆڕانی توندی ڕووناکی دەنکۆڵە جیاوازەکان لە شوێنی جیاجیای وێنەکەدا وێنەیەکی ڕەنگاوڕەنگمان دەداتێ لە هەمان کاتدا مرۆڤ دەتوانێت ڕەنگە جیاوازەکان لە یەکتری جیابکاتەوە لە ڕێگەی سێ جۆر کەشفکەری «وەرگرەی» ڕەنگەکانەوە کە لە چاودا هەن، هەر یەکە لەوانە پێیاندەگوترێت قوچەکە شانەکە، دەتوانێت جیاوازی لە نێوان ڕەنگەکانی سورو سەوز و شیندا بکات. ڕووناکی بە درێژییە شەپۆلە جیاوازەکانی هانی پێکهاتەیەکی دیاری کراو لەو وەرگرانە دەدات بە شێوەیەك ڕوبەرێکی فراوانی ڕەنگەکان ببینین.



**وێنەی 7-3**

ڕووناککردنەوەی دەنکۆڵە بۆیە سوور و سەوز و شینەکە لە شاشەی تەلەفزیۆنی ڕەنگاو ڕەنگدا بە شێوەیەك ڕێکخراوە، دەتوانرێت هەموو ڕەنگەکان لەیەك وێنەدا لە دوورییەکی دیاری کراوەوە ببینرێت.

**خشتەی 7-1 کۆکردنەوە ولێکدەرکردنی ڕەنگە بنەڕەتیەکان**

| ڕەنگەکان | کۆکردنەوەی ڕووناکی | لێدەرکردن (تێکەڵکردنی بۆیە) |
|---|---|---|
| سور | بنەڕەتی | تەواوکەری پیرۆزەییە |
| سەوز | بنەڕەتی | تەواوکەری (شینی مەیلەو سور) (ئەرخەوانی) |
| شین | بنەڕەتی | تەواوکەری زەردە |
| سەوزی تۆخ | تەواوکەری سورە | بنەڕەتی |
| ئەرخەوانی (شینی سورباو) | تەواکەری سەوزە | بنەڕەتی |
| زەرد | تەواوکەری شینە | بنەڕەتی |

# تێکەڵکردنی بۆیەکان

## کرداری کۆکردنەوەی بۆیەکان بە کرداری لێدەرکردنی ڕەنگەکان دادەنرێت

ئەگەر دوو ڕەنگی شین وزەرد تێکەڵبکرێت ئەوا ڕەنگی سپیمان دەست دەکەوێت. بەڵام ئەگەر بۆیەیەکی شین (وەك بۆیە یان کە تیرەیەکی ڕەنگاوڕەنگ). لەگەڵ بۆیەیەکی زەرد تێکەڵبکرێت، ئەوا ڕەنگە پێکهاتووەکە سەوز دەبێت نەك سپی. جیاوازییەکە بە هۆی ئەوەوە پەیدا دەبێت ڕەنگی دەنکۆڵە بۆیەکان بەندە لەسەر ڕەنگی ئەو ڕووناکییەی کە هەڵیدەمژێت یان لەو ڕەنگەی کە لە ڕووناکییە کەوتووەکە دەردەکرێت.

بۆ نموونە دەنکۆڵە زەردەکان هەردوو ڕەنگی شین و بنەوشی لە ڕووناکی سپی هەڵدەمژێت (دەردەکات) لە کاتێکدا ڕەنگەکانی سور و زەردو پرتەقاڵی وسەوز دەداتەوە، بەڵام دەنکۆڵە شینەکان ڕەنگەکانی سورو زەرد وپرتەقاڵی لە ڕەنگی سپی دەردەکەن و سەوز و شین وبنەوشەیی دەدەنەوە، لەبەر ئەوە کاتێك دەنکۆڵە زەردو شینەکان تێکەڵ دەکرێن تەنها ڕەنگی سەوز دەدرێتەوە.



**وێنەی 7-4**
کاتێك دوو ڕەنگی بنەڕەتی تێکەڵ دەکرێت ئەوا ڕەنگە تەواوکەرەکەی ڕەنگی سێیەم پەیدادەبێت.

کاتێك دەنکۆڵە بۆیە ڕەنگ جیاوازەکان تێکەڵدەکرێت هەر جۆرێك لە دەنکۆڵەکان هەندێك ڕەنگ لە ڕووناکی سپی هەڵدەمژن و ڕەنگە بەرهەم هاتووەکە لەسەر ئەو لەرەلەرانە بەندە کە هەڵنەمژراون، بۆیەی زەردو ئەرخەوانی (شینی سورباو) و پێرۆزەیی (سەوزی تۆخ) بۆیەی بنەڕەتین وەك لە **خشتەی 7-1** دا دیارە، کاتێك دوو ڕەنگی بنەڕەتی تێکەڵدەکرێت ئەوا بۆیەیەکی بنەڕەتی پەیدا دەبێت: کاتێك هەر سێ بۆیە بنەڕەتییەکە تێکەڵ دەکرێت بەڕێژەیی گونجاو ئەوا هەموو ڕەنگەکان لە ڕەنگی سپی دەردەکرێت واتە تێکەڵە بەرهەم هاتوکە ڕەش دەبێت وەك لە **وێنەی 7-4** دا دیارە.

تێکەڵکردنی بۆیەی زەرد لەگەڵ شینە تەواوکەرەکەی دا بۆیەی ڕەش پێك دێنن. لە کاتێکدا ئەگەر ڕەنگی شین و زەرد تێکەڵبکرابایە ئەوە ڕەنگی سەوز بەرهەمدەهات. جیاوازی لە نێوان ئەو دوبارەدا بەهۆی بەکارهێنانی بەربڵاوی ناوی ڕەنگەکان ڕووندەکرێتەوە. ئەو دەنکۆڵە شینەی کە بۆ بۆیە زەردەکە زیادکرا بۆ بەدەستهێنانی ڕەنگی سەوز، شینی پوخت نەبوو، ئەگەر وا بوایە ئەوا تەنها ڕەنگی شینی دەدایەوە بەڵام دەنگۆڵە زەردەکە پوخت بوەو تەنها زەردی داوەتەوە. لەبەر ئەوەی زۆربەی دەنکۆڵەکان کە لە بۆیەدا هەن تێکەڵەی ماددەی جیاوازن لەبەر ئەوە ڕووناکی ناوچەکانی دەوروبەری خۆی دەداتەوە لە شەبەنگی بینراودا. لەبەر ئەوەی سیفەتەکانی ئەو ڕەنگانە نەزانراون کە دەنکۆڵەکان هەڵیاندەمژن، بۆیە پێشبینی کردنی ئەو ڕەنگانەی بەرهەم دێن لە تێکەڵە جیاوازەکانەوە کارێکی گران دەبێت.



## فیزیا و ژیان



**1. ڕەنگەکانی بەتانی** ڕەنگی قاوەیی تێکەڵەیەکە لە ڕەنگی زەرد و کەمێك لە سورو سەوز. ئەگەر تیشکێکی ڕووناکی سور بکەوێتە سەر بەتانیەکی خوری قاوەیی ئایا ڕەنگەکەی چۆن دەردەکەوێت؟ ئایا تۆختر یان کاڵتر دەردەکەوێت ئەگەر بەراوردی بکەی بەو بارە کە بە ڕووناکی سپی ڕووناك دەکرێتەوە؟ وەڵامەکەت ڕوونبکەرەوە.

**2. چاپەمەنی شین** ئەگەر سەیری چاپکراوێکی شین لە سەر تەختێکی سپی بکەین لە ژێر ڕووناکی شیندا، ئایا دەتوانین چاپکراوەکە ببینین؟ ئەگەر چاپکراوە شینەکە بە ڕووناکی زەرد ڕووناکبکرێتەوە چۆن دەردەکەوێت؟

## پێداچوونەوەی بەندی 1-7

**1.** هاوێنەی لایتێکی ڕووناکی ڕووکەش کرا بە شێوەیەك کە ڕێگە نەدات ڕەنگی زەردی پێیدا تێپەڕ ببێت. ئەگەر سەرچاوەی ڕووناکیەکە سپی بێت، ئایا ڕەنگی هاوێنەی لایتەکە چۆنە؟

**2.** خانویەك بۆیەکرا بە جۆریك تەنها ڕەنگی سورو شین دەداتەوە، بەڵام هەموو ڕەنگەکانی تر هەڵدەمژێت. خانووەکە بە چ ڕەنگێك دەردەکەوێ، ئەگەر بە ڕووناکی سپی ڕووناکبکرێتەوە؟ وەئەگەر بە ڕەنگی سوور ڕوناك کرایەوە چۆن دەردەکەوێت؟

**3.** **بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە:** ئەو بۆیە بنەڕەتییەکان چین کە هونەرمەندێك پێویستە تێکەڵیان بکات بۆ دەستکەوتنی ڕەنگی سەوزی زەردباو؟ ئەو ڕەنگە بنەڕەتییانە چین کە لێپرسراوی ڕووناکی لە شانۆیەك پێویستە تێکەڵیان بکات بە هۆی ڕووناکیەوە بۆ پەیداکردنی ڕەنگی سەوزی زەردباو؟

# بەندی 2-7

# جەمسەرگری شەپۆڵەکانی ڕووناکی
## *Polarization*

### 2-7 ئامانجەکان

- جۆرەکانی جەمسەرگری باس دەکات.
- ڕوونی دەکاتەوە چۆن ڕووناکی جەمسەرگیراوی هێڵی وەدەست دەهێنرێ هەروەها ڕوونی دەکاتەوە، چۆن پشکنینی بۆ دەکرێت.
- جەمسەرگری بەهۆی ئاوێزەی نیکۆڵەوە ڕوون دەکاتەوە.

لەوانەیە چاویلکەی هاوێنەداری جەمسەرگرت بینیبێ کە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی توندی ڕۆشنایی ڕووناکیەکە. سیفەتێکی ڕووناکی هەیە کە ڕێگە دەدات هەندێ لە ڕووناکییەکە بپاڵێورێت، بەهۆی هەندێ مادده کە لە پێکهاتەی هاوێنەکاندا هەیە.

لە شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکاندا بوارە کارەباییەکە ئەستوونە لەسەر هەریەکە لە بواری موگناتیسی و ئاڕاستەی بڵاوبوونەوەی شەپۆلەکە. ئەو ڕووناکیەی کە لەسەر چاوەی ئاسایی دەردەچێت لەو شەپۆلانە پێکدێت کە بوارە کارەبایەکانیان نارێکن و بە هەموو ئاڕاستەیەك بڵاودەبنەوە وەك لە **وێنەی 7-5** دادیارە.

ئەو ڕووناکیە لەم بارەدا پێیدەڵێن ڕووناکی جەمسەر نەگیراو. دەتوانرێت هەڵسوکەوت بکەین لەگەڵ بواری کارەبایی ڕووناکی جەمسەرنەگیراو وەك دوو پێکهێنەری شاوڵی و ئاسۆیی بواری لەراوە. چەند ڕێگایەك هەیە بۆ جیاکردنەوەی شەپۆلە کارەبایە لەراوە شاوڵیەکان لە شەپۆڵە لەراوە ئاسۆییەکان کە ئەمەش دەبێتە هۆی پەیداکردنی بوارێکی کارەبایی لەراوە لەیەك ئاستدا وەك لە **وێنەی 7-6** دا دیارە، شەپولی پەیدابوو **جەمسەر گیراوی هێڵیە** linear polarization . ڕووناکی ئاسایی جەمسەرگیر دەکرێ بە تێپەڕبوون یا بە دانەوە یا بە شکانەوەی دوو بەش.

### جەمسەرگری هێڵی

ڕیزبونێکی شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکانە بە جۆرێك کە بوارە کارەباییە لەراوەکانیان بەیەکتری تەریبن.

## جەمسەرگری ڕووناکی بەتێپەڕبوون

تێپەڕبوونی ڕووناکی جەمسەرنەگیراو بەناو بەللورەی ڕووندا دەبێتە هۆی جەمسەرگری هێڵی. ئاڕاستەی جەمسەرگری بواری کارەبایی دیاری دەکرێت بە شێوەی ڕیزبوونی گەردو گەردیلەکانی مادده بەللورییەکە.




**وێنەی 7-5**
لە بواری کارەبای لەراوە بە شێوەی نارێك، ڕووناکی جەمسەرنەگیراو پەیدا دەبێت.

**وێنەی 7-6**
شەپۆلەکانی ڕووناکی کە بوارە کارەباییەکەیان بەشێوەیەکی ڕێك ڕیز دەبێ جەمسەرگری هێڵین.

لەو ماددانەدا کە دەبنە هۆی جەمسەرگری ڕووناکی، ئاڕاستەی جەمسەرگریان پێی دەگوترێت ئاستی تێپەڕبوونی ماددەکە تەنها ئەو شەپۆلە ڕووناکیانە تێپەڕ دەبن کە ئاڕاستەی لەرینەوەیان تەریب بێت بە ئاستی (ڕووتەختی) جەمسەرگری ماددەکە.

بەڵام ئەو شەپۆلانەی کە ئاستی لەرینەوەیان ئەستوونە لەسەر ئاستی جەمسەرگری ماددەکە ئەوا تێپەڕ نابن، ئەگەر دوو لەوحی جەمسەرگر کە ئاستی جەمسەرگریان تەریب بێت بەیەك، ئەوا ڕووناکی بەناویاندا تێپەڕ دەبێت وەك لە **وێنەی 7-7** (أ) دا دیارە. بەڵام ئەگەر ئاستی جەمسەرگریان ئەستون بێت لەسەر یەکتری، وەك لە **وێنەی 7-7** (ب) دا دیارە ئەوا ڕووناکی پێیاندا تێپەڕ نابێت.

ماددە (لەوحە) جەمسەرگرەکان تەنها بۆ دەست کەوتنی ڕووناکی جەمسەرگری هێڵی بەکارناهێنرێن، بەڵکو بەکاریش دێن بۆ جیاکردنەوەی ڕووناکی جەمسەرگیراو لە جەمسەر نەگیراو، وە دیاریکردنی ئاستی جەمسەرگیریان کاتی خولانەوەی لەوحێکی جەمسەرگر لەبەرامبەر ڕووناکیەکی جەمسەرگیراودا تێبینی گۆڕانی توندی ڕۆشنایەکەی دەکەین وەك **وێنەی 7-8** دا دیارە. وە توندی ڕۆشنایی گەورەترین بری دەبێت کاتێك ئاراستەی ئاستی جەمسەرگری ڕوناکی تەریب بێت بە ئاستی جەمسەرگری ماددەکە. وە لەگەڵ زیادبوونی گۆشەی نێوان ئاراستەی لەرینەوەی بواری کارەبایی وئاستی جەمسەرگری ماددەکە، پێکنەری شەپولە تێپەڕبووەکە بە جەمسەرگرەکەدا کەمدەبێتەوە وە توندی ڕۆشنایی کەمدەبێتەوە. وە کاتێك ئاستی جەمسەرگری ئەستوون بێت لەسەر ئاستی لەرینەوەی ڕووناکیەکە، هیچ ڕووناکی تێپەڕ نابێت بۆلاکەی تر.







**وێنەی 7-7**
(أ) تێپەڕبوونی ڕووناکی بەدوو لەوحدا کە ئاستی جەمسەرگریان تەریب بێت
(ب) دوو لەوحی جەمسەر گری کە ئاستەکانیان ئەستوونن لەسەر یەکتری ڕووناکی تێپەڕنابێت.




**وێنەی 7-8**
توندی ڕۆشنایی ڕووناکیە جەمسەر گیراوەکە کەم دەبێتەوە تاوەکو گۆشەی نێوان ئاستی لەوحی جەمسەرگری دووەم وە ئاستی ڕووناکیە جەمسەر گیراوەکە زیاد ببێت.

## جەمسەرگری ڕووناکی بە دانەوە

سادەترین ڕێگاکانی دروستبوونی ڕووناکی جەمسەرگیراوی ڕێك بریتیە لە ڕێگای ڕووناکی دانەوە لە ڕووە جیاکەرەوەکانی دوو ناوەندی جیاواز، وەك هەواو شووشە وەپێیدەڵێن (ڕووناکی دانەوە لە شووشەوە) ئەمەش ڕوودەدات کاتێك ڕووناکیەکی تاك ڕەنگ دەکەوێتە سەر ڕووی لەوحێکی شووشە (یا ئاوێنەی ڕووتەخت) بەدانەوەی بەشێکی و شکانەوەی بەشێکی تری بە گۆشەی جیاجیا کاتێك ڕووناکیەك بە گۆشەیەکی دیاریکراو لە ڕوویەك دەدرێتەوە، ڕووناکیە دراوەکە بە تەواوەتی جەمسەرگیراوی هێڵی دەبێت، وەتەریبە بەڕووە ڕووناکی درەوەکە. ئەگەر ڕووە ڕووناکی دەرەوەکە تەریب بێت بەزەوی ئەوا ڕووناکییە دراوەکە جەمسەرگیراوی ئاسۆیی دەبێت، وەك لە باری ڕووناکی دانەوە بە گۆشەی بچوك کە لە ڕێگاکان و ڕووی ئاو و ڕووی ئۆتۆمبێلەکاندا دەبینرێ.

چالاکییەکی کرداری
**خێرا**
**جەمسەرگری ڕووناکی خۆر**

**کەرەستەکان**
✓ لەوحێکی جەمسەرگر یان چاویلکەیەکی جەمسەرگر

**ڕێنمایەکانی سەلامەتی**
**ڕاستەوخۆ سەیری خۆر مەکە**

لە کاتی پێش نیوەڕۆ یان کاتی پاش نیوەڕۆ کە خۆر دوورە لە ئاسۆدا بەڵام ناکەوێتە ناوەڕاستی ئاسمان، بە هۆی لەوحێکی جەمسەرگری بەشێوەیەکی ستوون سەیری ئاسمان بکە تێبینی کەم بوونەوەی توندی ڕووناکی دەکەیت.

لەوحە جەمسەرگرەکە بخولێنەرەوە وە هەوڵ بدە شوێنی جەمسەرگرەکە جێگیربکە کە تێیدا ڕووناکی ئاسمان کەمترین بری هەبێت.
تاقیکردنەوەکە دووبارە بکەوە بۆ ئەو ڕووناکیانەی کە لە شوێنی تری ئاسمانەوە دێن ڕووناکی دراوە لە ڕووی مێزێك کە نزیك لە پەنجەرەیەك دانراوە بیشکنە. بەراورد بکە لە نێوان ئەنجامەکانی ئەم دوو تاقیکردنەوەت.

لـەبـەر ئـەوەی ئـەو ڕووناكـیـەی كـە دەبـێتـە هـۆی درەوشانـەوە زۆربـەی جـار جەمسەرگیراوی ئاسۆییە، وە لە تواناداهەیە بەهۆی ماددەیەكی جەمسەرگری كە ئاستی جەمسەرگریەكەی ستون بێت ڕێگری بكرێت، ئەمەش باری چاویلكەكانی جەمسەرگریە وەك لە **وێنەی 7-9** دا، ڕونكراوەتەوە كە گۆشەی نێوان ئاڕاستەی جەمسەرگری ڕووناكی دراوەو ئـاستـی جـەمسەرگری مـاددە جـەمسەرگرەكـە $90^{o}$ . بـۆیـە هـیـچ ڕووناكـیـەك لـە ڕووناكیە جەمسەرگیراوە كە ناتوانێ پیایدا تێپەڕبێت.




**وێنەی 7-9**
ڕووناكی دراوە جەمسەرگیراوی ئاسۆیی دەبێت كاتێ بە گۆشەیەكی دیاریكراو دەكەوێتە سەر ڕوویەكی ڕووناكی دەرەوە دەتوانرێ بەر پەرچی ڕووناكیە دراوەكە بدرێتەوە بە دانانی ئاستی جەمسەرگری چاویلكەیەكی جەمسەرگر بە ئاڕاستەی ستوونی.

## جەمسەرگری ڕووناكی بەشكانەوەی دوولۆ

دیاردەی جەمسەرگری بە شكانەوەی دوولۆ ئاشكرا نەبوو تا سالی 1808 كاتێ زانا مـالـوس Malos چـاودێری دانـەوەی ڕوونـاكـی خـۆری دەكـرد لـە شووشەیـەك لـە نـاو بەللورەیەكی كالسایتەوە $CaCO_3$ . لەو كاتەدا مالوس بینی كەوا دوو وێنە بۆ خۆر دروست بـووە و تـێبـیـنـی ئـەوەی كرد هـەركـاتـێ بـەللـورەكە بـخـولێنرێـتـەوە ئـەوا توندی ڕۆشنایی یەكێك لە وێنەكان زیاد و ئەوی تریان كەمدەكات.

### ئاوێزەی نیكۆل Nicol prisim

ئەو جەمسەرگرەیە كە زانا نیكۆل لە ساڵی 1829 دا دروستی كرد، بەكاردەهێنرێت بۆ وەدەستهێنانی گورزەیەكی ڕووناكی جەمسەرگیراو، پێكهاتووە لە بەللورەیەكی كالیسایت $CaCO_3$ بە دووری گونجاو و دەكرێتە دوو بەشەوە بە گۆشەی $68^{o}$ بەپێی ئاستی ستوونی لەسەر تەوەرەكەی ئینجا دوو بەشەكە بە ماددەیەكی لكێنەری ڕوونی تەنك ( كەنەدا بەلسەم Canada Balsam ) بەیەكتر چەسپدەكرێت كە هاوكۆلكەی شكانەوەی 1.55 ـە.

کە تیشکی ڕووناکی جەمسەر نەگیراو بە یەکێك لە لاکانی بەللورەکەدا تێپەڕ دەبێت وەك لــە **وێنەی 10-7** دیـارە، ئـەوا لـەنـاو بـەللـورەکـەدا دابـەش دەبـێت بـۆ دوو تـیشکی جەمسەرگیراو یەکێکیان پێیدەڵێین جەمسەرگیراوی دراوە، کە بە تەواوەتی دەدرێتەوە لـەسەر ڕووە لـکێنـەرە جـیـاکـەرەوەکـە (کـەنـەدا بـەلسەم) لـەبـەرئـەوەی هـاوکۆلـکـەی شکانەوەی 1.658 ، زیاترە لە 1.55 بەڵام تیشکەکەی تریان پێیدەڵێن جەمسەرگیراوی تێپەڕبوو کە نادرێتەوە لەسەر ڕووە جیاکەرەکە بەڵکو تێپەڕ دەبێ بۆ نیوەی دووەمی ئاوێزەی نیکۆل وەك ڕووناکی جەمسەرگیراوی تەخت.

**وێنەی 10-7**
جەمسەرگری ڕووناکی بەهۆی ئاوێزەی (نیکۆل)ەوە.




## پێداچوونەوەی بەندی 2-7

**.1** چۆن دەزانی دوو هاوێنەی چاویلکە جەمسەر گیرن یان نا. ئەمەڕوونبکەرەوە؟

**.2 بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە:** چاودێری ئەو ڕووناکیە بکە کە لە ڕووی گۆمێکی ئاو دەدرێتەوە بە هۆی لەوحێکی جەمسەر گرەوە. چۆن دەزانی کە ڕووناکیە دراوەکە جەمسەرگیراوە یان نا؟

# بەندی 3-7

# پەرشبوونەوە
## *Scattering*

### 3-7 ئامانجەکان

- پێناسەی پەرشبوونەوەدەکات.
- جەمسەرگری بە هۆی پەرشبوونەوە ڕووندەکاتەوە.

جگە لەو ڕێگایانەی پێشوی جەمسەرگری دەتوانرێت بە هۆی پەرشبوونەوە، ڕووناکی جەمسەرگیراو بەدەست بهێنرێت کاتێك گورزەیەك لە ڕووناکی ئاسایی دەکەوێتە سەر گەردەکانی یان تەنۆلکەکانی ناوەندێك کە تێکرای دووریەکانیان (تیرەکانیان) یەکسانە بە درێژی شەپۆلە کورتەکانی ڕووناکی ئەوا ڕووناکییەکە بە هەموو ئاراستەیەك پەرشدەبێتەوە، و تێبینی ئەوە دەکرێت کە ڕووناکی پەرشبووە بە ئاراستەیەك تارادەیەك جەمسەرگیراو دەبێت. و جەمسەرگیرییەکە بە تەواوەتی دەبێت ئەگەر پەرشبوونەوەکە ستوون بوو لەسەر ئاراستەی گورزەی سەرەکی، و لەرینەوەکانی ستوون دەبێ لەسەر ئاراستەی بڵاوبوونەوەی ئەم گورزەیە.

**پەرشبوونەوە** scattering هەڵمژینی ڕووناکییە بە هۆی تەنۆلکەکانی هەوا و دووبارە تیشکدانەوەی بەهۆیانەوە، لە توانایدا هەیە ڕووناکی جەمسەرگیراو پەیدابکات وەك لە **وێنەی 7-11** . کاتێك گورزە ڕووناکییەکی جەمسەرگیراو بەر تەنۆلکەکانی هەوا دەکەوێت ئەوا ئەلیکترۆنەکانی ئەو گەردانە دەلەرێنەوە لەگەڵ بواری کارەبایی شەپۆلی لێدەردا. لەرینەوە ئاسۆییەکانی ئەلیکترۆنەکان، ڕووناکییەکی جەمسەرگیراوی شاوڵی پەیدا دەکات و هەروەها لە لەرینەوەی شاوڵی ئەلیکترۆنەکان ڕووناکی جەمسەرگیراوی ئاسۆیی دەردەچێت کە تەریب بە زەوی دەبن بۆیە ئەو چاودێرەی کە سەیری ئاسمان دەکات کاتێك خۆر لە پشتیەوەیەتی ئەوسا ڕووناکی جەمسەرگیراو دەبینێ.

**پەرشبوونەوە**

هەڵمژینی ڕووناکیە بەهۆی تەنۆلکەکانی هەوا و دووبارە تیشکدانەوەیەتی.




**وێنەی 7-11**
پەرشبوونەوەی ڕووناکی خۆر جەمسەرگیراو دەبێت بە هۆی گەردەکانی هەواوە بە پێی چاودێرێك کە لەسەر زەویەوە سەیری ئاسمان دەکات.

## پێداچوونەوەی بەندی 3-7

**1.** چی ڕوو دەدات کاتێك گورزەیەك ڕووناکی دەکەوێتە سەر ڕوویەك کە تیرەی تەنۆلکەکانی نزیکە لە درێژی شەپۆلی ڕووناکییەکە.

**2.** **بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە:** چاودێرێك سەیری ئاسمان دەکات و خۆریش لە پشتیەوەیەتی چۆن بینینی ئەو چاودێرە بۆ ڕووناکی جەمسەرگیراو لێکدەدیتەوە؟

# پوختەی بەشی 7

## بیرۆکە بنەڕەتییەکان

### بەندی 7-1 ڕەنگ

- بە تێکەڵکردنی ڕەنگە بنەڕەتییەکان ڕەنگی سپی دەست دەکەوێت.
- ڕەنگە بنەڕەتیەکانی هەڵمژراو هەموو ڕووناکی لادەدات لە کاتی تێکەڵ کردنیان.
- دەتوانین ڕووناکی بە ڕەنگی جیا بەدەستبهێنین بە تێکەڵکردنی ڕەنگە بنەرەتیەکان (سوور، سەوز، شین).
- دەتوانین ڕەنگی جۆراوجۆری بۆیە بەدەستبهێنین بە تێکەڵکردنی ڕەنگە هەڵمژراوەکان.

### بەندی 7-2 جەمسەرگری شەپۆلەکانی ڕووناکی

- لە شەپۆلی کارۆموگناتیسیدا، بوارە کارەباییەکە ستوونە لەسەر هەریەك لە بوارە موگناتیسەکە و ئاڕاستەی شەپۆلەکە.
- ڕووناکی جەمسەرگیراو دەبێ بە تێپەڕبوون یان دانەوە یان شکانەوەی دوولۆ.

### بەندی 7-3 پەرشبوونەوە

- رووناکی بە پەرشبوونەوە دەبێتە هۆی وەدەست هێنانی رووناکی نیمچە جەمسەر گیراو یان جەمسەرگیراوی تەواو.

## زاراوە بنەڕەتییەکان

**جەمسەرگری هێڵی**

(182 لا) Linear polarization

**پەرشبوونەوە** (186 لا) Scattering



# پێداچوونەوەی بەشی 7

پێدابچۆرەوە و هەڵیسەنگێنە

## ڕەنگ

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**1.** سێ ڕەنگە بنەڕەتییەکان کامانەن؟ چی وەدەستدێت لە ئەنجامی تێکەڵکردنیان؟

**2.** سێ ڕەنگە تەواوکەرەکان چین (بۆیە بنەڕەتییەکان) چی بەدەست دەکەوێت لە ئەنجامی تێکەڵکردنیان.

**3.** ئایا بۆچی لەوحێکی جەمسەرگر بەکاردێت بۆ نەمانی تێپەربوونی ڕووناکیەکی تێپەڕبوو بە لەوحێکی تری جەمسەرگردا کە ڕووناکیەکەی پیادا تێپەڕکراوە، ئەم دوو لەوحە ئاستی جەمسەرگریان چۆن دەبێت بەگوێرەی یەکتر؟

### پرسیار دەربارەی چەمکەکان

**4.** چی ڕوودەدات لە کاتی تێکەڵکردنی ئەمانەی خوارەوەدا.

أ. بۆیەکی سەوزی تۆخ لەگەڵ بۆیەیەکی زەرد.

ب.ڕووناکی شین لەگەڵ ڕووناکی زەرد.

ج. بۆیەی شینی پوخت لەگەڵ بۆیەی زەردی پوخت.

د. ڕووناکی سەوز لەگەڵ ڕووناکی سوور.

هـ. ڕووناکی سەوز لە گەڵ ڕووناکی شین.

**5.** ڕەنگی کراسێکی شینی سورباو چۆن دەردەکەوێت لە ژێر ئەم ڕەنگانەی ڕووناکیدا؟

أ. سپی.

ب. سور.

ج. کەسکی تۆخ (سەوزی تۆخ).

د. سەوز .

هـ. زەرد.

**6.** مادەیەک دوو ڕووناکی دەداتەوە سەوز و شین. ڕەنگی چۆن دەردەکەوێت؟ کە ڕووناک بکرێتەوە بە ڕووناکی:

أ. سپی.

ب. شین.

## جەمسەرگری شەپۆلەکانی ڕووناکی

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**7.** سێ ڕێگەکەی جەمسەرگری ڕووناکی کامانەن؟

### پرسیار دەربارەی چەمکەکان

**8.** بۆچی ئەو چاویلکانەی هاوێنەی جەمسەرگریان لەگەڵدایە توندی ڕووناکی کەمدەکەنەوە کاتێک تەماشای ڕووی ئۆتومبێلەکەت یا ڕووی ئاوێکی دوور دەکەیت، بەڵام کەمی ناکاتەوە کە سەیری تانکی ئاوی سەربانەکەتان بکەیت؟

**9.** ئایا ڕووناکی خۆر جەمسەرگیراوە؟ بۆچی هەور تاریکتر دەردەکەوێت لە ئاسمان کاتێك بە هۆی لەوحێکی جەمسەرگر سەیری دەکرێت.

## پەرشبوونەوە

### پرسیارەکانی پێداچوونەوە

**10.** پەرشبوونەوە چییە؟ چۆن دەتوانێت ڕووناکی جەمسەرگیراو بکات.

**11.** جیاوازی چییە لە نێوان ڕووناکی نیمچە جەمسەرگیراو، جەمسەرگیراوی تەواو.

## پێداچوونەوەی گشتی

**12.** ڕووناکییەکی شین ئاراستەی ئاڵای کوردستان کرا ئەو ڕەنگانەی دەردەکەون چین؟ ئەمە ڕوونبکەرەوە.

**13.** ڕەنگی ئاسمان چۆن دەردەکەوێت بەهۆی پاڵێوراوێکی سوورەوە.

**14.** چی ڕوودەدات کە ڕووناکی ئاسایی بکەوێتە سەر ئاوێزەیەك؟ ڕوونیبکەرەوە.

**15.** وێنەی ئاوێزەی نیکۆل بکێشە، ئینجا ڕوونیکەرەوە چۆن دوو تیشکت دەست دەکەوێت یەکێکیان دراوە و ئەوی تریان جەمسەرگیراوە.

## پرۆژە و ڕاپۆرتەکان

1. ئامادەکراوەکانی خۆپاراستن لە تیشکی خۆر ئەو مادانە لە خۆ دەگرێت کە تیشکی سەرو وەنەوشەیی هەڵدەمژن. وە نایەڵن خانەکانی پێست لەناوبەرن، تاقیکردنەوەیەك ئامادە بکە بۆ پشکنینی گیراوە جیاوازەکانی ئامادەکراوەکە بۆ خۆپاراستن لە تیشکی خۆر. کاغەزی چاپەمەنی شین و فلیم و ڕووەك و ماددەی هەستیاریتر بەکاربهێنە. پرسیارەکان کە لێکۆڵینەوەکەی تیا ریزبەند کراوە بنووسە، وە ئەو ماددانەی کە پێویستن، وە ئەو هەنگاوانەی کە دەتەوێت بیگریتە بەر وە ئەو پێوانانەی کە دەتەوێت ئەنجامیان بدەیت، تاقیکردنەوەکە پاش وەرگرتنی ڕەزامەندی مامۆستا ئەنجامبدە، راپۆرتێك یان ئەنجامە دەستکەوتەکان لە پۆل پێشکەش بکە.

2. لێکۆڵینەوەیەك بکە لەسەر دیاردەی پەرشبوونەوە و جۆرەکانی، وە ڕێگاکانی وەدەست هێنانی ڕووناکی جەمسەرگیراو کە لە ساڵی 1800 وە دەست پێبکات تا ئێستا. لێکۆڵینەوەکەت بەجێهێنانە کرداردیەکانی جەمسەرگیری تیابێت لە ژیانی ڕۆژانەدا.

# پاشكۆی (أ) : پێداچوونەوە یەك لە بیركاریدا

## زانستی هێماكاری

### هێزی دەی پۆزەتیڤ Positive exponents

زۆربەی زۆری ئەو برانەی كە زاناكان مامەڵەی پێ دەكەن، زۆر گەورەن یان زۆر بچوكن بۆ نموونە بڕی خێرایی ڕووناكی نزیكەی 300 000 000 m/s و مەرەكەبی پێویست بۆ دانانی خاڵێك لەسەر پیتێك بارستاییەكەی دەگاتە 0.000 000 001 kg ، مامەڵەكردن لەگەڵ ئەو ژمارانەدا ماندومان دەكات بۆ ڕزگاربوون لەم ماندوبوونە ئەو ڕێگایە بەكاردەهێنین كە بەندە لەسەر هێزی ژمارە 10 .

$$10^0 = 1$$
$$10^1 = 10$$
$$10^2 = 10 \times 10 = 100$$
$$10^3 = 10 \times 10 \times 10 = 1000$$
$$10^4 = 10 \times 10 \times 10 \times 10 = 10\,000$$
$$10^5 = 10 \times 10 \times 10 \times 10 \times 10 = 100\,000$$

هێزی ژمارە 10 یان توانی ژمارە 10 ، ژمارەی سفرەكان دیاری دەكات، لەبەر ئەوە خێرایی ڕووناكی كە دەكاتە 300 000 000 m/s دەنوسرێت لەسەر شێوەی $3 \times 10^8$ m/s لەم بارەدا توانی 10 ژمارە 8 .

### هێزی دەیی نێگەتیڤ Negative exponents

بۆ ئەو ژمارانەی كە كەمترە لە 1 ئەمانەی خوارەوە تێبینی دەكەین:

$$10^{-1} = \frac{1}{10} = 0.1$$

$$10^{-2} = \frac{1}{10 \times 10} = 0.01$$

$$10^{-3} = \frac{1}{10 \times 10 \times 10} = 0.001$$

$$10^{-4} = \frac{1}{10 \times 10 \times 10 \times 10} = 0.0001$$

$$10^{-5} = \frac{1}{10 \times 10 \times 10 \times 10 \times 10} = 0.000\,01$$

بڕی هێزی نێگەتیڤ دەكاتە ژمارەی ئەو خانانەی كە پێویستە «وێرگوڵی» بەلای ڕاستدا ببیرێت. بۆ ئەوەی لەلای ڕاستی خانەی ژمارە یەكیدا بێ جگە لە سفر (خانەكە لەم بارەدا 1 ـە)، وە ئەو ڕێگەیەی كە ژمارەكانی پێدەنووسرێت بریتین لە 1 بۆ كەمتر لە دە. لەسەر شێوەی ژمارە كەرتی بە هێزی دەی پۆزەتیڤ یان نێگەتیڤ، كە پێی دەوترێت زاستی هێماكاری. بۆ نموونە ژمارە
5 943 000 000 لەسەر شێوەی $5.943 \times 10^9$ دەنووسرێت وە بە ڕێگەی زانستی هێماكاری
0.000 083 2 لەسەر شێوەی $8.32 \times 10^{-5}$ دەنووسرێت.

## لێکدان ودابەشکردن بە بەکارهێنانی زانستی هێماکاری

لەکاتی لێکدانی ژمارە نووسراوەکان بە ڕێگەی زانستی هێماکاری دەتوانین ئەم ڕێسایەی خوارەوە بەکاربهێنین:

$$10^{n} \times 10^{m} = 10^{(m+n)}$$

لەوانەیە کە $n$ و $m$ هەر یەکەیان ژمارەیەك بێ، وە مەرج نیە کە ژمارەی تەواوبێ. بۆ نموونە $10^{2} \times 10^{5} = 10^{7}$ لە کاتێکدا $10^{1/4} \times 10^{1/2} = 10^{3/4}$ . ئەو ڕێسایە لەسەر هێزی نێگەتیڤەکانیش جێبەجێ دەکرێت، بۆ نموونە $10^{3} \times 10^{-8} = 10^{-5}$ وە لەکاتی دابەشکردنی ژمارەکان بە زانستی هێماکاری ئەمەی خوارەوە تێبینی دەکەین:

$$\frac{10^{n}}{10^{m}} = 10^{n} \times 10^{-m} = 10^{(n-m)}$$

بۆ نموونە ، $\frac{10^{3}}{10^{2}} = 10^{(3-2)} = 10^{1}$

## کەرتەکان

خشتەی **1** (أ) کورتەی ڕێسای کردارەکانی لێکدانی کەرتەکان ودابەشکردنیان و کۆکردنەوەو و لێکدەرکردنیانە کاتێك کە $a$ و $b$ و $c$ و $d$ چوار ژمارەبن.

خشتەی **1** (أ) کردارە بنچینەییەکان لە کەرتەکاندا

| کردار | ڕێسا | نموونە |
|---|---|---|
| لێکدان | $\left(\frac{a}{b}\right)\left(\frac{c}{d}\right) = \frac{ac}{bd}$ | $\left(\frac{2}{3}\right)\left(\frac{4}{5}\right) = \frac{(2)(4)}{(3)(5)} = \frac{8}{15}$ |
| دابەشکردن | $\frac{\left(\frac{a}{b}\right)}{\left(\frac{c}{d}\right)} = \frac{ad}{bc}$ | $\frac{\left(\frac{2}{3}\right)}{\left(\frac{4}{5}\right)} = \frac{(2)(5)}{(3)(4)} = \frac{5}{6}$ |
| کۆکردنەوەو لێکدەرکردن | $\frac{a}{b} \pm \frac{c}{d} = \frac{ad \pm bc}{bd}$ | $\frac{2}{3} - \frac{4}{5} = \frac{(2)(5) - (3)(4)}{(3)(5)} = -\frac{2}{15}$ |

## تـوانـەکـان Powers

### ڕێساکانی توان Rules of expnents

لە کاتی لێکدانی بڕێکی دیاریکراو $(x)$ کە توانەکەی $(m)$ بێت لە هەمان بڕ و توانەکەی $(n)$ بێ ئەوا ڕێسای زانستی هێماکاری بەم شێوەی خوارەوە جێبەجێ دەکەین:

$$(x^{n})(x^{m}) = x^{(n+m)}$$

بۆنموونە: $(x^{2})(x^{4}) = x^{(2+4)} = x^{6}$

کاتی دابەشکردنی توانە جیاوازەکان بۆ هەمان بڕ تێبینی دەکەین:

$$\frac{x^{n}}{x^{m}} = x^{(n-m)}$$

بۆ نموونە، $\frac{x^{8}}{x^{2}} = x^{(8-2)} = x^{6}$

ئەو توانەی کە لە شێوەی کەرتدا بێت وەك $\frac{1}{3}$ دەبێتە ڕەگ وەك ئەمەی خوارەوە:

$$x^{1/n} = \sqrt[n]{x}$$

بۆنموونە: $4^{1/3} = \sqrt[3]{4} = 1.5874$ (دەتوانین سوود وەربگرین لە ئامێری ژمێرەر بۆ ئەم هەژمارکردنە) لە کۆتایی دا، بۆ بڵندکردنەوەی $x^n$ بۆ توانی $m$ بەم شێوەیەی لێ دێت:

$$(x^n)^m = x^{mn}$$

بۆنموونە: $(x^2)^3 = x^{(2)(3)} = x^6$

**خشتەی 2** (أ) کورتەی ڕێسا بنچینەییەکانی توانە.

**خشتەی 2** (أ) ڕێسا بنچینەییەکانی توان

| | | |
|---|---|---|
| $x^0 = 1$ | $x^1 = x$ | $(x^n)(x^m) = x^{(n+m)}$ |
| $\frac{x^n}{x^m} = x^{(n-m)}$ | $x^{1/n} = \sqrt[n]{x}$ | $(x^n)^m = x^{(nm)}$ |

## جەبر Algebra

### ژمێرکردنی نادیار «نەزانراو» Solving for unknowns

لە کاتی ئەنجامدانی کردارە جەبرییەکاندا، ئەوا یاساکانی هەژمارکردنی بەجێ دەهێنین، کە هێماکانی وەك ($x$، $y$، $z$ ...) برە نادیارەکان «نەزانراوەکان» دەنوێنین.

با یەکەم جار ئەم هاوکێشەیە وەربگرین:

$$8x = 32$$

گەر ویستمان $x$ هەژماربکەین، ئەوا هەردوولای هاوکێشەکە دابەشی هەمان کۆلکە دەکەین بێ ئەوەی هاوکێشەکە هیچ بگۆڕێت: لەم بارەدا ئەگەر هەردوو لا دابەش 8 بکەین:

$$\frac{8x}{8} = \frac{32}{8}$$

$$x = 4$$

پاشان با ئەم هاوکێشەیە وەربگرین.

$$x + 2 = 8$$

لەم جۆرە هاوکێشانەدا، ئەوا یەك بڕ لەگەڵ هەردوو لای هاوکێشەکە کۆ دەکەینەوە یان لێ دەردەکەین. ئەگەر ژمارە 2 لەهەردوو لا دەربکەین ئەوا:

$$x + 2 - 2 = 8 - 2$$

$$x = 6$$

بە شێوەیەکی گشتی $x + a = b$ دەگۆڕێت بۆ $x = b - a$ .

ئێستا با ئەم هاوکێشەیە وەربگرین.

$$\frac{x}{5} = 9$$

ئەگەر هەر لایەك لە 5 بدرێت، ئەوا بە تەنها $x$ دەمێنێتەوە لە لای چەپ وە بڕی 45 لە لای ڕاست.

$$(5)\left(\frac{x}{5}\right) = (9)(5)$$

$$x = 45$$

لە هەموو بارەکاندا، ئەو کردارانەی کە لەسەر لای چەپ جێبەجێ بکرێت پێویستە لەسەر لای ڕاستیشی جێبەجێ بکرێت.

## شیتەڵ کردن بۆ کۆلکەکان

## Factoring

لە **خشتەی 3** (أ) دا هەندێ لە هاوکێشە بەکەڵکەکان نیشان دراوە بۆ شیتەڵ کردنی هاوکێشە بۆ کۆلکەکان. بۆ نموونە دەتوانین هاوکێشەی $5x + 5y + 5z = 0$ لەسەر شێوەی $5(x + y + z) = 0$ بنووسین، کە ژمارەی 5 پێی دەووترێت کۆلکەی هاوبەش. بەڵام دەربڕینی $a^2 + 2ab + b^2$ کە دائەنرێت بە نموونەیەك بۆ دووجای تەواو، دەتوانین بنووسین $(a + b)^2$ . ئەگەر $a = 2$ و $b = 3$ ئەوا هاوکێشەکە دەبێتە $2^2 + (2)(2)(3) + 3^2 = (2 + 3)^2$ ، یان $(4 + 12 + 9) = 25$ ، و لەکۆتایی دا $5^2 = 25$ .

وەك نموونەیەك لەسەر جیاوازی نێوان دوو ژمارەی دووجا ئەگەر $a = 6$ ، $b = 3$ . لەم بارەدا $(6^2 - 3^2) = (6 + 3)(6 - 3)$ یان $(36 - 9) = (9)(3) = 27$ .

**خشتەی 3** (أ)     هاوکێشەکانی شیتەڵ کردن بۆ کۆلکەکان

| | |
|---|---|
| کۆلکەی هاوبەش | $ax + ay + az = a(x + y + z)$ |
| دووجای تەواو | $(a + b)^2 = a^2 + 2ab + b^2$ |
| جیاوازی نێوان دوو ژمارەی دووجا | $a^2 - b^2 = (a + b)(a - b)$ |

## هاوکێشە هێڵیەکان

## Linear Equations

هاوکێشەی هێڵی بە گشتی ئەم شێوەیەی خوارەوەی هەیە:

$$y = ax + b$$

لە کاتێکدا کە $a$ و $b$ جێگیرن و نەگۆڕن. ئەم هاوکیشەیە پێی دەووترێت هاوکێشەی بەهێڵ، لەبەر ئەوەی چەماوەی $y$ بە ڕێژەی $x$ هێڵی ڕاستە، وەك دیارە لە **وێنەی 1** (أ). بە نەگۆڕی $b$ دەوترێت یەکتربڕین لەگەڵ تەوەری $y$ . وە نەگۆڕی $a$ یەکسانە بە «لاری»، ڕاستەهێڵە کە یەکسانیشە بە «سایە»ی گۆشەی نێوان ئەو ڕاستەهیڵەو تەوەرەی $x$ ، واتە $\theta$ . ئەگەر لەسەر هێڵەکە تان وپۆی $(x_1, y_1)$ و $(x_2, y_2)$ دیاریبکەین هەروەك لە **وێنەی 1** (أ) دیارە، «لاری» ڕاستەهێڵەکە کە دەبێتە:

$$\frac{\Delta y}{\Delta x} = \frac{y_2 - y_1}{x_2 - x_1} = \text{لاری Slope}$$




**وێنەی 1** (أ)

بۆ نموونە، دوو خاڵی (2،4) و (6،9) ، بەو نرخانە لاری هێڵەکە:

$$\text{لاری} = \frac{(9-4)}{(6-2)} = \frac{5}{4}$$

تێبینی بکە کە لەوانەیە هەریەکە لە $a$ ، $b$ پۆزەتیڤ یان نێگەتیڤ بن. لاری ڕاستە هێڵەکە پۆزەتیڤ دەبێت ئەگەر $a > 0$ . وە نێگەتیڤ دەبێت ئەگەر $a < 0$ . سەرەڕای ئەوە کە یەکتر برین لەگەڵ تەوەرەی $y$ پۆزەتیڤە، ئەگەر $b > 0$ ، وە نێگەتیڤ دەبێت ئەگەر $b < 0$ .

**وێنەی 2 (أ)** ئەو نموونانە پیشان ئەدات کە لەسەر ئەو چوار بارەی پێشوو، کە کورتەکەی لە **خشتەی 4 (أ)** دایە.




**خشتەی 4 (أ)**

**خشتەی 4 (أ)** هاوکێشە هێڵیەکان

| نەگۆڕەکان | لاری | یەکتربڕی لەگەڵ y |
|---|---|---|
| $a > 0, b > 0$ | پۆزەتیڤ | پۆزەتیڤ |
| $a > 0, b < 0$ | پۆزەتیڤ | نێگەتیڤ |
| $a < 0, b > 0$ | نێگەتیڤ | پۆزەتیڤ |
| $a < 0, b < 0$ | نێگەتیڤ | نێگەتیڤ |

## گۆڕان لە نێوان کەرتەکان و ژمارە دەییەکان و ڕێژەکانی سەدی

**خشتەی 5 (أ)** کورتەی ڕێساکانی گۆڕینی ژمارەکانە لە کەرتەکانەوە بۆ ژمارە دەییەکان ورێژەی سەدییەکان وە لە ڕێژە سەدییەکانەوە بۆ ژمارە دەییەکان.

**خشتەی 5 (أ)** گۆڕینەکان

| گۆڕین | ڕێسا | نموونە |
|---|---|---|
| لە کەرتەوە بۆ ژمارەی دەیی | «سەرە» دابەش «ژێرە» بکە | $\frac{31}{45} = 0.69$ |
| لەکەرتەوە بۆ ڕێژەی سەدی | بگۆڕە بۆ ژمارەی دەیی پاشان کەرەتی 100% | $\frac{31}{45} = (0.69)(100\%) = 69\%$ |
| لە ڕێژەی سەدی بۆ ژمارەی دەیی | «وێرگوڵ» دوو خانە بجووڵێنە بۆ لای چەپ ولە هێمای ڕێژەی سەدی خۆت ڕزگار بکە | $69\% = 0.69$ |

لە خشتەی 6 (أ) دا هاوکێشەی ڕووبەر و قەبارەکانی هەندێ لە شێوە ئەندازەییە جۆراو جۆرەکانی تێدایە کە لەم کتێبەدا هاتووە.

خشتەی 6 (أ) ڕووبەرەکان و قەبارە ئەندازەییەکان

| شێوە ئەندازەییەکان | | هاوکێشەکان |
|---|---|---|
| $l$, $w$ | لاکێشە | ڕووبەر = $lw$<br>چێوە = $2(l+w)$ |
| $r$ | بازنە | ڕووبەر = $\pi r^2$<br>چێوە = $2\pi r$ |
| $h$, $b$ | سێگۆشە | ڕووبەر = $\frac{1}{2}bh$ |
| $r$ | گۆ «تۆپ» | ڕووبەری ڕوو = $4\pi r^2$<br>قەبارە = $\frac{4}{3}\pi r^3$ |
| $l$, $r$ | لولەك | قەبارە = $\pi r^2 l$<br>لا تەنیشتە ڕووبەر = $2\pi rl$ |
| $w$, $l$, $h$ | لاکێشەکانی تەریبی «سەندوقی لاکێشەیی» | ڕووبەری ڕوو = $2(lh + lw + hw)$<br>قەبارە = $lwh$ |

# زانستی سێگۆشەکاری و بیردۆزی فیثاغۆرس

زانستی سێگۆشەکاری ئەو لقەی بیرکارییە کە پەیوەستە بە تایبەتمەندییەکانی سێگۆشەی گۆشە وەستاو. زۆربەی زۆری چەمکەکانی ئەم لقە گرنگیەکی گەورەی هەیە لە خوێندنی فیزیادا. بۆ پێداچوونەوەی هەندێ لە چەمکە بنچینەییەکان لە زانستی سێگۆشەکاریدا، بۆ نموونە سێگۆشەیەکی گۆشە وەستاو وەردەگرین وەك ئەوەی لە **وێنەی 3 (أ)** دایە، کە تیایدا لای $a$ بەرامبەر بە گۆشەی $\theta$ وە لای $b$ تەنیشتیەتی، وەلای $c$ ژێ سێگۆشەکەیە خشتەی **7 (أ)** وە بە پاڵپشت بە **وێنەی 3 (أ)**. پوختەی زۆربەی نەخشە سێگۆشە بنچینەییەکان.

**وێنەی 7 (أ)** نەخشەی سێگۆشەییەکان (ڕێژە سێگۆشەییەکان)

| | |
|---|---|
| تەژێ «ساین» (sin) | $\sin\theta = \frac{a}{c} = \frac{\text{لای بەرامبەری } \theta}{\text{ژێ}}$ |
| تەژێ تەواو «کۆساین» (cos) | $\cos\theta = \frac{b}{c} = \frac{\text{لای تەنیشتی } \theta}{\text{ژێ}}$ |
| سایە «تانجن» (tan) | $\tan\theta = \frac{a}{b} = \frac{\text{لای بەرامبەر } \theta}{\text{لا تەنیشتی } \theta}$ |
| هەڵگەڕاوەی تەژێ ($\sin^{-1}$) | $\sin^{-1}\left(\frac{a}{c}\right) = \sin^{-1}\left(\frac{\text{لای بەرامبەر } \theta}{\text{ژێ}}\right) = \theta$ |
| هەڵگەڕاوەی تەژێ تەوا ($\cos^{-1}$) | $\cos^{-1}\left(\frac{b}{c}\right) = \cos^{-1}\left(\frac{\text{لا تەنیشت } \theta}{\text{ژێ}}\right) = \theta$ |
| هەڵگەڕاوەی سایە ($\tan^{-1}$) | $\tan^{-1}\left(\frac{a}{b}\right) = \tan^{-1}\left(\frac{\text{لای بەرامبەر } \theta}{\text{لا تەنیشت } \theta}\right) = \theta$ |




**وێنەی 3 (أ)**

بۆ نموونە ئەگەر پێوانەی گۆشەی $\theta = 30°$ ، ئەوا ڕێژەی $a$ بۆ $c$ دەکاتە 0.50 . کە ئەمەش مانای وایە کە $\sin 30 = 0.50°$ نەخشەکانی ( Sin ، Cos ، tan ) هیچ یەکەیەکی پێوانە کردنیان نییە، لەبەر ئەوەی ڕێژەن لە نێوان دوو درێژیدا هەروەها بڕوانە ئەم پەیوەندیەی خوارەوە:

$$\frac{\sin\theta}{\cos\theta} = \frac{\frac{\text{لای بەرامبەر } \theta}{\text{ژێ}}}{\frac{\text{لای تەنیشت } \theta}{\text{ژێ}}} = \frac{\text{لای بەرامبەر } \theta}{\text{لای تەنیشت } \theta} = \tan\theta$$

ئەمانەی خوارەوە هەندێ لە پەیوەندیە سێگۆشەییەکانی ترن:

$$\sin^2\theta + \cos^2\theta = 1$$

$$\sin\theta = \cos(90° - \theta)$$

$$\cos\theta = \sin(90° - \theta)$$

### پێوانە کردنی (ژمێرەکردنی) درێژی لایەکی نەزانراو

بە بەکارهێنانی هەرسێ نەخشە سێگۆشەیەکانی کە لە خشتەی 7 (أ) دا هاتووە، دەتوانین کە درێژی لایەکی سێگۆشەی گۆشە وەستاوی نەزانراو هەژمێربکەین کاتێك کە درێژی یەکێك لە لاکانی وپێوانەی یەکێك لە دوو گۆشەکەی تری (جگە لە گۆشە وەستاوەکە) زانراوبێت بۆ نموونە: ئەگەر $\theta$ °= 30 و $a$ =1.0 m ئەوا درێژی دوو لاکەی تری سێگۆشەکە ئەدۆزینەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

$$\sin\ \theta = \frac{a}{c}$$

$$c = \frac{a}{\sin\theta} = \frac{1.0\ \text{m}}{\sin 30°}$$

$$\boxed{c = 2.0\ \text{m}}$$

$$\tan\ \theta = \frac{a}{b}$$

$$b = \frac{a}{\tan\theta} = \frac{1.0\text{m}}{\tan 30°}$$

$$\boxed{b = 1.7\ \text{m}}$$

### پێوانە کردنی (هەژمێرکردنی) گۆشەیەکی نادیار

لەوانەیە لە هەندێ جاردا کە (ساین، کۆساین، تانجن)ی گۆشەیەك بزانین وە پێویستمان بەدیاریکردنی نرخی گۆشەکە بێ، بۆ ئەم مەبەستە نەخشەکانی هەڵگەڕاوەی تەژێ «ساین» یان هەڵگەڕاوەی تەژێ تەواو «کۆساین» یان هەڵگەڕاوەی تانجن، بەکاربهێنین کە لە **خشتەی 7 (أ)** دا هاتووە. بۆ نموونە ئەگەر $a = 1.0$ m وە $c = 2.0$ m گۆشەی $\theta$ هەژمێر دەکەین بە بەکارهێنانی نەخشەی پێچەوانەی $\sin^{-1}$ بەم شێوەیە:

$$\theta = \sin^{-1}\left(\frac{a}{c}\right) = \sin^{-1}\left(\frac{1.0\ \text{m}}{2.0\ \text{m}}\right) = \sin^{-1}(0.50)$$

$$\boxed{\theta = 30°}$$

### بیردۆزی فیثاغۆرس

بیردۆزێکی بە کەڵکە لە سێگۆشەیەکی گۆشە وەستاودا ئەگەر $a$ و $b$ دوولای سێگۆشەیەکی گۆشە وەستاوبێت وە $c$ ژێیەکەی بێت وەك لە **وێنەی 4 (أ)** دیارە، ئەوا بیردۆزی فیثاغۆرس بەم شێوەیەی خوارەوە دەنووسرێ:

$$c^2 = a^2 + b^2$$

ئەمەش مانای ئەوەیە کە دووجای ژێ دەکاتە سەرەنجامی کۆکردنەوەی دووجای ئەو دوولاکەی تر کە ماون. بیردۆزی فیثاغۆرس بەکاردەهێنین بۆ هەژمارکردنی لایەك لە لاکانی سێگۆشە کاتێك درێژی دوولای تر زانراوبن بۆ نموونە: ئەگەر $c = 2.0$ m و $a = 1.0$ m ، دەتوانیت $b$ هەژماربکەیت بە هۆی بیردۆزی فیثاغۆرس. وەك:

$$b = \sqrt{c^2 - a^2} = \sqrt{(2.0\ \text{m})^2 - (1.0\ \text{m})^2}$$

$$b = \sqrt{4.0\ \text{m}^2 - 1.0\ \text{m}^2} = \sqrt{3.0\ \text{m}^2}$$

$$\boxed{b = 1.7\ \text{m}}$$




**وێنەی 4** (أ)

## هەڵەی پەتی

هەندێ لەو تاقیکردنەوانەی لەم کتێبەدا هاتووە، ڕێگەیەکی تێدایە بۆ هەژمێرکردنی بەهایەك کە پێشتر زانراوبێت. وەك تاودانی کەوتنە خوارەوەی سەربەست. لەم چەشنە تاقیکردنەوانەدا وردەکاری تاقیکردنەوەکانت دیاری دەکرێت لە ڕێگەی بەراوردکردن لە نێوان ئەنجامەکانت و بەها پەسندکراوەکە. وە هەڵەی پەتی پێناسە دەکرێت بەو نرخە پەتیەی کە لە ئەنجامی لێکدەرکردنی نرخی ئەنجامە تاقیگەیەکان لە نرخە دانراوەکەی (پەسندکراوەکە) پەیدا دەبێ.

هەڵەی پەتی = |بەهای تاقیگەیی ــ بەهای پەسندکراو|

دڵنیابە لە تێکەڵنەکردنی نێوان چەمکی (واتای) وردی و تەواوی یا ڕێکی. وردی پێوانەکردن بەوە پێناسە دەکرێت کە ڕادەی نزیکی پێوانە کردنەکەیە لە نرخی پەسندکراوەی برە پێوراوەکە. بەڵام تەواوی یا ڕێکی بەندە لەسەر ئامێرەکانی پێوانەکردن، بۆ نموونە ئەو ڕاستە مەتریەی کە بە مللیمتر پلە کراوە تەواوی زیاترە لەو ڕاستە مەترییەی کە بە سنتیمەتر پلەکرابێت. کەواتە بڕی $9.61\ m/s^2$ پێوراو بۆ تاودانی کەوتنە خوارەوەی سەربەست ڕێکترە لە بڕی $9.8\ m/s^2$. لەگەڵ زانینت کە $9.8\ m/s^2$ ووردی زیاترە لە $9.61\ m/s^2$.

## هەڵەی ڕێژەیی

تێبینی بکە ئەو پێوراوانەی کە ڕێژەییانە، هەڵەی پەتی گەورەیان هەیە، لەوانەیە وردتربێت لە پێوانێکی تر کە هەڵەی پەتی کەمترە، کە پێوانە کردنەکەی یەکەم بڕی زۆر گەورەی تێدابێ. لەبەر هەڵەی ڕێژەیی یان هەڵەی سەدی گرنگیەکی گەورەتری هەیە لە هەڵەی پەتی. وە هەڵەی ڕێژەیی پێناسە دەکرێت بە:

$$\text{هەڵەی ڕێژەیی} = \frac{|\text{بەهای تاقیگەیی ــ بەهای پەسندکراو}|}{\text{بەهای پەسندکراو}}$$

وە لەبەر ئەوەی لە بڕی هێندە پێوراوەکەدا هەڵەی ڕێژەیی ڕەچاوکراوە. دەتوانین بەراوردێکی وردی دوو پێوانەکردنی جیاواز بکەین لە نێو بەراوردکردنی هەردوو هەڵە ڕێژەییەکانیاندا.

# پاشکۆی (ب): هێماکان

## هێما بیرکاریەکان

| هێما | زاراوە | هێما | زاراوە |
|---|---|---|---|
| $\Delta$ | (دەلتا) بە یۆنانی گۆڕانە لە بڕێکدا | $\leq$ | بچووکترە لەیان (لەچەپەوە بۆ ڕاست دەخوێندرێتەوە) |
| $\Sigma$ | (سیگما) بەیۆنانی کۆکردنەوەی بڕەکانە | $\propto$ | ڕێژەیی |
| $\theta$ | (ثێتا) بە یۆنانی گۆشەیەکە | $\approx$ | نزیکە یەکسانە بە |
| $=$ | یەکسانی یان یەکسان بوو | $\lvert n \rvert$ | بڕی نرخی پەتی |
| $>$ | گەورەترە لە (لەچەپەوە بۆ ڕاست دەخوێندرێتەوە) | sin | ساین (تەژی) |
| $\geq$ | گەورەترە لە یان یەکسانە (لەچەپەوە بۆ ڕاست دەخوێندرێتەوە) | cos | کۆساین (تەژێ تەواو) |
| $<$ | بچوکترە لە (لەچەپەوە بۆ ڕاست دەخوێندرێتەوە) | tan | تانجن (سایە) |

## هێمای بڕە بەکارهاتووەکان

هێندی ئاڕاستەدار کە بڕو ئاڕاستەی هەیە بە پیتێك هێمادەکرێت تیراسایەکی لەسەر دانراوە، بەڵام وشە لارەکان *italic* هێمایە بۆ بڕە پێوانەییەکان (نا ئاڕاستەدارەکان) کە تەنها بڕیان هەیە.

| هێما | زاراوە | هێما | زاراوە |
|---|---|---|---|
| $A$ | ڕووبەر | $M$ | بارستایی گشتی |
| $D$ | تیرەی بازنە | $R$ | نیوەتیرە |
| $\vec{F}$ | هێز | $t$ | کات |
| $F$ | بڕی هێز | $V$ | قەبارە |
| $m$ | بارستایی | | |

# هێمای لەراوەکان وشەپۆلەکان و بینایيەکانی بەکارهاتوو لەم کتێبەدا

ئەو هێمایانەی کە تیراسایەك لەسەریانە برە ئاراستەدارەکان دەنوێنێ کە برو ئاراستەیان هەیە. بەڵام هێما «لارەکان» برە نا ئاراستەدارەکان دەنوێنێت کە تەنها بریان هەیە، یان برەکانی هێندە ئاراستە دارەکانە و هێماکانی تر یەکەکان دەنوێنێت.

| هێما | زاراوە | |
|---|---|---|
| $C$ | چەقی کوری ئاوێنەیەکی گۆیی | center of curvature for spherical mirror |
| $F_{جیر}$، $\vec{F}_{جیر}$ | هێزی جیری (سپرینگ) | spring force |
| $F$ | خاڵی تیشکۆ | focal point |
| $f$ | لەرینەوە (لەرەلەر) | frequency |
| $f_n$ | لەرینەوەی هارمۆنی لە پلەی $n$ | $n$th harmonic frequency |
| $h$ | درێژی تەنەکە | object height |
| $h'$ | درێژی وێنەکە | image height |
| $k$ | نەگۆڕە هێزی سپرینگ | spring constant |
| $L$ | درێژی بەندۆل یان پەتێکی لەراوە یان ستوونێك هەوای لەراوە | length of a pendulum, vibrating string, or vibrating column of air |
| $\lambda$ | (لامدا) بە یۆنانی درێژی شەپۆل | (Greek lambda) wavelength |
| $M$ | گەورەکردنی وێنە | magnification of image |
| $n$ | ژمارەی هارمۆنی (دەنگ) | harmonic number (sound) |
| $n$ | هاوکۆلکەی شکانەوە | index of refraction |
| $p$ | دووری تەن | object distance |
| $q$ | دووری وێنە | image distance |
| $T$ | کاتە لەرەی بەندۆل (جووڵەی هارمۆنی سادە) | period of pendulum (simple harmonic motion) |
| $\theta$ | (ثیتا) بە یۆنانی گۆشەی لێدانی گورزەی ڕووناکی (لەبارەی دانەوەدا) | (Greek theta) angle of incidence of a beam of light (reflection) |
| $\theta'$ | (ثیتا) بە یۆنانی گۆشەی دانەوە | (Greek theta) angle of reflection |
| $\theta_c$ | (ثیتا) بە یۆنانی گۆشەی مۆلەقەی شکانەوە | (Greek theta) critical angle of refraction |
| $\theta_i$ | (ثیتا) بە یۆنانی گۆشەی لێدانی گورزەیەکی ڕووناکی (لەباری شکانەوەدا) | (Greek theta) angle of incidence of beam of light (refraction) |
| $\theta_r$ | (ثیتا) بە یۆنانی گۆشەی شکانەوە | (Greek theta) angle of refraction |

# هێماکانی فیزیای میکانیکی (جووڵاوەی) بەکارهاتوو لەم کتێبەدا

ئەو هێمایانەی کە تیراسایەك لەسەریانە بڕە ئاڕاستەدارەکان دەنوێنێ کە بڕو ئاڕاستەیان هەیە بەڵام هێما «لارەکان» بڕە نائاڕاستەدارەکان دەنوێنێت کە تەنها بڕیان هەیە یان هێندی بڕە ئاڕاستە دارەکانە و هێماکانی تر یەکەکان دەنوێنێت.

| هێما | زاراوە | |
|---|---|---|
| $\vec{a}, a$ | تاودان | acceleration |
| $\vec{\mathrm{d}}, d$ | لادان | displacement |
| $\vec{\mathrm{F}}\Delta t$ | پاڵ | impulse |
| $\vec{\mathrm{F}}_{\mathrm{g}}, F_g$ | هێزی کێشکردن (کێش) | gravitational force (weight) |
| $\vec{\mathrm{F}}_{\mathrm{k}}, F_k$ | هێزی جووڵە لێکخشاندن | force of kinetic friction |
| $\vec{\mathrm{F}}_{\mathrm{n}}, F_n$ | هێزی ستوونی | normal force |
| $\vec{\mathrm{F}}_{\text{بەرەنجام}}, F_{\text{بەرەنجام}}$ | بەرەنجامی هێز | net force |
| $\vec{\mathrm{F}}_{\mathrm{R}}, F_R$ | هێزی بەرگری هەوا | force of air resistance |
| $\vec{\mathrm{F}}_{\mathrm{s}}, F_s$ | هێزی وەستاوە لێکخشاندن | force of static friction |
| $\vec{\mathrm{F}}_{\mathrm{s,max}}, F_{s,max}$ | گەورەترین هێزی وەستاوە لێکخشاندن | maximum force of static friction |
| $h$ | بەرزی | height |
| $k$ | نەگۆڕە هێزی سپرینگ | spring constant |
| $KE$ | جووڵە وزە | kinetic energy |
| $KE_{\text{گواستراوە}}$ | جووڵە وزەی گواستراوە | translational kinetic energy |
| $MA$ | چوستی میکانیکی | mechanical advantage |
| $ME$ | میکیانیکیە وزە<br>(کۆی جووڵە وزەو ماتە وزە) | mechanical energy<br>(sum of all kinetic and potential energies) |
| $\mu_k$ | هاوکۆلکەی جووڵە لێکخشاندن | (Greek *mu*) coefficient of kinetic friction |
| $\mu_s$ | هاوکۆلکەی وەستاوە لێکخشاندن | (Greek *mu*) coefficient of static friction |
| $P$ | توانا | power |
| $\mathbf{p}, p$ | تەوژم (بڕی جووڵە) | momentum |
| $PE$ | ماتە وزە | potential energy |
| $PE_e$ | ماتە وزەی جیری | elastic potential energy |
| $PE_g$ | ماتە وزەی کێش | gravitational potential energy |
| $r$ | دووری نێوان دووبارستایی | separation between point masses |
| $\vec{\mathrm{v}}, v$ | خێرایی یا گوڕ | velocity or speed |
| $W$ | ئیش | work |
| $W_{\text{لێکخشاندن}}$ | ئیشی بەڕێکراو بەهۆی هێزی لێکخشاندنەوە | work done by a frictional force<br>(or work required to overcome a frictional force) |
| $W_{\text{بەرەنجام}}$ | بەرەنجامی ئیشی بەڕێکراو | net work done |
| $\Delta\vec{\mathrm{x}}, \Delta x$ | لادان بە ئاڕاستەی ( $x$ ) وە | displacement in the $x$ direction |
| $\Delta\vec{\mathrm{y}}, \Delta y$ | لادان بە ئاڕاستەی ( $y$ ) وە | displacement in the $y$ direction |

# هێماکانی داینامیکی شلگازەکان و داینامیکی گەرمی بەکارهاتوو لەم کتێبەدا

ئەو هێمایانەی کە تیراسایەك لەسەریانە برە ئاڕاستەدارەکان دەنوێنێ کە بڕ و ئاڕاستەیان هەیە، بەڵام هێما لارەکان برە نائاڕاستەدارەکان دەنوێنێت کە تەنها بڕیان هەیە یان هێندی برە ئاڕاستە دارەکانە و هێماکانی تر یەکەکان دەنوێنێت.

| هێما | زاراوە | |
|---|---|---|
| $C_p$ | فراوانی گەرمی تایبەتی | specific heat capacity |
| $\vec{F}_B$ , $F_B$ | هێزی سەرخەر (پاڵهێز) | buoyont force |
| $L$ | گەرمی شاراوە (ماتەگەرمی) | latent heat |
| $L_f$ | گەرمی شاراوەی شلبوونەوە | latent heat of fusion |
| $L_v$ | گەرمی شاراوەی کوڵاندن | latent heat of vaporization |
| $N$ | ژمارەی گەردەکانی گاز | number of gas particles |
| $P$ | پەستان | pressure |
| $P_0$ | پەستانی سەرەتایی، پەستانی هەوای ئاسایی | initial pressure, atmospheric pressure |
| $P_{\text{بەرەنجام}}$ | بەرەنجامی پەستان | net pressure |
| $\rho$ | (ڕۆ) بە یۆنانی (بارستە چڕی) | mass density |
| $Q$ | گەرمی | heat |
| $Q_c$ | وزەی ئاڵوگۆڕکراو لەشێوەی گەرمی لە ماددەیەکەوە یان بۆ ماددەیەك لە پلەی گەرمی نزمدا | energy transfered as heat to or from a low temperature (cold) substance |
| $Q_h$ | وزەی ئاڵوگۆڕکراو لەشێوەی گەرمی لە ماددەیەکەوە یان بۆ ماددەیەك لە پلەی گەرمی بەرزدا | energy transfered as heat to or from a high temperature (hot) substance |
| $Q_{\text{بەرەنجام}}$ | بەرەنجامی وزەی ئاڵوگۆڕکراو وەك گەرمی گەرمی لەگەڵ هەر سیستمێکدا | net amount of energy transfered as heat to or from a system |
| $T$ | پلەی گەرمی (پەتی) | temperature (absolute) |
| $T_C$ | پلەی گەرمی بەپێی پێوەری سەدی یان سیلیزی | temperature in degree celsius |
| $T_c$ | پلەی گەرمی تەنێکی سارد | temperature of a low-temperature (cool) substance |
| $T_f$ | پلەی گەرمی بەپێی پێوەری فەهرەنهایتی | temperature in degree Fahrenheit |
| $T_h$ | پلەی گەرمی تەنێکی گەرم | temperature of a high-temperature ( hot) substance |
| $U$ | وزەی ناوەکی | internal energy |

# پاشکۆی (ج)

## یەکەکان لە سیستمی نێودەوڵەتی SI

| هێما | زاراوە | بڕ | هێما | زاراوە | بڕ |
|---|---|---|---|---|---|
| A | ئەمپێر | تەزووی کارەبا | s | چرکە | کات |
| K | کلڤن | پلەی گەرمی پەتی | mol | مۆڵ | بڕی ماددە |
| kg | کیلۆگرام | بارستایی | cd | کاندێلا | توندی ڕۆشنایی |
| m | مەتر | درێژی | | | |

## هەندێك لە پێشگرەکانی سیستمی نێودەوڵەتی SI

| پێشگر | هێما | کۆلکەی توانا | بڕەکەی | نموونە (یەکەی پێوانەیی بەمەتر) |
|---|---|---|---|---|
| Mega مێگا | M | $10^6$ | 1 000 000 | مێگا مەترێك (Mm) = $1 \times 10^6$ مەتر |
| Kilo کیلۆ | k | $10^3$ | 1 000 | کیلۆمەترێك (km) = $1 \times 10^3$ مەتر |
| Centi سەنتی | c | $10^{-2}$ | 1/100 | سانتیمەترێك (cm) = $1 \times 10^{-2}$ مەتر |
| Milli مللی | m | $10^{-3}$ | 1/1000 | مللیمەترێك (mm) = $1 \times 10^{-3}$ مەتر |
| Micro مایکرۆ | $\mu$ | $10^{-6}$ | 1/1 000 000 | مایکرۆمەترێك ($\mu$m) = $1 \times 10^{-6}$ مەتر. |

## چەند یەکەیەکی تری پەسەندکراو لە سیستمی نێودەوڵەتی SI

| هێما | ناو | بڕ | یەکەی هاوتا |
|---|---|---|---|
| Bq | باکوریل | شێوازی شیبوونەوە یان چالاکی | $\frac{1}{s}$ |
| C | کۆلۆم | بارگەی کارەبا | $1\ A \bullet s$ |
| °C | پلەی سیلیزی | پلەی گەرمی | 1 K |
| dB | دیسی بێل | ئاستی توندی دەنگ | (یەکەی پێوانە کردنی نییە) |
| eV | ئەلیکترۆن ڤۆڵت | وزە | $1.60 \times 10^{-19}\ J$ |
| F | فاراد | بارگە گریی بارگەگر | $1\frac{A^2 s^4}{kg \bullet m^2} = 1\frac{C}{V}$ |
| H | هێنری | خۆهاندان یا (ئاڵۆگۆڕە هاندان) | $1\frac{kg \bullet m^2}{A^2 s^2}\ 1 = \frac{J}{A^2}$ |
| h | کاژێر (سەعات) | کات | $3.600 \times 10^3\ s$ |
| Hz | هێرتز | لەرە | $\frac{1}{s}$ |
| J | جوول | وزە | $1\frac{kg \bullet m^2}{s^2} = 1\ N \bullet m$ |
| kW•h | کیلۆوات. کاژێر | وزە | $3.60 \times 10^6\ J$ |
| L | لیتر | قەبارە | $10^{-3}\ m^3$ |
| min | خولەك (دەقیقە) | کات | $6.0 \times 10^1\ s$ |
| N | نیوتن | هێز | $1\frac{kg \bullet m}{s^2}$ |
| Pa | باسکال | پەستان | $1\frac{kg}{m \bullet s^2}\ 1 = \frac{N}{m^2}$ |
| rad | ڕێدێن (نیوەتیرەی) | گۆشەلادان | (یەکەی پێوانە کردنی نییە) |
| T | تێسلا | چڕی لێشاوە موگناتیسی | $1\frac{kg}{A \bullet s^2} = 1\frac{N}{A \bullet m}\ 1 = \frac{V \bullet s}{m^2}$ |
| u | یەکەی بارستە گەردیلە | بارستایی (بارستە گەردیلەیی) | $1.660\ 538\ 86 \times 10^{-27}\ kg$ |
| V | ڤۆڵت | جیاوازی ئەرکی کارەبایی «ڤۆڵتیە» | $1\frac{kg \bullet m^2}{A \bullet s^3} = 1\frac{J}{C}$ |
| W | وات | توانا | $1\frac{kg \bullet m^2}{s^3} = 1\frac{J}{s}$ |
| Ω | ئۆم | بەرگری | $1\frac{kg \bullet m^2}{A^2 s^3} = 1\frac{V}{A}$ |

# پاشکۆی (د): خشتەی سوودبەخش

## هاوکۆلکەی شکانەوەی هەندێ لە ماددەکان

| تەنە ڕەقەکان لە پلەی $20^{\circ}C$ | $n$ | شلەکان لە $20^{\circ}C$ | $n$ | گازەکان لە پلەی $0^{\circ}C$ و 1 atm | $n$ |
|---|---|---|---|---|---|
| شەش پالّوی ئۆکسیدی زرگۆنیۆم | 2.20 | بەنزین | 1.501 | هەوا | 1.000293 |
| ئەلماس | 2.419 | دوانە سلفایدی کاربۆن | 1.628 | دوانە ئۆکسیدی کاربۆن | 1.000450 |
| فلۆرایت | 1.434 | کاربۆن تیتراکلۆراید | 1.461 | | |
| کوارتزی شلبووە | 1.458 | کهولی ئەثیلی | 1.361 | | |
| شووشەی ئاسایی | 1.52 | گلیسرین | 1.473 | | |
| شووشەی سینی | 1.66 | ئاو | 1.333 | | |
| بەفر (لە $0^{\circ}C$ ) | 1.309 | | | | |
| پۆلیسترین | 1.49 | | | | |
| کلۆریدی سۆدیۆم | 1.544 | | | | |
| زرگۆن | 1.923 | | | | |

هاوکۆلکەکان بە ڕووناکییەك پێوراون کە درێژی شەپۆلەکەی لە بۆشاییدا (589 nm)

## زانیاریە (داتا) گەردیلەییە سوودبەخشەکان

| هێما | بڕ | بڕی پێوراوی بنچینەیی | بڕە باوەڕپێکراوەکان لە هەژمێرەکانی کێتێبەکاندا |
|---|---|---|---|
| $m_e$ | بارستایی ئەلیکترۆن | $9.109\ 3826 \times 10^{-31}$ kg<br>$5.485\ 799\ 0945 \times 10^{-4}$ u<br>0.510 998 918 MeV | $9.109 \times 10^{-31}$ kg<br>$5.49 \times 10^{-4}$ u<br>$5.110 \times 10^{-1}$ MeV |
| $m_n$ | بارستایی نیوترۆن | $1.674\ 927\ 28 \times 10^{-27}$ kg<br>1.008 664 915 60 u<br>939.565 360 MeV | $1.675 \times 10^{-27}$ kg<br>1.008 665 u<br>$9.396 \times 10^{2}$ MeV |
| $m_p$ | بارستایی پرۆتۆن | $1.672\ 621\ 71 \times 10^{-27}$ kg<br>1.007 276 466 88 u<br>938.272 029 MeV | $1.673 \times 10^{-27}$ kg<br>1.007 276 u<br>$9.383 \times 10^{2}$ MeV |

## بڕە جێگیرە بنچینەییەکان

| هێما | بڕ | بڕی فەرمی (بنچینەیی) | بڕە باوەڕپێکراوەکان لە هەژمێرەی کێتێبەکاندا |
|---|---|---|---|
| $c$ | خێرایی ڕووناکی لە بۆشایی | 299 792 458 m/s | $3.00 \times 10^{8}$ m/s |
| $e^{-}$ | بارگەی سەرەتایی | $1.602\ 176\ 53 \times 10^{-19}$ C | $1.60 \times 10^{-19}$ C |
| $e^{1}$ | بنچینەی لۆگاریتمی ئاسایی | 2.718 281 828 | 2.72 |
| $\varepsilon_o$ | نەگۆڕە نەگەیاندن لە بۆشاییدا | $8.854\ 187\ 817 \times 10^{-12}$ $C^2/(N•m^2)$ | $8.85 \times 10^{-12}$ $C^2/(N•m^2)$ |
| $G$ | نەگۆڕی کێشکردنی گشتی (نیوتن) | $6.672\ 59 \times 10^{-11}$ $m•N^2/kg^2$ | $6.673 \times 10^{-11}$ $N•m^2/kg^2$ |
| $g$ | تاودانی کەوتنە خوارەوەی سەربەست لەسەر ڕووی زەوی (تاودانی زەوی) | 9.806 65 $m/s^2$ | 9.81 $m/s^2$ |
| $h$ | نەگۆڕی بلانك | $6.626\ 0693 \times 10^{-34}$ J•s | $6.63 \times 10^{-34}$ J•s |
| $k_B$ | نەگۆڕی بۆڵتزمان $(R/N_A)$ | $1.380\ 6505 \times 10^{-23}$ J/K | $1.38 \times 10^{-23}$ J/K |
| $k_C$ | نەگۆڕی کۆلۆم | $8.987\ 551\ 787 \times 10^{9}$ $N•m^2/C^2$ | $8.99 \times 10^{9}$ $N•m^2/C^2$ |
| $R$ | نەگۆڕی جیهانی مۆلی گاز | 8.314 472 J/(mol•K) | 8.31 J/(mol•K) |
| $\pi$ | ڕێژەی چێوەی بازنەیەك بۆ تیرەکەی | 3.141 592 654 | ئەو نرخەی کە ئامێری ژمێرەر دەیدا |

# وەڵامی چەند پرسیارێکی هەڵبژێردراو

## بەشی 1

### ڕاهێنانی 1 (أ) ل 14

1. $5 \times 10^{5-}$ m
3. أ. $1 \times 10^{-8}$ m ب. $1 \times 10^{-5}$ mm
ج. $1 \times 10^{-2}\ \mu m$
5. $1.440 \times 10^{3}$ kg

### پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندن ل 31-28

11. أ. $2 \times 10^{2}$ mm ب. $7.8 \times 10^{3}$ s
ج. $1.6 \times 10^{7}\ \mu g$ د. $7.5 \times 10^{4}$ cm
ه. $6.75 \times 10^{-4}$ g و. $4.62 \times 10^{-2}$ cm
ز. $9.7$ m/s
13. $1.08 \times 10^{9}$ km
21. $228.8$ cm
39. $1.79 \times 10^{-9}$ m
41. $1.0 \times 10^{3}$ kg
43. أ. $0.677 \times 10^{-3}$ g/cm$^3$ ب. $4.30 \times 10^{16}$ m$^2$

## بەشی 2

### ڕاهێنانی 2 (ب) ل 43

1. أ. $7.85 \times 10^{-8}$ m$^2$ ب. $3.7 \times 10^{-4}$
2. $\sigma = 4.07 \times 10^{6}$ N/m$^2$
$T = 3.19$ N

### پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندن ل 49-46

14. أ. $0.97 \times 10^{6}$ g/m$^3$ ب. $3.8 \times 10^{-26}$ kg
29. $l - l_0 = 5.8$ m
30. $l - l_0 = 1.45$ m

## بەشی 3

### ڕاهێنانی 3 (أ) ل 58

1. أ. $3.57 \times 10^{3}$ kg/m$^3$ ب. $6.43 \times 10^{2}$ kg/m$^3$
3. $9.4 \times 10^{3}$ N

### ڕاهێنانی 3 (ب) ل61

1. أ. $1.48 \times 10^{3}$ N
ب. $1.88 \times 10^{5}$ Pa
3. أ. $1.2 \times 10^{3}$ Pa ب. $6.0 \times 10^{-2}$ N

### ڕاهێنانی 3 (ج) ل64

1. $1.11 \times 10^{8}$ Pa
3. $0.20$ m

### ڕاهێنانی 3 (د) ل 71

1. أ. $1.8$ m/s ب. $1.7 \times 10^{-3}$ m
3. $-4.4 \times 10^{-2}$ Pa

### پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندن ل 73 – 77

9. $2.1 \times 10^{3}$ kg/m$^3$
17. $6.28$ N
19. أ. $2.61 \times 10^{6}$ Pa ب. $1.84 \times 10^{5}$ N
23. $2.4$ m/s
25. $3.4 \times 10^{-5}$ m$^3$
27. $5.9 \times 10^{5}$ Pa
29. $6.11 \times 10^{-1}$ kg
31. أ. $5.80 \times 10^{2}$ Pa ب. $1.02 \times 10^{5}$ N بۆ سەرەوە
33. $4.0 \times 10^{3}$ m$^2$
35. $6.3 \times 10^{-2}$ m
37. $6.0$ N
39. $5.0 \times 10^{-2}$ m
41. $833$ kg/m$^3$
42. $2.2$ m لەسەرەوەی زمانەکە
44. $0.605$m
45. أ. $84$ g/s ب. $2.8 \times 10^{-4}$ m/s
47. $9.3 \times 10^{2}$ s
49. $1.7 \times 10^{-3}$ m

## بەشی 4

### ڕاهێنانی 4 (أ) ل86

.1 755 J

.3 0.96 J

.4 41 m/s

### ڕاهێنانی 4 (ب) ل 90

.1 47ºC

.3 79ºC

.5 390 J/kg•Cº

.7 135 g

.8 10.1 Cº

### ڕاهێنانی 4 (ج) ل97

.1 $1.29 \times 10^5$ J

.3 $1.42 \times 10^4$ J

.5 76.2ºC

### ڕاهێنانی 4 (د) ل102

.1 أ $6.4 \times 10^5$ J　ب. $-4.8 \times 10^5$ J

.3 $3.3 \times 10^2$ J

### پێداچوونەوە و هەڵسەنگندن ل 107-110

.15 1064ºC ، 1337 $k$

.17 أ. 2.9 J

.27 25.0ºC

.29 $7.49 \times 10^4$ J

.41 $3.5 \times 10^2$ J

.49 $8.0 \times 10^1$ g

## بەشی 5

### ڕاهێنانی 5 (أ) ل116

.1 $1.0 \times 10^{-13}$ m

.3 10.1 m – 85.7 m درێژە شەپۆلەکانی کورترە لە ئەو شەپۆلانەی کە تایبەتە بە ڕادیۆ AM .

.5 $5.4 \times 10^{14}$ Hz

### ڕاهێنانی 5 (ب) ل131

.1 $p = 10.0$ cm وێنەی نییە $q = \infty$
$p = 500$ ، $q = -10.0$ cm، $M = 2.00$ وێنەکە خەیاڵی و هەڵنەگەڕاوەیە.

.3 $R = 1.00 \times 10^2$ cm؛ $M = 2.00$ وێنەکە خەیاڵییە.

### ڕاهێنانی 5 (ج) ل135

.1 $p = 46.0$ cm؛ $M = 0.500$ وێنەی خەیاڵی و هەڵنەگەڕاوەیە، $h = 3.40$ cm

.3 $p = 45$ cm؛ $h = 17$ cm، $M = 0.41$ وێنەی خەیاڵی و هەڵنەگەڕاوەیە.

.5 $q = -1.31$ cm؛ $M = 0.125$ وێنەی خەیاڵی و هەڵنەگەڕاوەیە.

### پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندن ل 139-143

.7 $3.00 \times 10^8$ m/s

.11 $1 \times 10^{-6}$ m

.13 $9.1 \times 10^{-3}$ m (9.1 mm)

.19 2 m پشت ئاوێنەکە، M=1

.25 $\theta_2 = 55°$ تیشکی دراوە لە ئاوێنەی B هەمیشە تەریب دەبێت بە تیشکی کەوتوو لەسەر ئاوێنەی A .

.30 وێنەیەکی ڕاستەقینەیە و هەڵگەڕاوەیە دەکەوێتە پێش ئاوێنە

.32 نەخێر $h' > h$ بۆ ئاوێنەی قۆقز

.35 وێنەیەکی ڕاستەقینە لە هەمان شوێنی تەنەکەدا دەرئەکەوێت

.40 أ. $M = -0.384$ ؛ ڕاستەقینە و هەڵگەڕاوەیە
ب. $M = -1.00$ ؛ ڕاستەقینە و هەڵگەڕاوەیە
ج. $M = 1.67$ خەیالی و هەڵنەگەڕاوەیە

42. $h = 5.69$ cm؛ $p = 52.9$ cm

$M = 0.299$ خەیالی و هەڵنەگەڕاوەیە

48. $R = -31.0$ cm

50. $f = -13.7$ cm؛ $M = 0.0656$ وێنەیەکی خەیالی و هەڵنەگەڕاوەیە

52. $M = -20.0$ وێنەیەکی ڕاستەقینەیە و هەڵنەگەڕاوەیە

55. أ. 15.0 cm

ب. 59.9 cm

ج. $M_{ڕووچاو} = 2.00$ $M_{قۆقز} = 0.667$

د. خەیاڵیین

هـ. هەڵنەگەڕاوەن

## بەشی 6

### ڕاهێنانی 6 (أ) ل 151

1. $18.5^o$
3. 1.47 گلیسرین

### ڕاهێنانی 6 (ب) ل 159

1. 20.0 cm، $M = -1.00$ وێنەکە ڕاستەقینەی هەڵگەڕاوەیە
3. $q = 6.67$ cm، $M = 0.333$ وێنەکە خەیاڵی و هەڵنەگەڕاوەیە

### ڕاهێنانی 6 (ج) ل 165

1. $42.8^o$
3. $49.8^o$

### پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندن ل 171-175

11. $26^o$
13. $30.0^o$، $19.5^o$، $19.5^o$، $30.0^o$
23. بەڵێ چونکە: $n_{هەوا} > n_{بەفر}$
25. 2.60 هەڵنەگەڕاوەیە
35. $42.8^o$
37. دانەوەی تەواوەتی ناوەکی چونکە؛ $\theta_i (45^o) > \theta_c (41.1^o)$

39. $51.9^o$

41. أ. $36.7^o$

ب. $53.4^o$

43. 8.55 cm
44. $-80.0$ cm
46. $1.20 \times 10^2$ cm، 0.250
48. $16.5^o$
50. $67^o$
52. $\frac{10}{9} f$
53. أ. $40.8^o$

ب. $60.6^o$

56. 1.38
58. 58.0 m
60. أ. 4.83 cm

ب. پێویستە هاوێنەکە دووری 0.12 cm بجووڵێنرێت

62. 1.90 cm

## بەشی 7

### پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندن ل 188

1. سور، سەوز، شین، ڕەنگی سپی.
4. أ. بۆیەی سەوز

ب. ڕووناکی سپی

ج. بۆیەی ڕەش

13. ڕەش

# زاراوەکان

## ئـ

**ئاوێنەی ڕووچاڵ Concave spherical mirror ل 124**
ئاوێنەیەکە ڕووە ڕووناکی دەرەوەکەی بەشێکە لە ڕووی ناوەوەی گۆیەك.

**ئاوێنەی گۆیی قۆقز Convex spherical mirror ل132**
بەشێکە لە ڕووی گۆیەك کە ڕووی دەرەوەی ڕوناکی دەداتەوە.

## ب

**بۆند Bond ل 36**
هێزێکە دەبێتە هۆی کێش کردنی گەردیلەکانی ماددەیەك بە هۆی کاریگەری ئاڵوگۆڕی نێوان بارگە پۆزەتیڤەکان و نێگەتیڤەکان لەسەری.

## پ

**پرۆگرامی زانستی Scientific method ل 6**
ڕێگەیەکی پرۆگراومداری بەرنامە بۆ داڕێژراوە بۆ لێکۆڵینەوەی ڕووداوە سروشتییەکان

**پلەی بڕ Order of magnitude ل 22**
هێزی ژمارە 10 کە نزیکە بە هەمان ژمارەی بڕێکی فیزیایی.

**پلازما Plasma ل 34**
دۆخێکە لە دۆخەکانی ماددە کە لە پلەگەرمییە بەرزەکاندا دەستەبەر دەکرێت.

**پەستان Pressure ل 59**
بڕی ئەو هێزەیە کە بە ستونی کاردەکاتە سەر یەکەی ڕووبەر.

**پلەی گەرمی Temperature ل 65**
پێوانی تێکرای جووڵە وزەی تەنۆلکەکانی ماددەیە.

**پێوانی گەرمی Calorimetry ل 88**
ڕێگەیەکی تاقیگەییە بەکاردەهێنرێت بۆ پێوانەکردنی وزەی گەرمی ئاڵوگۆڕکراو لە نێوان دوو تەندا.

**پەروازەکردن Dispersion ل 167**
کرداری لێك جیاکردنەوەی ڕوناکییە بۆ ڕەنگە سەرەکییەکانی.

**پەرشبوونەوە Scaffering ل 186**
هەڵمژینی ڕووناکییە بەهۆی تەنۆلکەکانی هەوا و دووبارە تیشکدانەوەیەتی.

## ت

**تاقیکردنەوەی کۆنترۆڵکراو**
**Controlled experiment ل 8**
ئەو تاقیکردنەوەیەیە کە تیایدا لێکۆڵینەوە بە تەنها لەسەر یەك گۆڕاو یان هۆکار دەکرێت بە مانەوەی هۆکارەکانی تر بە جێگیری.

**تەواوی Precision ل 15**
پلەی گونجاندنی پێوانەکردنە جیاوازەکانی بڕێکی دیاری کراوە.

## ج

**جیاوازی گۆشەی تێڕوانینن Parallax ل 16**
جیاوازی خوێندنەوەکانە بۆ پێوانەکردنێکی دیاریکراو گەر لە چەند گۆشەیەکی جیاوازەوە سەیر بکرێت.

**جیرپی Elastisity ل 40**
توانای گەڕانەوەی تەنێکە بۆ شێوە بنەڕەتیەکەی لە دوای لابردنی هێزە کاریگەرە شێوێنەرەکە.

**جیڤشاری ڕێژەیی Strain ل 42**
ڕێژەی نێوان گۆڕان لەدرێژی تەلێکی دیاریکراوە بۆ درێژییە بنەڕەتییەکەی.

**جەمسەرگری هێڵی Linear Palarization ل 182**
ڕیزبوونێکی شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکانە بە جۆرێك کە بوارە کارەباییە لەراوەکانیان بە یەکتری تەریب بن.

## چ

**چڕی ماددە Mass Dinsity ل 53**
بارستایی یەکەی قەبارەیە لە ماددەدا.

## د

**دۆخ Phase ل 34**

ئەو بارەیە کە تێیدا مادده ڕەق یان شل یان گاز وە یان پلازمایە.

**دۆخ گۆڕان Phase Change ل 93**

ئەو گۆڕانە فیزیایانەی دۆخی ماددەیە لە (ڕەق، شل گاز)ەوە بۆ دۆخێکی تر لە ژێر پەستانێکی جێگیردا و بە نەگۆڕانی پلەی گەرمی.

**دەورو بەرە ناوەند Environment ل 100**

هەموو شتەکانی دەرەوەی سیستمێکە کە دەتوانن کار لە سیستمەکە بکەن یان سیستمەکە کاریان لێبکات

**دانەوە Reflection ل 118**

گۆڕانێکە لە ئاڕاستەی بڵاوبوونەوەی شەپۆلی کارۆموگناتیسیدا بە هۆی ڕوویەکەوە، وایلێدەکات کە بە ئاڕاستەی بەرامبەری بجووڵێت.

**دانەوەی تەواوەتی ناوەکی**
**Total Internal Reflection ل 164**

دانەوەیەکی تەواوەتییە کاتێك گۆشەی لێدانی ڕوناکیەکە بۆ سەر ڕووە جیاکەرەوەکە لە گۆشەی مۆڵەقە زیاتربێت.

## ر، ڕ

**ڕەهەند Dimension ل 10**

پێوانەیەکە ئاماژە بە برێکی فیزیایی دیاریکراو دەکات.

**ڕەنووسە واتاییەکان Significaut Figures ل 17**

هەموو ڕەنووسە زانراوەکان دەگرێتەوە سەر باری دوا ڕەنووسی کە خەمڵێنراوە بە نزیکەیی.

**ڕووناکی دانەوە Reflection ل 116**

گۆڕانێکە لە ئاڕاستەی بڵاوبوونەوەی شەپۆلی کارۆموگناتیسی دا بە هۆی ڕوویەکەوە، وای لیّ دەکات کە بە ئاڕاستەی بەرامبەری بجووڵێت.

## س

**سیستم System ل 6**

بەشێکی دیاریکراوە لە بوارێکی لێکۆڵینەوەدا بە هۆی کرداری تێبینی کردنەوە.

**سەخت Rigid ل 39**

ئەو تەنەیە کە پارێزگاری لە شێوە نەگۆڕەکەی دەکات کاتێك هێزێك دەخرێتە سەری.

**سیستمی دایناميكی گەرمی**
**Thermo Dynamic System ل 100**

ماددەیەکە یان کۆمەڵە ماددەیەکە، کە بە برێکی سەربەخۆ دادەنرێت و دەکرێت وزەی بدرێتیّ یان لیّ وەربگیرێت.

## ش

**شیتەڵکردنی ڕەهەندی**
**Dimensional Analyses ل 22**

بەکارهێنانی ڕەهەندەکانە بۆ بنیات نانی هەندیّ لە هاوکێشە فیزیاییە ساکارەکان یان دڵنیابوون لە ڕاستی و دروستیان.

**شلگاز Fluid ل 52**

ئەو ماددەیەیە کە لە دۆخی ڕەقیدا نەبێت (واتە گازبێت یان شلە) کە گەردو گەردیلەکانی بەسەربەستی دەجولێن و لەسەر یەکتری دەخلیسکێن.

**شلگازی نموونەیی Ideal Fluid ل 66**

ئەو شلگازەیە کە لێکخشانی ناوەکی یان لینجی نییە و ناپەستێورێت.

**شەپۆلی کارۆموگناتیسی**
**Electro Mognatic Wave ل 114**

شەپۆلێکە لە دوو بواری کارەبایی و موگناتیسی لەراوەی ئەستون لەسەر یەکتر پێکهاتووە و لەسەرچاوەیەکی دیاریکراوەوە بە خێرایی ڕوناکی دەردەچێت.

**شکانەوە Refraction ل 146**

گۆڕانی ئاڕاستەی شەپۆلە کاتێك بەلاری لە ناوەندێکەوە دەچێتە ناوەندێکی تری چڕی جیاواز، بەهۆی گۆڕانی خێراییەوە.

## ف

**فشار** Stress ل **41**

هێزی سەپێنراوی سەر یەکەی ڕووبەری بڕگەی تەلێکە.

**فراوانی گەرمی تایبەتی**

Specific heat capacity ل **87**

بڕی گەرمی پێویستە بۆ بەرزکردنەوەی پلەی گەرمی 1kg لە لە ماددەیەك بە بڕی $1C^{o}$ بە جێگیربوونی پەستان.

## ك

**کردار لەکاتی نەگۆڕانی قەبارە**

Iso Volumetricle Process ل **102**

کردارێکی داینەمیکی گەرمییە کاتێك پەستان نەگۆڕ بێت، بە هیچ شێوەیەك ئاڵوگۆڕکردنی ئیش لەگەڵ سیستمەکەدا ڕوونادات.

**کرداری ئایزۆثرمی** Iso Thermal Process ل **103**

کردارێکی داینەمیکی گەرمییە کەلە پلەیەکی گەرمی نەگۆڕدا ڕوودەدات، لەکاتی ڕوودانیدا وزەی ناوەکی سیستمەکە بە نەگۆڕی دەمێنێتەوە.

**کرداری ئادیاباتیکی** Adiabatic Process ل **104**

کردارێکی داینەمیکی گەرمییە کە تیایدا ئاڵوگۆڕ کردنی وزە لە نێوان سیستم و دەوروبەرەکەیدا تەنها بە شێوەی ئیش ڕوودەدات، نەك بە شێوەی گەرمی.

## گ

**گرژی** Tansion ل **40**

ئەو هێزەیە کە لە تەنێکدا پەیدا دەبێت دوای ئەوەی هەوڵدەدرێت درێژ بکرێت یان بپەستێورێت.

**گەرمی** Heat ل **81**

ئەو وزەیە کە لە نێوان تەنەکاندا دەگوازرێتەوە بە هۆی جیاوازی پلەی گەرمییەکەیانەوە.

**گەرمی شلبوونەوە** Heat Of Fusion ل 94

وزەی ئاڵوگۆڕکراوە لە یەکەی بارستاییدا، بۆ گۆڕینی دۆخی ماددە لە ڕەقییەوە بۆ شلی یان لە شلەوە بۆ ڕەقی بە نەگۆڕانی پلەی گەرمی و پەستان.

**گەرمی کوڵاندن** Heat Of Vaporization ل **94**

وزەی ئاڵوگۆڕکراوە لە یەکەی بارستاییدا بۆ گۆڕینی دۆخی ماددە لە شلییەوە بۆ گازی یان لە گازەوە بۆ شلی لە ژێر پلەیەکی گەرمی و پەستانێکی جێگیردا.

**گەرمی شاراوە** Laten Heat ل **94**

وزەی ئاڵوگۆڕکراوە لەیەکەی بارستاییدا بۆ گۆڕینی دۆخی ماددەیەك.

**گۆشەی لێدان** Angle Of Incident ل **119**

گۆشەی نێوان تیشکی لێدەر و ئەستونی سەر ڕووە ڕوناکی دەرەوەکەیە لە خاڵی لێداندا،

**گۆشەی دانەوە** Angle Of Reflection ل **119**

گۆشەی نێوان تیشکی دراوە و ئەستونی سەر ڕووە ڕوناکی دەرەوەکەیە لە خاڵی لێداندا.

**گۆشەی مۆڵەقە** Critical Angle ل **164**

ئەو گۆشەی لێدانەیە کە گۆشەیەکی شکانەوەی وەستاوی بەرامبەرە، کاتێك ڕووناکی لە ناوەندێکی هاوکۆلکە شکانەوە گەورەوە دەچێتە ناوەندێکی تر کە هاوکۆلکەی شکانەوەی بچووکترە.

## ل

**لێڵ ڕەنگی** Chromatic Oberration ل **169**

کۆبونەوەی ڕەنگی ڕووناکیە جیاوازەکانە لە دوری جیاواز لە پشت هاوێنەوە.

## م

**مۆدێل** Model ل **7**

پێش چاو خستنێکی ساکارە بۆ سیستمێکی لێکۆڵراوە کە هۆکارە کاریگەرەکانی دیاردەیەکی تێدا دەردەکەوێت.

## ن

**نزیکخستنەوە** Rounding ل **19**

لابردنی خانەکانە لە پێوانەکردندا بەپێی ڕێسایەکی دیاریکراو، بە شێوەیەك کە پێوانەکردنەکە ژمارەیەکی داواکراو لە خانە واتاییەکانی هەبێ.

## هـ

**هاوكۆلكەی یۆنگ** Strain Young Modulus ل **42**

بریتییە لە ڕێژەی نێوان فشار بۆ جێفشار لە ماددەیەكی دیاریكراودا.

**هێزی پاڵنەری شلگاز (پاڵهێزی شلگاز)**
Buouant Force ل **53**

ئەو هێزەیە كە شلگازێك ڕووەو سەرەوە كاری پێ دەكاتە سەر تەنێكی نقووم بوو یان سەركەوتە.

**هاوسەنگی گەرمی** Thermal Equilibrium ل **80**

ئەو بارەیە كە پلەی گەرمی دوو تەنی (بەریەك كەوتوو) یا بەیەكەوە نووساو لە ڕووی فیزیاییەوە تێدا یەكسان دەبن.

**هاوكۆلكەی شكانەوەی ناوەند**
Index Of Refraction ل **148**

بریتییە لە ڕێژەی نێوان خێرایی ڕوناكی لە بۆشاییدا بۆ خێراییەكەی لە ناوەندێكی ڕوندا.

**هاوێنە** Lens ل **152**

تەنێكی ڕوونە كە تیشكی ڕوناكی دەشكێنێتەوە، (كۆیان دەكاتەوە یان پەرتیان دەكات) بۆ دروست كردنی وێنە.

## و

**وردی** Accuracy ل **15**

ڕادەی نزیكی نرخی پێوراوە لە نرخە ڕاستەقینەكەی ئەو بڕەی كە دەمانەوێت بیپێوین.

**وزەی ناوەكی** Internal Image ل **82**

ئەو وزەیەیە كە لە جوڵەی هەرەمەكی تەنۆلكەكانی ماددەوە پەیدادەبێت، وە دەكاتە كۆی وزەی هەموو تەنۆلكەكان.

**وێنەی خەیاڵی** Virtual Image ل **120**

وێنەیەكە لە خاڵێكدا دروست دەبێت لەوە دەچێت كە تیشكەكان لێوەی دەچووبن بەڵام لە ڕاستیدا وانییە.

**وێنەی ڕاستەقینە** Read Image ل **125**

ئەو وێنەیەیە كە لە ئەنجامی كۆبوونەوەی تیشكە دراوەكان لە ڕوی ئاوێنەوە پەیدا دەبێت.

